١٩

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

# خەلیفەکانی ڕاشدین

نوزاد

## لە نێوان جێنشینبوون و شەهیدبووندا

چاپی دووەم

د. صلاح عبدالفتاح الخالدي

وەرگێڕانی

فاتح سەنگاوی





# خەلیفەکانی ڕاشیدین

لەنێوان جێنشین بون و شەهید بوندا

**مەبەست لە:**

## زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی یە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەر ڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامیو سازێنەری بێداریو رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچونی تەسکی حزبایەتیو تاکڕەویو رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

لەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت:[الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فيَتبَعونَ أَحسَنَهُ؛ أولئكَ الذّينَ هَداهُمُ الله وَأولئكَ هُمْ أولُوا الألباب ] الزمر- ١٨

**نوسینگەی تەفسیر**

چەند تروسكێكی مێژوویی

(قبسات تأريخيه)

(١)

# خەلیفەكانی ڕاشیدین

## لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا

## چەند دیمەن و چنینەوەیەك لە ڕاستترین ڕیوایەتەكان

## چەند پەند و ئامۆژگاریەك


وەرگرتن و داڕشتنەوەی

دكتۆر صلاح عبدالفتاح الخالدی

وەرگێڕانی: فاتح محمد سەنگاوی

پێداچونەوەی

نەوا محمد سعید



چاپی دووەم

١٤٣٠-٢٠٠٩




ناوی کتێب بە عارەبی: الخلفاء الراشدون بين الاستخلاف والاستشهاد

ناوی نوسەر: صلاح عبدالفتاح الخالدی

نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٢٠-١٩٩٠

ناوی کتێب بەکوردی: خەلیفەکانی ڕاشدین لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا

ناوی وەرگێڕ: فاتح محمد سەنگاوی

پێداچونەوەی وەرگێڕان: نەوا محمد سەعید

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیربۆ بڵاو کردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

کۆمپیوتەر: جمعه صديق کاکە

نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم١٤٣٠-٢٠٠٩

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٧١) ساڵی ٢٠٠٢

تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه... ونتوب إليه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا، وسيئات اعمالنا، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، واشهد أن لا اله الاّ الله، وحده لا شريك له، واشهد أن محمداً عبده ورسوله، صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وصحبه أجمعين.

لە پاشاندا:

لە ڕاستیدا توێژینەوەی مێژوو، خوێندنەوەی بەسەرهات و ڕووداوەکانی، بەسوود و کاریگەرە، ئەوەشی پێی هەڵدەستێ چەندان سوود و وانەی پێشکەش دەکا.

خوای گەورە فەرمانمان پێدەکا بە ڕوانین و وردبونەوە لە بەسەرهاتی پێشینان و توێژینەوە و پەند لێ وەرگرتنی و وەرگرتنی چەندان بەڵگە و وانەی بەسوود لە مێژوودا.

توێژینەوەی مێژووی ئیسلامی، کە تا ئێستا چواردە سەدەی لەخۆگرتوە، ئەو بەڵگە و وانە و سوود و پەندانە بەرجەستە دەکات.

ئەو مێژووە دووروودرێژە بەهەر چواردە سەدەکەیەوە، مێژووی موسڵمانانە، بەو پێیەی تاك تاك و گەلن، وەکو چەند گەلێکیش ژیانی خۆیان بە هەموو ئیجابیات و سلبیات و باش و خراپەکانیانەوە گوزەر کردوە.

ئەوە مێژووی موسڵمانانە، نەك مێژووی ئیسلامی، پێشمان خۆشە جەخت لەسەر ئەو ڕاستیە بکەین کە دەکرێ هەندێ لە قین لەدڵەکان یان خەڵەتاوان تیایدا بەهەڵەدا بچن.

هەموو مێژووی موسڵمانان مێژووی ئیسلام نیە، ناگونجێ مێژووی موسڵمانان ببێتە داوەر بەسەر ئیسلامدا!

جیاوازی لەنێوان مێژووی ئیسلام و مێژووی موسڵماناندا هەیە..

مێژووی موسڵمانان ئەو ژیانەیە کە موسڵمانان گوزەریان کردووە، ئەو ڕوداوانەیە کە سازاندوویانە، جا چ تاك تاك بووبێت یا کۆمەڵ کۆمەڵ، دەوڵەت دەوڵەت بووبێت یا حکومەت حکومەت، فەرمانڕەوا بووبێت یا فەرمانبەسەرداکراو.

چۆن موسڵمانان ژیانیان گوزەراندووە لەو ماوەیەی مێژوویاندا، ژیانی رامیاری یا ئابووری یا زانستی یا کۆمەلأیەتییان.

فەرمانڕەوا و ژێردەستەکانیان، لەو ماوەیەدا چۆن بون، ئەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەتەوەکانی تر چۆن بووە، بەهێزی و لاوازی و یەکێتی و جیاوازی، گوێڕایەڵی و بێفەرمانیان و، نزیکیان لەخوا و دوورییان لێی و پابەندبونیان بە ئیسلام و خوقوتارکردنیان لێی چۆن بووە؟!!

ئەمەش وادەگەیەنێ کە مێژووی موسڵمانان بەدرێژایی هەر چواردە سەدەکەیەوە خەیر و شەڕ و هەڵە و ڕاستی تێدایە و چەندین لاپەڕەی ڕەشی تاریك و چەندین لاپەڕەی سپی و ڕۆشنی ڕووناکیدەری تێدایە، لاپەڕەی وای تێدایە کاتێ موسڵمان پێی دەزانێ و بەئاگا دەبێ لێی شەرم دەیگرێ و ئازاری دەدات و خەفەت دایدەگرێ، تێشیدایە سەربڵند و سەرفرازی دەکا و دیاردەی سەربڵندی و هێز و ڕێز و سەقامگیریی موسڵمانانی تیادایە، هەروەك دیاردەی زەبونی و لاوازی و ترس و سوکیشی تێدایە.

دیارترین وێنەی لایەنی ڕەشی تاریك لە مێژووی موسڵماناندا، مێژووی ڕەسمی موسڵمانانە لەم چەرخەدا.!!

سەیر و نامۆ نیە کاتێ سەرجەم ئەو دژبون و بەرامبەربونانە لەمێژووی موسڵمانان بەدی دەکەین، ئەوان مرۆڤن، هەڵە و ڕاست و بێفەرمانی و گوێڕایەڵی دەکەن، لاواز و بەهێز دەبن، بەرز و نزم دەبنەوە، ڕووەو ئەم یان ئەو لە ژیان و قۆناغ و بزاوتنیاندا کەمەندکێش دەبن.

لەڕاستیدا خوای دانا پابەندبونی موسڵمانانی بە ئیسلامەوە کردووەتە پێوەرێك و مێژوویانی پێ دەپێورێ، مێژووی پرشنگدار و ڕۆشنیشیان

پەیوەستە بە بەهێزی پەیوەستبونیان بە ئیسلامەوە، چ تاك تاك بن یا کۆمەڵ کۆمەڵ، گەل بن یان حکومەت، هەرکاتێ پەیوەستیان بە ئیسلامەوە لاواز بوو، لە لوتکەی هەرەبەرز و پلەی هەرە بالاّوە دادەبەزن و دەشکێنە نێو زەبونی ترس و سوکییەوە، جارێکیتر ناگەڕێنەوە بۆ پلەو پایە بڵندەکەیان مەگەر کاتێ پەیوەندی و پابەندییان بە ئیسلامەوە توندوتۆڵ بکەن.

ڕەحمەتی خوا لە عومەری کوڕی خەتتاب بێ کاتێ ئەو پێوەرەمان پێ دەبەخشێ بەو وتەیەی دەڵێ: ((ئێمە قەومێك بووین خوا بە ئیسلامەوە سەربەرزی کردین، هەرکاتێ بمانەوێ بە جگە لەئیسلامەوە سەربەرز بین خوا ڕیسوامان دەکات)).!!

ئا ئەمەیە مێژووی موسڵمانان بەوەی هەیانبووە یان لەسەریان کەوتووە، چەندە هەڵەیە ئەو کەسەی سەرجەم ئەو تێکەڵ و پێکەڵیە دەکاتە مێژوویەك بۆ ئیسلام، چەندە ئیسلام لەمەدا ستەمی لێ دەکرێ.

لە ڕاستیدا ئیسلام دان نانێ بە گشت مێژووی موسڵمانان، پەسەندی ئەو لاپەڕە ڕەشانە ناکا -کە زۆریشن- و موسڵمانان لە مێژوویاندا تۆماریان کردووە، بەڵکو پەسەندی ناکا و دژی دەوەستێ و خۆی لێ بەری دەکا.

مێژووی ئیسلام بریتیە لەو لاپەڕە سپیە پرشنگدارو روونانەی کە موسڵمانان تۆماریان کردووەو دیاردەی هێز و سەربەرزی و سەقامگیرییان بووە لە کاتێکدا کە بەڕاستی پابەند بون بە ئیسلامەوە، لەراستیدا ئیسلام دان نانێ تەنها بەو ژیانە ڕێزدارە نەبێ کە موسڵمانان بەسەریان بردووە، لەکاتێکدا کە پابەندبون بە ئیسلامەوە، ئیسلام تەنها ئەو ڕووداوانەی پێ قبووڵە کە خۆی بۆیانی دروست کردووەو ئەو سەربەرزییەی کە خۆی بنیاتی ناوەو ئەو ڕێگەی کە خۆی بۆی کێشاون و ئەو سەربڵندییەی کە پێشکەشی کردووە!

بەڵام کاتێ کە بەخشش و بنیات و ڕێگە و سەرفرازیەکەی لەدەست دەدەن و شوێنی سەراب و سەرلێشێوان و سەرگەردانی دەکەون، ئەوا دان

نانێ بەمەیاندا و قەبوڵیشی نیە ئەمە بدرێتە پاڵی.

ئەمەش پەلکێشمان دەکات بۆ ڕاستیەکی تر، کە بریتیە لەوەی سەرجەم مێژووی موسڵمانان پیرۆز نیە و، هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکانیشی جێی وەرگرتن و ڕازیبوون نیە، لێرەوەش بە دەرمارگیری و پیرۆزیەوە لەگەڵ ڕووداوەکانی مێژووماندا هەڵسوکەوت ناکەین و شپرزە نابین بۆ پاکانەی سەرجەم کردارەکانی پێشینانمان و تەبەنی کردنی سەرجەم ئەوەی پێی هەستاون.

ئەوەی پەسەندە لامان ئەو هەڵسوکەوتە ڕاست و دروست و باشانەیە کە پێشینانمان پێی هەستاون، بەڵام هەڵسوکەوتە چەوت و هەڵەکان ئەوە لەلامان ڕەتکراوەیەو دانیش دەنێین بەوەی ئاوەها ڕەفتارێکیان لێ وەشاوەتەوە، پاشان ئینکاری دەکەین و توڕی دەدەین و خۆمانی لێ بەری دەکەین!

پێویستە موسڵمانان ئاشنای مێژووی پێشینانیان بن، بە سەرجەم ئەوەی تێیدایە، شارەزای لاپەڕە سپی و ڕەشەکانی بن، لە هەموو ئەوانە سوودمەند بن و پەندی لێ وەرگرن.

بۆ گەیشتن بەم مەبەستە و پێشکەشکردنی ئەم خزمەتەش ئەم (چەند تروسکە مێژووییە وەردەگرین لە مێژوومان و پێشکەشی خوێنەرە بەڕێزەکانی دەکەین).

ئێمە لەگەڵ مێژوومان‌دا چەند هەڵوێستەیەك دەکەین، چەند سات و کاتێك لەگەڵی دەڕۆین و چەند لاپەڕەیەکی لێ هەڵدەدەینەوەو چەند بەرهەم و بەشێکی لێ دەچنین و ئەم چەند تروسکەی لێ وەردەگرین.

لەم تروسکە مێژووییانەدا، چەندان لاپەڕەی سپیی پرشنگدار هەن و چەندان خاڵی ڕەشی تاریکستانی تێدایە، تیایدایە شاد و دڵخۆشت دەکات و هەشە ئازار و خەمبارت دەکا، تیاشیدایە لەڕووی گەورەیی و شانازییەوە سەری موسڵمانانی پێ بەرز دەبێتەوە، تیاشیدایە لە شەرم و شەرمەزاریدا سەری پێ شۆڕ دەبێ.

ئازار و هیواکان و ئیجابی و سلبییەکان پێکەوە دێن، بەڵام لە هەموو

ئەمانەدا پەند و ئامۆژگارییەكان بەدی دێن!!

خوێنەرانیش تەنها مەرجێكیان لەسەرمان هەیە، ئەوەش بریتیە لەوەی سوور بین لەسەر وەرگرتنی ئەو نمونانەی كە چەندەها دیمەن و چنینەوەی تێدایە، لە ڕاستترین فەرموودەو گوفتار و گێڕانەوەكاندا.

جا (دەفتەرەكانی) مێژوومان هەڵدەدەینەوە و ئاشنای لاپەڕەكانی دەبین و دێرەكانی هەڵدەكۆڵین و پاشانیش ئەم هەڵكۆڵینە مێژووییانەتان پێشكەش دەكەین.

لە ڕاستیشدا ئەم هەڵكۆڵین و تروسكانەمان بۆ كات بەسەربردن و دڵدانەوەو بەجێگەیاندنی چێژێكی چیرۆك ئامێز نیە، ناشمانەوێ لای خوێنەر بگۆڕێ بۆ چیرۆك و حیكایەت و كاتەكانی پێ بەرنە سەر.

بەڵكو دەمانەوێ لە ئاستیا بوەستین توێژەری وردبین بین، پشكنەری وردبین بین، ئامۆژگاری و پەند وەرگر بین.

ویستی خوا وابوو حەڵقەی یەكەمی ئەم چەند تروسكە مێژووییە دەربارەی باشترین موسڵمانان بێ لە دوای پێغەمبەری خوا كە هەرچوار خەلیفەی ڕاشیدینە، ڕەزای خوایان لێبێ.

تیایدا دیمەنەكانی جێنشین بون و شەهیدبونی هەریەكەیانمان بۆ خوێنەرانی بەڕێز پێشكەش كردووە، چۆن موسڵمانان هەڵیان بژاردووە بە جێنشین، چۆن تاوانكاران لە تیرۆركردنیدا سەركەوتووبون و پاشان بە شەهیدی گەیشتووە بە پەروەردگاری.

ناشزانین حەڵقەی دووەمی ئەم چەند تروسكە كەی دەبێ و بابەتەكەی چی دەبێ، چونكە ئەم تروسكانەمان زۆر و زەبەندەن.

هەر خواشە ئەوەی ویستی بێ ئەندازەگیری دەكا.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

الدكتور: صلاح عبدالفتاح الخالدي

صويلح

پێنجشەممە

١٩٩٤/٧/٧ - ١٤١٥/١/٢٨

ستایشکردنی هاوەڵان و خەلیفەکان

# خەلیفەکانی ڕاشدین
## لەنێوان جێنشینبون و شەهیدبوندا

لە راستیدا سەردەمی خەلیفەکانی راشدین، باشترین سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامین و ماوەی فەرمانڕەواییشیان بەفەڕترین ماوەیەکە و ئەو نەوەیەی ئەوانیش نەوەی سەرمەشقن بۆ موسڵمانانی دوای خۆیان، چۆن وا نیە لەکاتێکدا ئەوان هاوەڵی پێغەمبەری خوا بون، ئەوانەی خوا لە ستایشیاندا دەفەرموێ:

﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ: ئەوانەی پێشەنگ و یەکەمین بون لە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی بە ڕێك و پێکی شوێنیان کەوتوون، خوای میهرەبان لەهەموویان رازیەو ئەوانیش لەو رازین.﴾التوبة/١٠٠.

خوای گەورەش فەرمانمان پێ دەکات بەوەی خۆشیانمان بوێ و ستایشیان بکەین و بۆیان بپاڕێینەوەو دڵمان پاك کەینەوە لە هەر کینەو ناحەزی و رقێك بەرامبەریان، بەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ: ئەوانەی بە شوێن کۆچکەران و پشتیواناندا دێن (تا کۆتایی دونیا ئەمە دوعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا! لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆشبە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر.﴾الحشر/١٠.

هەروەها پێغەمبەری خواش ستایشیان دەکات بەو فەرموودەیەی دەفەرموێ: ((خير القرون قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم: باشترین سەدەکان سەدەی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دواتر.)).

خەلیفایەتی سی ساڵە

ماوەی خەلیفەکانی راشدین سی ساڵی تەواو بەردەوام بوو، پاشان ماوەی فەرمانڕەوایی بەنی ئومەییە هات، بەمەش ئەو فەرموودەیەی

پێغەمبەری خوا هاتەدی کە تیایدا دەفەرموێ: ((الخلافة بعدي ثلاثون سنة، ثم تكون ملكاً: خەلیفایەتی پاش من سی ساڵە، پاشان دەبێتە پاشایەتی.))

ماوەی خەلیفەکانی ڕاشدین لە مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی یانزەی کۆچی دەستی پێکرد، لەکاتێکدا بەیعەتی خەلیفایەتی درا بە ئەبوبەکری صدیقﷺ، لە مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی چل ویەکی کۆچیش کۆتایی هات. ئەمەش لەکاتێکدا کە حەسەنی کوڕی عەلی لەساڵی کۆمەڵ(عام الجماعة)دا وازی لە خەلیفایەتی هێنا بۆ معاویەی کوڕی ئەبوسوفیانﷺ، پاش پەرتەوازەییەك کە چەندان ساڵ بەردەوام بوو، موسڵمانان لەسەر موعاویە کۆك بون.

هەر لەبەر ئەمەبوو هاوەڵی بەڕێز موعاویەﷺ دەیوت: (من دواهەمینی خەلیفەکان و یەکەمینی پاشایانم).

ماوەی خەلیفایەتی ڕاشدین (شەپۆلێکی ئیسلامی) بەهێز و بزاڤێکی ئیسلامی جیهادی بەفەڕی بەخۆوە بینی، بەشێوەیەك تێکۆشەرە موسڵمانەکان بە وڵاتاندا بڵاوبونەوەو جیهادی دوژمنانی خوایان کرد و وڵاتی کافرانیان لابرد و گەلانی ناوچەیان هێنایە ناو ئیسلامەوە.

پیلانی ڕقاوی دژ بە خەلیفەکان و نوممەت

ئەم سەرکەوتنە ئیسلامیانە ڕق و کینەی دوژمنانی دوابڕاوی زیاتر کرد، دژ بە ئیسلام و موسڵمانان، لە جولەکە و گاور و ئاگرپەرستەکان، هەر بۆیە کەوتنە نەخشە و پلان دانان و دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان.

ئەم قین لەدڵانە سوربون لەسەر تێك و پێك دانی ژیانی موسڵمانان و جێ‌پێ‌کردنەوەی پەرتەوازەیی و جیاوازی لە نێوانیاندا و پچڕ کردنی یەکپارچەیی و لاوازکردنی یەکڕیزییان.

پیلانەکانیان دژ بە خەلیفەکانی ڕاشدین ئاراستەکرد، خۆ ئەگەر ئەبوبەکری صدیقﷺ دوای جێنشینایەتیەکی کورت بە مردنێکی ئاسایی مرد، ئەوا دوژمنان توانیان خەلیفەکانی تر (عومەر و عوسمان و عەلی) تیرۆر بکەن تا بە شەهیدی بە دیداری پەروەردگاریان گەیشتن (إن شاء

الله).

ماوەی خەلیفەکان پڕ بوو لە ڕووداوەکان

ماوەی خەلیفەکانی ڕاشدین پڕ بوو لە ڕووداو و گۆڕانکارییەکان، ماوەیەکی بزاڤی کرداری جیهادی بوو، لە هەمان کاتدا لە بەپێزترین ماوەکانی مێژووی ئیسلامیەیە و لە هەمووشیان دەوڵەمەندترە بە کەرەستە و هەواڵ و وتەو زانیارییەکان.

هەواڵخوانان ڕووداو و گۆڕانکارییەکان و کارەساتە کتوپڕەکانی ئەو ماوەیەیان نەقڵ کردووەو گەیاندوویانە بە پاش خۆیان و مێژوونووسانیش لە کتێب و دانراوەکانیاندا کۆ و تۆماریان کردووە.

لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵ و دەستە و مەزهەبەکان پاش سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین دروست بون، هەر لە شیعە و خەواریج و مورجیئە و موعتەزیلەوە، بەڵام هەر یەکەیان بۆ سەرخستنی کۆمەڵەکەی خۆی و بەڵگەهێنانەوە بۆ بۆچونەکەی ڕووی لە ماوەی خەلیفەکانی ڕاشدین دەکرد، تا پەیڕەوکەرانی بۆ ڕەواو ڕاستی بانگەشە بکات.

هەواڵخوانانی جێمتمانە و هەواڵخوانانی درۆزن

بەڵام کاتێ هەندێ لەو ئارەزوو ویستانە ئەوەی دەیانویست لەژیانی هاوەڵاندا دەستیان نەکەوت، هەستان بە دانانی ریوایەتەکان و هەڵبەستنی هەواڵەکان و بەدرۆودەلەسە و بوهتانەوە دەیاندایە پاڵ هاوەڵان.

لەکاتێکدا هەواڵخوانانێکی ڕاستگۆ و جێمتمانە دەبینراو و هەواڵی هاوەڵانیان بە ڕاستگۆیی و ئەمانەت و بابەتیبونەوە بۆ دەگێڕاینەوەو مێژوونوسە موسڵمانەکانیش تۆماریان دەکرد و پشتیان پێ دەبەستن و وەریان دەگرت.

ئا لەو کاتەدا هەواڵخوانانێکی دەم هەڵبەستی بێویژدان هەرهەبون هەڵدەستان بە دروستکردن و دانانی درۆو بوختان و بڵاوکردنەوەی، پاشان دەیاندایە پاڵ هاوەڵان و لەناو خەڵکیشدا بڵاویان دەکردەوە، دیارە مێژوونوسە موسڵمانەکانیش ئەم درۆ و بوختانانەیان دەبیست و پێیان دەگەیشت.

مێژوونوسەکان هەموو شتێکیان تۆمار کردوە

لێرەوە مێژوونوسە موسڵمانە یەکەمینەکانی وەك (ئیمامی طبری)

هەستان بە تۆمار و كۆكردنەوەی هەموو ئەو ریوایەت و هەواڵانەی كە لەسەر ماوەی خەلیفەكانی راشدین پێیان دەگەیشت، ئیتر ئەگەر ئەو ریوایەتانە راست و دروست بوبێت و لە هەواڵخوانی راستگۆ و جێ‌متمانە دەرچووبێت یاخود ریوایەتی درۆ و هەڵبەستراو بێ و لەهەواڵخوانە دەم هەڵبەست و تیابەرەكانەوە بوبێت.

هەموو ئەو تێكەڵ و پێكەڵە زۆرەیان لە دانراوەكانیاندا كۆدەكردەوەو راست و دروست و پوچ و درۆیان پێكەوە تێكەڵ دەكرد و راستەكانیان جیا نەدەكردەوە لە ناڕاستەكان و دەریان نەدەهێنان، یاخود حوكمیان بەسەردا نەدەدان، بەڵام رچە(سند)ی ئەو ریوایەتانەیان دەهێنا، پیاوی هەر رچەیەكیان باس دەكرد، هەر بۆیە لە یەك ڕووداودا چەندان ریوایەتی دووبارە یاخود دژ و ناكۆكیان دەهێنا.

وەك ئەمانەتێكی زانستی

هێنانی ئەو هەموو تێكەڵ و پێكەڵییەی ریوات و هەواڵەكان، پشت پێ‌بەستن و متمانەبون و وەرگرتنی ناوەڕۆكەكانیان نەبوو، بەڵكو هێنانیان تەنها لەڕووی ئەمانەتی زانستیەوە بوو كە پاڵی پێوە ناون بۆ تۆمار و كۆكردنەوەی هەر شتێ پێیان گەیشتووە، ئیتر چ راست بووبێ یا درۆ، ڕەوا بووبێ یا ناڕەوا، یاخود گێڕەوەكانی دادگەر و راستگۆ بووبێتن یاخود بریندار و دەم هەڵبەست و درۆزن.

بانگەشەی جوان هەڵبژاردن و [دە]رهێنانیان دەكرد

(هەڵبژاردنیشیان) دەدرایە خوێنەر كە پاش خۆیان پێی هەستێ، تا پشت بە ریوایەتە دروست و راستەكان ببەستێ و ریوایەتە درۆكان توڕ و فڕێ بدات.

لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە سەرجەم ئەوەی ئەوان تۆمار و كۆیان كردووەتەوە وەری نەگرن و پشت نەبەستن بە سەرجەم ئەوەی باسیان كردووە، بەڵكو بە ئاشكرا ئاگاداری ئەوەیان داوە كە لەنێو كتێبەكانیاندا ریوایەتی درۆ و پڕوپوچ هەیە! هەر بۆیە لەسەر خوێنەرە جوان وردبێتەوەو توێژینەوە بكات، تۆمارەكانیان بخاتە ژێر تیشكی پێوەرێكی ورد و تەرازویەكی ڕاست پێكاو، كە ئەوەش بریتیە لە رێسای

(زانستی جەرح و تەعدیل) کە زانایانی فەرمووده دایاننــاوه، ئەوانــەی فــەرموودەکانی پێغەمبــەریان پاراســت و بــەجوانی توانیــان راســت و دروستەکانی له لاواز و هەڵبەستراوەکانی جیا بکەنەوه!

زۆربــەی خوێنــەرانی کتێبــه یەکەمــەکانی مێــژووی ئیــسلامی -وەك مێــژووی طــبری- ئامۆژگــاری ئــەو مێژوونوســه ناودارانــەیان لــەبیر کــرد و رویــان کــرده ئــەو هــەموو تێکــەڵ و پێکەڵیــەی لــە دانراوەکانیانــدا هــەبوو، بەشێوەیەك وەریــان گــرت و قبوڵیــان کــرد و پــشتیان پێبەســت وەك ئــەوەی هــیچ گێڕانەوەیــەکی درۆ و هەڵبەســتراوی هەواڵخوانــه دەم هەڵبەســتەکان بونی نەبێ!!

لەباش ئەوان ڕەوا و ناڕەوا وەرگیرا

لەگــەڵ ئەوەشــدا ئــەم درۆ هەڵبەســتنەیان دەدایــه پــاڵ هــاوەڵانی پێغەمبــەری خــودا و بــه سەرچاوەیەکی مێــژوویی جێگیر و زانیاریـیـەکی مێژوویی ئــەمین و پارێزراو و وەرگێڕانێکی مێــژوویی ماوەی خەلیفەکانی راشدینیان دادەنا...

هــەر بۆیــه بــه چــەند ئــەنجامێکی هەڵە گەیشتن و چــەندەها ریــسوایی و تاوانکــاری و گونــاهی گــەوره و کــاری ناشایستەیان دەدایــه پــاڵ هــاوەڵانی ڕێزدار.

پاشان کەسانی کینه و قین لەدڵ هاتن یان ئەو موسڵمانه گێل و بێئاگا و فریودراوانــەی پێیــان کاریگــەر بون لــەم ســەردەمەدا و، دەســتیان کــرد بــه وەرگرتنی هەموو ئەو باسانەی لەو کتێبه مێژووییه یەکەمینانــەدا هــاتووەو ســاز و گونجــاوه لەگــەڵ ئارەزووەکانیانــدا و ناشایــستەیی دەداتــه پــاڵ سەردەمی خەلیفه راشدیەکان و ئەو درۆ و دەلەسانەشیان له چەندان کتێب و دانراویانــدا پیــشان داوه و بانگەشــەی زانــستی و مەنهــەجی بــون و توێژینــەوەو پــشکنین و بابــەتی بــونی بــۆ دەکــەن و خوێنــەران هــان دەدەن تاوەکو وەری گرن و پشتی پێ ببەستن.

کین له دڵان چەندان هەڵەی مێژوویی بڵاودەکەنەوه

ئــەو کتێبانــەش لــەنێو موســڵمانانی ئــەم ســەردەمەدا بڵاوبویــەوەو رۆشــنبیری‌یەکی مێــژوویی پــێ پێــك هــات و کردوویاننــه سەرچــاوه بــۆ

**زانیارییەکی مێژوویی ڕاستگۆی سەردەمی هاوەڵان.**

پرسیارکاران بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن

**هەندێ لەو برا بەڕێزانەی ئاگاداری کتێبی ئەو نوسەرە هاوچەرخانەن، یا ئەو ریوایەتە درۆیینانەیان لە کتێبی پێشاندا بینیوە، هەر بە سروشت و فیترەتی خۆیان پەسەندیان نەکردوون و بە فیراسەتی خۆیان گومانیان لێیان هەبووە، پاشان هەستاون بە پرسیارکردن لە حەقیقەتی مەسەلەکە.**

**زۆرجار لەو برا دڵسۆزانەوە چەندان پرسیاری دڵسۆزانەمان دەربارەی هەندێ ڕووداوی سەردەمی هاوەڵانی بەڕێز ئاراستە کراوە، ئێمەش هەستاوین بە پێشکەشکردنی وەڵامە ڕاست و دروستەکان.**

پێویستیەکی زۆر بە مێژووی سەردەمی خەلیفەکان

**هەر لەم ڕوانگەیەوە، زۆر بە پێویستمان زانی پوختەیەکی مێژوویی دەربارەی هەندێ لەو ڕووداوە وروژێنەرانە بخەینە ڕوو کە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدیندا ڕوویان داوە، بەتایبەت ئەو ڕوداوانەی هاودەم بون لەگەڵ توندوتیژی و پیلانە فێڵاویەکانی دوژمناندا. پاشانیش درۆ و بوختانیشیان بە دەورا کراوەو، شیکردنەوەشیان چەندان بیروبۆچونی جیاجیای لەخۆگرتووەو بڕیاری جیاوازیان لەبارەوە دراوە.**

چەند تروسکێك لەمەڕ جێنشینبون و شەهیدبونیان

**بابەتی (بونی خەلیفەکانی ڕاشدین و شەهیدبون)یانمان هەڵبژارد، بۆ ئەوەی وێنەیەکی پوخت و چەند چنینەوە و دیمەنێکی خێرای پێشکەش بکەین، لەمەشدا پشتمان بەستووە بەو گێڕانەوە ڕاست و دروستە وەرگیراوەکان و خۆمان بواردوە لە گێڕانەوە درۆ و ڕەتکراوەکان.**

**ئامانجی ئێمە لەم (تروسکە مێژووییانە) لەسەر خەلیفەکانی ڕاشدین لە ڕوانگەی جێنشین بون و شەهیدبونیانەوە، ڕەخنەگرتن نیە لە ریوایەتە درۆکان بە دەرخستنی درۆی ڕاوی‌یە دەمهەڵبەستەکانیان، نە مشت و مڕی ناوەڕۆکی ئەو درۆیانەیە بە مشت ومڕێکی زانستی و مەنهەجی و دەرخستنی هیچ و پوچی ئەوەی تێدایە.**

پێشکەشکردنی زانست نەك ڕەخنە

**نەمانویستووە (مشت ومڕی مێژوویی) بنوسین، لەگەڵ ئەوەی ئەو بابەتە بۆ باس و نوسین و پشکنین و وردکردنەوە گونجاوە، بەڵکو خوای گەورە هاوکاری یەکێك لەتوێژەرەوان بکات بۆ نوسین و مشت و مڕ کردن**

کردن لەو بابەتەدا.

ئێمە ویستومانە وێنەیەکی کورت و پوخت پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێز بکەین، بە هەڵگۆستن لە پوختەی ریوایەتە دروستەکان، بۆ ئەوەی ببێتە توێشویەکی زانستی و توێشووی ئێوەرگرن و ببێتە ژەمێکی ڕۆشنبیری و رووی تێبکەن و (کەرەستە)یەکی مێژوویی و بنیاتی زانیاری مێژووییانی پێ بکەن.

نوسینی بنیاتنەرانە و رەخنەگرانە لە زانستە ئیسلامیەکاندا

وا دەبینین پێویستە لە سەرجەم بابەتە ئیسلامیەکاندا لە: عەقیدە، تەفسیر، فەرمودە، مێژوو، فیقه، زمان، بە دوو ئاراستە بنووسرێ.

ئاراستەیەکی ئیجابی (بنیاتنەرانە)، ئەوەش بە پێشکەشکردنی پوختەیەکی زانستی و بابەتی (بنیاتنەرانەی ئیجابی) بۆ ئەوەی ببێتە زانست و مەعریفە و قەناعەت و تێشویەك بۆ خوێنەری موسڵمان.

ئاڕاستەیەکی زانستی رەخنەیی رۆشنبیری، ئەوەش بە خستنەڕووی دید و بۆچوونە رەتکراوەکانی بابەتی توێژینەوەو رەخنە لێگرتن و هەڵوەشان و رەت و پوچکردنەوەی و رونکردنەوەی ساختەیی و پوچەڵی، بۆ ئەوەی خوێنەری موسڵمان بەئاگا بێ لێی و پێی نەخەڵەتێ.

ئەوەی جێی داخە لە (کەلەپوری رۆشنبیری ئیسلامی)ماندا ئەوەیە زۆرینەی دانراوەکانی زانا پایەبەرزەکانمان -لە زانینە ئیسلامیە جیاجیاکاندا- بە ئاراستەی دووەمی رەخنەییدا دەڕوا، ئەمە داواکراوەو پێویستە و گەرەکە ببێ، بەڵام ئەمە هەمو شتێك نیە.

نوسراوە ئیجابیە (بنیاتیەکان) لە هەر بابەتێکدا بێ، کەمن ئەگەر نەڵێین دەگمەنن!!

ئەمە تێبینیەکە و تۆماری دەکەین بۆ ئەوەی دان بەوەدا بنێین کە ئێمە لەم تروسکە مێژوویەدا لەسەر جێنشین بون و شەهیدبونی خەلیفەکانی ڕاشدین لەسەر ئاراستەی زانستی یەکەم دەڕۆین و ئامانجمان پێشکەشکردنی ئەو توێشووە بنیاتیە مێژووییەیە!!

تێکەڵ و پێکەڵیەکی مێژوویی گەورە رەواو ناڕەوای تێدایە

بە گەڕانەوەمان بۆ کتێبە مێژوییە سەرەتاکان، تێکەڵ و پێکەڵیەکی

گەورەی ریوایەتە مێژووییەکان دەبینین، کە دژیەکن، هی وایان هەیە دووبارەیە و هی واشیان هەیە کۆمەڵێك شت و گوفتار و رەفتاری وا دەداتە پاڵ هاوەڵە بەڕێزەکان کە شیاو و گونجاو نیە لەگەڵ ئیمان و تەقوا و برایەتیان، تیایاندایە کەسانێکی درۆزن و دەمهەڵبەستی تیابەر ریوایەتی کردووە.

لەو ریوایەتانەشدا هەیە راست و دروستن، کەسانی راستگۆ و جێمتمانە ریوایەتیان کردووەو ئادگاری بێلایەنی و ئینساف و بابەتی و زانستی و مەنهەجی بونی پێوە دیارە.

هەموو ئەمانەمان لەپێش چاوە، سورین لەسەر (باش) پاکژکردن و هەڵبژاردن و وەرگرتنی راست و دروستەکان، لەوانەی جێمتمانەکان ریوایەتیان کردووە و شیاویشە لەگەڵ ئیمان و تەقوای هاوەڵان.

پشت بەستن بە راستە پەسەند کراوەکان

لەمەشدا پشت ئەستورین بەوەی زانایانی بەویژدانی مێژووی ئیسلامی بڕیاریان داوە و زانایان فەرمووودەناسی شارەزاش پشتیان پێی بەستوە، ئەوەی ئەوان پشتیان پێی بەستووە ئێمەش پشت ئەستورین پێی و ئەوەشی وەریان گرتووە وەری دەگرین و ئەوەشی پەسەندی ناکەن پەسەندی ناکەین، هەر بۆیە ئێمە لەم بوارەدا لە هەڵبژاردنەکانماندا شوێن پێی خاوەن زانست و پسپۆڕان هەڵدەگرین.

وەرگرتن لە مێژووی گبری

سەرچاوەی یەکەم و گرنگیشمان بریتیە لە (تأريخ الأمم والملوك)ی پێشەوای مێژوونوسان و موفەسیران (أبو جعفر بن محمد بن جرير الطبری) رەحمەتی خوای لێبێ، لەم کتێبەشدا پشتمان بەو چاپە بەستووە کە (محمد ابو الفضل ابراهيم) دەریکردووە.

(طبری) لە مێژووەکەیدا زۆر و زەوەندی کۆکردۆتەوەو تۆماری هەواڵە صەحیح و ریوایەتە هەڵبەستراوو پڕوپوچەکانیشی کردووەو بانگهێشی دەکات بۆ چاك هەڵبژاردنی زانستی و مەنهەجی.

لەو ریوایەت و هەواڵانەی لە (طبری)دا هەیە صەحیح و راستترینەکەیمان هەڵبژاردووەو هەر بۆ ئەمەش پشتمان بە زانایانی

تەحقیقکار بەستووە.

پشت بەستن به مێژووی ئیبن کثیر

گرنگترین دانراوێکیش کە لێیەوە ڕوانیومانە بۆ مێژووی (طبری) بریتیە لـە (البدایـة والنهایـة)ی پێـشەوای مێـژوونوس و فـەرمودەناس (ئـیبن کثیر)و(الکامل فی التأریخ)ی پێشەوای مێژوونوس (ئیبن الأثیر).

زۆرینەی ئەوەی (ئیبن کثیر) وەری گرتووەو پەسەندی کردووە ئێمەش وەرمان گرتووەو پەسەندمان کردووەو زۆرینەی قسەکانی ئەومان گوتووە، چـونکە مێژوونوسـێکی بـە ئینـساف و فەرمودەناسـێکی بەئاگایـە، لـە مێژووشدا بۆ ژیانی هاوەڵان پشتی بە ڕیوایەتە صەحیحەکانی پێشەوا (ئیبن جریر الطبری) بەستووە.

پشت بەستن به تۆژینەوەکانی (العواصم من القواصم)

بۆ قسەکردنیش لەسەر هەردوو خەلیفە عوسمان و عەلیﷺ، سودمان لە دوو کتێبی پڕ لە ویژدان وەرگرتووە، ئەوانیش (العواصم من القواصم في تحقیق مواقف الصحابة بعد الرسول اللهﷺ)ی پێشەوا و قازی ابوبکر محمد بن عبدالله، ئیبن العربی المالکی، کە پێشەوا محب الدین الخطیب ڕەحمەتی خـوای لێبێـت دەری کـردوەو تـەعلیقی لەسـەرداوەو چـەندان پـەراوێزی زانستی و بابەتی بۆ داناوە کە هەموو خوێنەرێکی بە ویژدان پێویستی پێیەتی.

وە کتێبی (الخلیفة المفتري علیه: عثمان بن عفان)ی زانای مێژوونوس (محمد صادق عرجوف) ڕەحمەتی خوای لێبێت، کە تیایدا لە زۆربەی ئەو ئیشکالیەتانەی لەسەر عوسمانﷺ، وروژێنراوە، خاڵی لەسەر پیت داناوە.

ڕیزبەندی و ڕێکخستنی ڕوداوەکان

ڕیوایەتە صەحیحەکانم لە مێژووی (طبری) وەرگرتووە بە پشت بەستن بـە تـەرازو و پێوەر و دیـدی (ئـیبن کـثیر)و ڕۆڵـی خۆشـم هێنـانی زنجـیرەی ڕوداوەکانـە بەڕیزبەندیـەکی مێـژوویی و پاشـان ڕێکخـستنی نێوانیـان و داڕشتنەوەیان بە داڕشتنەوەیەکی نوسراوەیی ئەدەبیانەی هاوچەرخ.

دەستکاری لە داڕشتنەوە

واتـە مـن هەنـدێ جـار دەسـتکاری داڕشـتنەوە دەکـەم، ئـەوەش بـە زیـادکردنی هەنـدێ وشـە و ڕسـتەی وا بـۆ ڕونکردنـەوەی ئـەو هەواڵـەی دەیهێنم، یا ئەو دیمەنەی تۆماری دەکەم، تا وێنەکە لای خوێنەر ڕونـتر بێ،

ئەم وشە زیادکراوانە زانیاری تازەی (ئاخنراو)مان بۆ ناخاتە سەر ئەوەی پێشینان وتویانە، بەڵکو جەخت کردنەوەو ڕونکردنەوەیە، ئێمە دەزانین زانایانی فەرمودە بە دروستی دەبینن فەرمودەی پێغەمبەری خوا بە مانا بگێردرێتەوە بە مەرجێ فیکر و زانیاری تازەی بۆ زیاد نەکرێ، جا ئەگەر ئەمە لە فەرمودەی پێغەمبەری خوا دروست بێ، ئەوا لەو گێڕانەوە مێژووییانەی دەربارەی هاوەڵە بەڕێزەکانەوە زیاتر دروست و گونجاوە!!!

پێنج تروسك

ئەو تروسکە مێژووییانەی لە مێژووی (طبری)و(ئیبن کثیر) وەرم گرتوون پێنجن، کە ئەمانەن:

یەکەم: نەخۆشی و مردنی پێغەمبەر

تروسکی یەکەم: نەخۆشی و سەرەمەرگی پێغەمبەری خوایە، پاشان درێژەی پێنج ڕۆژی دوایی ژیانی پێغەمبەر، درود و سلاوی خوای لێبێت و، وەستان لەبەردەم ساتە کۆتاییەکانی تەمەنی و کاریگەری مردنی لەسەر هاوەڵان و پاشان شۆرین و کفن کردن و نوێژکردن لەسەری و سپاردنی.

لەمەشدا پشتم بەستووە بەو گێڕانەوە صەحیحانەی پێشەوا (ئیبن کثیر) هێناویەتی و لە ڕاسترین فەرموودەوە وەریگرتووە.

ئامانج لەمەشدا پێشکەش کردنی وێنەیەکی دروستە لەسەر نەخۆشکەوتن و مردنی پێغەمبەری خوا، بەو پێیەی ڕێخۆشکردنێ بێ بۆ پاش خۆی، کاتێك کە ئەبوبەکری صدیق ﷺ پاش مردنی پێغەمبەری خوا دەبێتە خەلیفە.

دووەم: جێنشین بونی ئەبوبەکر و پاشان مردنی

تروسکی دووەم: (ئەبوبەکری صدیق، لەنێوان جێنشین بون و مردندا) لەکاتێکدا دیمەنی کۆبونەوەی ناودارانی هاوەڵانم هێناوە لە کەپری بەنی ساعیدە کە ئەنجامەکەی بریتی بو لە هەڵبژاردنی ئەبوبەکری صدیق ﷺ بە خەلیفە و بەیعەت دانی هاوەڵان پێی، کە لە پێشیانەوە عەلی کوڕی ئەبوطالب بوو کە دووجار بەیعەتی پێداوە، ئەو چارەسەرە ڕێڕونیەم باسکردوە کە خوای گەورە یارمەتی خەلیفەی ڕاشدی ئەبوبەکری صدیقی داﷺ بۆ گەورەترین ئەو گرفتانەی کە ڕوبەڕووی بویەوە" گرفتی سوپای ئوسامە و گرفتی هەڵگەڕاوەو زەکات نەدەرەکان.

ئەبوبەکر شەهید نەبوو

پاشان دیمەنی نەخۆشکەوتن و سەرەمەگ و مردن و پاش ئەوە نوێژ لەسەر کردن و ئەسپەردەکردنیم باس کردوە.

پشتیشم بەو وتەی هەندێ لە مێژوونوسان نەبەستووە کە دەڵێن ئەبوبەکرﷺ بە ژەهر مردوە، لەکاتێکدا دوژمنانی ئیسلام ژەهریان کردبێتە خواردنەکەیەوە، بەمەش بە شەهیدی دادەنێن، هەمان ئەو قسەیەم کردووە کە زۆربەی مێژوونوسان دەیڵێن کە وەفاتی ئەو مردنێکی ئاسایی بووە بە کۆتا هاتنی ئەجەلی.

لەگەڵ ئەوەی ئەبوبەکر شەهید نەبووە، بەڵام ناونیشانی کتێبەکە (خەلیفەکانی راشدین لە نێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا) بەپێی زۆرینە و زاڵیە، هەروەك زانایانی زمان دەیڵێن، چونکە سێ لەچوار خەلیفەکان شەهیدبون!!

سێیەم: جێنشینی و شەهیدبونی عومەر

تروسکی سێهەم: (عومەری کوڕی خەتتاب، لەنێوان جێنشینی و شەهیدبوندا). درێژەی بەیعەت پێدانەکەی و گرنگترین کارەکانیم لە سەردەمی خەلافەتەکەیدا باس کردووە، پاشان هەڵوێستەیەکی دوورودرێژم کردووە لە بەرامبەر پیلانی تیرۆرکردنی، کە خۆشی هەستی پێکردبوو. دەشیزانی پاش کوژرانی ئوممەتەکەی تووشی فیتنە دەبن. پاشان بەردەوام بووم لە پیشاندانی درێژەی پیلانەکە، کە سێکوچکەی قین لەدڵی (یەهودی -نەصرانی- مەجوسی) چنیبووی و چەند وێنە و دیمەنێکی جێبەجێکردنی پیلانەکەم لەسەر دەستی (ئەبو لؤلؤەی مەجوسی) پیشانداوە.

دوای ئەوە خستنەڕووی دیمەنی عومەرﷺ، لەسەرەمەرگ و پاش ئەوە شەهیدبونی و ئەو وەسیێتانەی پێش مردنی کردوویەتی..

چوارەم: جێنشینی و شەهیدبونی عوسمان

تروسکی چوارەم: (عوسمانی کوڕی عەففان، لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا) درێژەی دیمەنی راوێژکردنەکەی (عبدالرحمن بن عوف)مﷺ باسکردووە کە بوە مایەی بەیعەتدان بە عوسمان.

لەسەرخۆیی پیشاندانی زنجیرەی فیتنە و ڕۆڵی سەبەئیەكان

سوور بووم لەسەر هێواشی و لەسەرەخۆیی پیشاندانی ڕووداوەكانی فیتنەكە، كە پاش شەش ساڵی خەلافەتی عوسمان دەستی پێكرد، هەر لە یەكەمەوە و دیمەن دیمەن، دەستم كردووە بە پیشاندانی زنجیرەی ڕوداوەكان، سەرەتا لەكاتی سەرهەڵدانیەوە لە كوفە و بەصرە، پاشان سوود ئێوەرگرتنی لەلایەن جولەكە قین لەدڵەكان و برەوپێدانی لەلایەن شەیتانی جولەكە (عبدالله كوڕی سبأ)ەوە، كە تاوانكار و دز و دەسەلات ویستە موسڵمانەكانی خستەگەڕ و توانی بەخراپ سود لە موسڵمانە دەشتەكیە سادە و نەفامەكان وەرگرێ، پشتی بەهەموو ئەمانە بەست بۆ تێكدان و هەژاندنی كاروباری موسڵمانان و كوشتنی خەلیفەكەیان.

شوێن هەنگاوەكانی (ڕێكخستنی سەبەئی)ولق و پۆپە كاراكانی لە میسر و كوفە و بەصرە و، گرنگترین شوێنكەوتوان و هاوكارانیان لەو شوێنانە كەوتووم، كە (عبدالله بن سبأ) دایمەزراند.

هەروەك نەخشەی ئەو (سەبەئی)یانەم لە بلاوكردنەوەی پڕوپاگەندە دژ بە عوسمان و والیەكانی و خزان بەرەو مەدینەی منەوەرەو پاشان داگیركردنی بۆ ماوەی چل ڕۆژ خستوەتە ڕوو.

بە درێژایی ڕوداوەكانی مەدینەم لە ڕۆژانی دوایین گەمارۆدا خستوەتە ڕوو و سوور بووم لەسەر باسكردنی درێژەی وردەكاریەكانی دروست و صەحیحی ڕۆژانی دوایی تەمەنی عوسمانﷺ و پەلەكردنی سەبەئیەكان بۆ هێرش و هەڵكوتانە سەر ماڵەكەی و پاشان هەستان بە تاوانی تیرۆر و كوشتنی، پاشان دیمەنی نوێژ و سپاردنیم تۆمار كردووە.

پێنجەم: جێنشین بون و شەهیدبونی عەلی

تروسكی پێنجەم: (عەلی كوڕی ئەبوطالب، لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا)

هەر لەكاتی شەهیدبونی عوسمانەوە لایەكی دەزووەكەم چنیوەتەوەو دیمەنی هەڵبژاردنی (عەلی كوڕی ئەبوطالب)م خستوەتە ڕوو، لەگەڵ گرنگترین ئەو ئەمسەر و ئەوسەر و ڕاوێژەی كە (سەبەئیەكان) پێی هەستان

لەگەڵ هاوەڵە دیارەکان، پاشان هانا و هاواربردنی هاوەڵان بۆ عەلی بۆ ئەوەی رازی بێت بە خەلیفەیەتی و ئوممەت رزگار بکا و هەستانی عەلی بەم بەرپرسیارێتی‌یە و بە لەخۆبوردەیی و فیداکارییەوە، لەگەڵ ئەوەی زانیاری هەبوو بە سەرەنجام و بەرەنجامەکانی.

جیاوازیی هاوەڵان لە هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر عەلی

چەندەها دیمەنم پێشکەش کردوە لە دەرچوونی هەندێ لە هاوەڵانی وەك (طەلحە)و(زوبەیر)و(عائیشە)وگوێڕایەڵ نەبونی هەندێ هاوەڵی تر بۆی وەك (معاویە)و(عەمری کوڕی عاص)ودوورەپەرێزی هەندێ لە هاوەڵان لە فیتنە وەك (سەعیدی کوڕی زەید)و(سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)وبانگەشەکردنی هەندێ لە هاوەڵان بۆ شەڕنەکردن وەك (ئەبو موسای ئەشعەری)و(عیمرانی کوڕی حەصین)وسەرسوڕمانی هەندێ لە هاوەڵان وەك (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی)وئازایەتی نواندنی هەندێ لە هاوەڵان لە پشتگیری‌کردنی عەلی وەك (عەماری کوڕی یاسر)و(عبداللەی کوڕی عەباس) خوا لە هەموویان رازی بێت.

سەبەئیەکان لە سەردەمی عەلی دا

زۆر سوور بوم لەسەر بەدواداچون و پێشچاوخستنی هەنگاو و هەوڵی سەبەئیەکانی نێو سوپاکەی عەلی لە بڵاوکردنەوەی پەرتەوازەیی و فیتنە لەنێوان موسڵماناندا و لەباربردنی هەوڵەکانی صوڵحدا، هەروەك لە پێش جەنگی (الجمل)دا پێی هەستان، هەر لێرەدا ڕۆڵی ئەو سەبەئیانەم تۆمار کردوە لە چەندانەکردنی گرفتەکانی عەلی و لاوازکردنی هەڵوێستی ئەو لە بەرامبەر ئەوانی ترەوە لەبەر بونیان لەنێو سوپاکەیدا، لەو بارەیەشەوە دیدو بۆچونم خستوەتە روو.

کۆی رووداو و جەنگەکانی سەردەمی عەلی

بەدواداچوونی هەنگاوەکانی تیاچوونی ئەم (رێکخستنە سەبەئی)یەم کردوە لە بەصرە پێش و پاش جەنگی جەمەل، پاشان لەناوبردنی ئەم رێکخستنە دوژمنکارە لە جەنگی (صفین)، وەك کوشتنی (الاشتر النخعی) لە رێگەیدا بۆ میسر و کوشتنی (حرقوص کوڕی زهیر) لەگەڵ خەواریجدا.!!

کورتەو پوختەی رووداوەکانی بەصرەو جەنگی (جمل)وشەهیدبونی (طەڵحەی کوڕی عبیداللە)و(زوبەیری کوڕی عەوام)یشم خستوەتە روو.

**پوختەی ڕووداوەکانی جەنگی (صفین)وئەو ئەنجامەی لێی کەوتەوە لە بانگەشەکردن بۆ داوەری(تحکیم)م پێشکەش کردووەو بەدوای کۆبونەوەو ڕێکەوتنەکانی هەردوو ناوبژیکار (ئەبو موسا)و(ئیبن عاص) کەوتوم لە (أَذْرُح)دا کە پاشانیش ئوممەت جێبەجێی نەکردن.**

گیروگرفتی عەلی لەگەڵ خەواریج

**لەگەڵ عەلی دا، لە دوایین و ترسناکترین گرفتی لەگەڵ خەواریجدا هەڵوەستەم کردووە، بە کورتی لەسەر پەرەسەندنی خێرای گرفتەکانیان دواوم هەر لەکاتی دەرچوونیان لەژێر ڕکێفی عەلی لەماوەی جەنگی (صفین)دا، پاشان بەکافر دانانی لەپێش چونە کوفەی لەبەر پەسەندکردنی داوەرییەکە و پاش ئەوە جیابونەوەیان لێی و سەرەنجام کوشتنی زۆربەیان لە جەنگی (نهروان)دا.**

**لە دواییدا دیمەنی ئەو پیلانە دەرەکیەم خستوەتە ڕوو کە (عبدالرحمن کوڕی مولجم) ئامادەی کرد و سەرەنجام سەرکەوتوو بوو لە لێدانی گورزێکی کوشندە لە عەلی بە شمشێر.**

**لەگەڵ دواساتەکانی (عەلی)شدا ژیاوم، کە بەشەهیدبونی کۆتایی هات. پاشان وێنەی نوێژ لەسەر کردن و سپاردنیم خستوەتە ڕوو.**

جێنشین بونی حەسەن و دابەزینی بۆ موعاویە لە ساڵی ـالجماعەـ دا

**پێشم خۆشبوو کۆتایی ئەم تروسکە بە باسکردنی پوختەیەکی کورتی خەلافەتی (حسن)ی کوڕی، بهێنم و ئەو هۆکارانەش باس بکەم کە وای لێکرد صوڵح لەگەڵ (معاویە)دا بکا و لە خەلافەت دابەزێ و، باسێکی پێشبینیەکەی پێغەمبەریش لەو مەسەلەیەدا بکەم.**

**دوا وێنە و بڕگەیەکیش لەو دیمەن و وێنە و بڕگانە بەیعەت پێدانی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیانە، تا ماوەی خەلافەتی ڕاشدین بەو کۆتایی پێ بێ و سەرەتای ماوەی پاشایەتی دەست پێ بکا، ئەوەش لە ساڵی کۆمەڵ (الجماعة)دا بوو!!**

**سوپاس بۆ خوای جیهانیان لەسەر فەزڵ و پشتیوانی و یارمەتیدانی...**

# تروسکی یەکەم

## نەخۆشی و کۆچی دوایی پێغەمبەر

پاش حەجی ماڵئاوایی

**پێغەمبەری خوا تەنها حەجێکی کردووە، ئەوەش (حەجی ماڵئاوایی)یە کە لە ساڵی دەی کۆچیدا بوو.**

**پێغەمبەر لەکۆتایی مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی دەی کۆچیدا گەڕایەوە مەدینەو پاشماوەی (ذي الحجة)ومحرم و صفری ساڵی یانزەی کۆچی لە مەدینەدا بەسەر برد.**

پێغەمبەر سوپای ئوسامە پێك دەهێنێ و گومان لەسەر ئەمیرایەتیەکەی لادەبات

**لە مانگی صەفەری ساڵی یانزەی کۆچی پێغەمبەر سوپایەکی لە موسڵمانە تێکۆشەرەکان نارد و (ئوسامەی کوڕی زیدﷺ)ی کردە ئەمیریان. فەرمانی دا بە ئوسامە کە ڕوەو شام بڕوا و لەگەڵ ڕۆم و هاوکارەکانی لە عەرەبە غەساسینیەکانی (البلقاء) بجەنگێ و، تۆڵەی باوکیشی (زەیدی کوڕی حاریثەﷺ) ، بکاتەوە، کە لە جەنگی موئتەدا شەهید بووبوو.**

**لە سوپای ئوسامەدا کۆمەڵێك لەگەورەپیاوانی کۆچەران و پشتیوانان(المهاجرين والانصار)ی تێدابوو، لەوانە (عومەری کوڕی خەتتابﷺ).**

**وەك ئەوەی هەندێکیان لە ئەمیرایەتی (ئوسامەی کوڕی زەیدﷺ) ، قسەیان کردبێ، کە ئەو لاوێکی مناڵی کەم تەمەنە، پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر تانە لە ئەمیرایەتیەکەی بدەن، ئەوا پێشتریش تانەتان لە ئەمیرایەتیەکەی باوکیشی داوە، سوێند بێ بەخوا ئەو شیاو و گونجاو بوو بۆ ئەمیرایەتی و، لە خۆشەویستترینی خەڵك بوو لای من، بەڕاستی ئوسامەی کوڕیشی لە خۆشەویستترین کەسە لای من.[١]**

سوپا بەهۆی نەخۆشی کتوپڕی پێغەمبەرەوە چاوەڕێ دەکا

**سوپای ئوسامە دوا نێرراوێك بوو کە پەیامبەری خوا بەڕێی خستبوو، بەهۆی نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خوا لەناوچەی (الجُرف)ی نزیك مەدینە مۆڵی دابوو، چاوەڕێی چارەنوسی پێغەمبەری خوا بون، لە بارو گونجاو**

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٣-٢٢٤.

**نەبوو پێغەمبەر نەخۆش بێ و سوپا مەدینە بەجێ بهێڵێ.[١]**

**نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژانی دوایی مانگی (صفر)ی ساڵی یانزەی کۆچیدا دەستی پێکرد.**

پێش دوو هەفتە لە وەفاتی، پێغەمبەر سەردانی بەقیع دەکات

**لە یەکی مانگی (ربیع الاول)، پێش نزیکەی دوو هەفتە لە وەفاتی پەیامبەری خوا هەستا بە سەردانی گۆڕستانی (بقیع الغرقد) کە تیایدا هاوەڵان خوایان لێ رازی بێت، نێژرابون، داوای لێخۆشبونی بۆ هاوەڵانی مردوو کرد و بۆیان پاڕایەوە.**

**سەردانەکەی بۆ (بقیع) لە نیوەی شەودا بوو، کاتێك کە ڕۆژ بوویەوە سەرەتای نەخۆشیەکەی دەستی پێکرد.[٢]**

**زوهری لە (عبداللەی کوڕی عوقبەی کوڕی مەسعود)ەوە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە خوای لێی رازی بێت، کە گوتویەتی:**

**پەیامبەری خوا لە بقیع گەڕایەوە بینیمی من ژانەسەرم هەیە، دەمووت: ئای سەرم، فەرمووی: بەخوا عائیشە بەڵکە من سەرم دێشێ، پاشان پێی وتم: عائیشە! چ زیانێك دەکەی گەر لەپێش مندا بمری، کاروبارت بەڕێوەبەرم و بێمە سەرت، کفنت کەم و نوێژت لەسەرکەم و بتشارمەوە!!**

**وتم: بەخوا ئەزانم ئەگەر وابوایە دەگەڕایتەوە بۆ خانوەکەم و بوکێنی هەندێ لە خێزانەکانت دەکرد..**

**پەیامبەری خواش پێکەنی.**

پەیامبەر لەکاتی نەخۆشیەکەیدا لەماڵی عائیشە مایەوە

**پاشان نەخۆشیەکە لەسەر پێغەمبەری خوا توند بوو، ئەو هەر بەسەر خێزانەکانیدا دەگەڕا، لەکاتێکدا لەماڵی (میمونە)دا بوو، خوای لێ‌رازی بێت، کە نەخۆشیەکەی زۆر زیادی کرد.[٣]**

**پێغەمبەری خوا لەو نەخۆشیەی تیایدا مرد دەیپرسی و دەیوت: من سبەی لە کوێم؟ من سبەی لە کوێم، مەبەستی ئەوەبوو لە ماڵی چ**

---

١ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٣-٢٢٤.

٢ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٣-٢٢٤.

٣ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٣-٢٢٤.

**خێزانێکیدایە، چونکە هەر خێزانێکی بەشە شەوی خۆی هەبوو.**

**عائیشە، خوای لیٚ ڕازی بێت، وتویەتی: پەیامبەری خوا داوای مۆڵەتی لەخێزانەکانی کرد تا لەماڵی مندا بە نەخۆشی بمێنێتەوە، ئەوانیش مۆڵەتیان دا.**

**پەیامبەری خوا لە ماڵی (میمونە)وە بە نەخۆشی چوو بۆ ماڵی عائیشەو بەسەر بەستراوی لەنێوان دوو پیاودا بوو، یەکێکیان عەباسی مامی بوو، ئەویتریان عەلی کوڕی ئەبوطالب بوو، بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە پێیەکانی لە زەوی دەخشان!!**

**لەماڵی عائیشەدا مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.**[1]

**(عروەی کوڕی زوبەیر) لە عائیشەی پوریەوە(خوشکی دایکی) دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا کاتیٚ شوێنێکی بئێشایە (قل أعوذ)ەکانی دەخوێند و فووی بەخۆیدا دەکرد و دەستی بە لاشەیدا دەهێنا.**

**بەڵام کاتیٚ ئەو ئێش و ئازارەی کە تیایدا وەفاتی کرد، من لەگەڵ (قل أعوذ)ەکاندا فووم پێدا دەکرد و دەستی خۆیم بە گیانیدا دەهێنا.**

پێغەمبەر سکاڵای ئەو ژەهرەی کرد کە لە خەیبەردا لەخواردن بۆی دانرابوو

**هەروەها عەروە لە عائیشە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا لە نەخۆشی مەرگیدا دەیفەرموو: عائیشە! ئێستاش هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەردا خواردم، ئەمە کاتی بڕینی دەماری ملمە لەو ژەهرە.**

**پێغەمبەر ئاماژەی دەکرد بەو ژنە جولەکەیەی لە ڕۆژی خەیبەردا گۆشتی دەستێکی حەیوانی ژەهراوی خستە بەردەم پێغەمبەری خوا، ئەویش کاتیٚ تیکەیەکی لیٚ هەڵگرت و جوی، پاشان تفانی و فڕێی دا، فەرمووی: ئەم دەستە هەواڵم پیٚدەدا کە ژەهراویە.. کاتێك (بەشیر کوڕی براء) لەو دەستە ژەهراویەی خوارد بەهۆیەوە گیانی لەدەست دا.**

**پێغەمبەری خواش پرسیاری لە ژنە یەهودیەکە کرد: چی وای لێکری ئەم کارە بکەی؟ وتی: ئەگەر تۆ پێغەمبەر بی، زیانت پیٚ ناگەیەنێت،**

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٣-٢٢٥.

چونکه خوا هەواڵی ژەهراوی بونیت پێ دەدا، خۆ ئەگەر درۆزنیش بی بە ژەهرەکە دەمری و لە دەستت ڕزگارمان دەبێ!

جا کاریگەری ئەو ژەهرە لەسەر پێغەمبەر دووبارە دەبویەوە.

ئیبن مەسعود ڕای وابوو کە پێغەمبەر شەهید بووە

عبدالله‌ی کوڕی مەسعودیش وای دەبینێ کە پێغەمبەری خوا لەژێر کاریگەری ئەو دەستە ژەهراوییەی ژنە جولەکەکەدا مردووە، لەبەر ئەوە شەهیدە.

ئیبن مەسعود وتویەتی: (ئەگەر نۆ جار سوێند بخۆم پێغەمبەری خوا بە کوشتن کوژراوە، پێم خۆشترە لەوەی یەك جار سوێند بخۆم کە نەکوژراوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی خوای گەورە کردویەتیبە پێغەمبەر و بە شەهید!!)[1]

هۆی گریانی فاتیمە و پاشان پێکەنینی بە قسەی پێغەمبەری خوا

(مسروق) لە (عائیشە)ەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (کاتێ کە پێغەمبەری خوا لە ماڵەکەمدا نەخۆش کەوت، هەموو خێزانەکانی لێی کۆبونەوە، هیچ یەکێکیان دوا نەکەوت.

کاتێ کە ئەوان کۆ ببونەوە فاتیمەی کچی، خوای لێ‌ڕازی بێت، بە ڕۆیشتن هات، ڕۆشتنەکەی وەك ڕۆشتنەکەی باوکی بوو.

پێغەمبەر پێی فەرموو: بەخێرهاتی کچم، جا لەلای ڕاستیەوە داینا، پاشان شتێکی بەنهێنی پێوت گریا، پاشان بەنهێنی شتێکی تری پێوت پێکەنی!!

کاتێ فاتیمە لەلای باوکی هەستا، عائیشە، خوای لێ‌ڕازیبێ، دەربارەی ئەوەی پێغەمبەری خوا پێی فەرمووە و جارێك گریانی و جارێك بەپێکەنینی هێنا، لێی پرسی! ئەویش وا وەڵامی داوەتەوە کە من نهێنی پێغەمبەری خوا ئاشکرا ناکەم!!

جا کاتێ پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، عائیشە بە فاتیمەی وت، خوا لێیان ڕازی بێت: داوات لێ دەکەم بەو مافەی کە من هەمە لەسەرت، هەواڵم بدەیتێ بەوەی کەپێغەمبەری خوا بە نهێنی چی پێ وتیت؟

فاتیمە گوتی: ئێستاکە بەڵێ دەیڵێم!!

---

١ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٥-٢٢٧.

چپاندنی یەکەم پێی وتم: لەڕاستیدا جبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی بەسەردا دەخوێندمەوە، بەڵام ئەمساڵ دووجار، واش دەبینم، ئەمە نیشانەی نزیکبونەوەی ئەجەلم بێت، دەی تەقوای خوات هەبێت و خۆڕاگر بە، چونکە من باشترین پێشینێك بووم بۆت.. منیش گریام!!

لە چپاندنی دووەم پێی وتم: رازی نابیت ببیە سەروەری هەموو ئافرەتانی جیهان و ببی بە یەکەم کەس لە خاووخێزانم کە پێم دەگەی! منیش پێکەنیم!

فاتیمە خوای لێ ڕازی بێت، پاش شەش مانگ لە وەفاتی باوکی کۆچی دوایی کرد و بەم شێوەیە بەکردەوە یەکەم کەسی خانەوادەی پەیامبەر بوو لە پێگەیشتنیدا و ڕاستی فەرموودەکەی پێغەمبەری خواش بەدەر کەوت.[١]

ڕوداوەکانی پێنج ڕۆژی دوایی ژیانی پێغەمبەر

پێغەمبەری خوا ویستی نوسراوێك بنوسێ بۆ موسڵمانان تاوەکو ناکۆك نەبن، ئەوەش بە پێنج ڕۆژ پێش وەفاتی بوو، لە بەیانی پێنجشەممەی هەشتی (ربیع الاول)ی ساڵی یانزەی کۆچی.

بەیانی پێنجشەممەی هەشتی ربیع الاول

هەروەك زانراویشە پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول)دا کۆچی دوایی کردووە.

(زوهری) لە (عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود)ەوە لە (عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ)ەوە، کە گوتویەتی: (کۆمەڵێك پیاو لە ماڵەکەی پێغەمبەری خوا ئامادەبون، پەیامبەر پێی فەرموون: کۆببنەوەو بێن نوسراوێکتان بۆ بنوسم، تا لەدوای خۆم بە هیچ کلۆجێ سەرلێشێواو نەبن..

پەیامبەری خوا دەیویست نوسراوێك لەسەر پێسپاردن بە ئەبوبەکر بۆ مسوڵمانان بنوسێ

هەندێکیان وتیان: لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا، ئازار زۆری بۆ هێناوەو، قورئانیش هەیە، کیتابی خوامان بەسە.

هەندێکیان وتیان: وەرن تا نوسراوێکتان بۆ بنوسێ.

لەلای پێغەمبەری خوادا جیاوازی و ناکۆکی و دەمەقاڵەیان لەنێواندا دروست بوو.

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٦

**پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەستن و بڵاوەکەن، لەلای مندا ناکۆکی و دوبەرەکی دروست نیە!!**

**(ئیبن عەباس) ، دەیوت: بەداخەوە زۆر بەداخەوە، ئەوە بووە ڕێگر لەوەی پێغەمبەری خوا ئەو نوسراوەیان بۆ بنووسێ!!)**

**ئەو نوسراوەی کە دەیویست بینوسێ سپاردنی خەلافەت بوو بە ئەبوبەکر، بۆ ئەوەی موسڵمانان لەدوای وەفاتی خۆی جیاواز نەبن.**

**چونکە (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)ی مامی، دەیویست کاروباری جێنشینی لە بەنی هاشمدا بێ!!**

عەباس ئاماژە بە عەلی دەکا تا داوای خەلافەت لەپێغەمبەر بکا، بەلام عەلی رەفزی دەکا

**(عبدالله کوڕی کەعبی کوڕی مالیك) لە (عبداللەی کوڕی عەباس)ەوە، دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (عەلی کوڕی ئەبوطالب لە خزمەتی پێغەمبەری خوا، لەو نەخۆشی و ئێش و ئازارەی پێیەوە وەفاتی کرد، هاتە دەرەوە، خەڵکی پێیان وت: باوکی حەسەن! پێغەمبەری خوا چۆنە؟**

**عەلی وتی: سوپاس بۆ خوا، باش بووە.**

**(عەباسی کوڕی عبدالمطلب) دەستی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ی گرت، پێی وت: بەخوا پاش چەند ڕۆژێك تۆ شوێنکەوتە دەبی!! بەخوا من وادەبینم پێغەمبەری خوا بەهۆی ئەم ئازار و نەخۆشیەوە وەفات دەکا! چونکە من رەنگی مردن لە ڕوخساری کوڕانی (عبدالمطلب) دەناسم!!**

**با بڕۆین بۆ لای پێغەمبەری خوا و پرسیاری لێ بکەین، ئەم ئیش و کارە بۆ کێ دەبێ؟ ئەگەر بۆ ئێمەیە با بزانین، خۆ ئەگەر لەدەستی کەسانی تردا بێ، ئەوا دەزانین، بەڵکو ئامۆژگاریمان بکا!!**

**عەلی پێی وت: بەخوا ئەگەر پرسیاری لێ بکەین و کاروباری بەدەستەوە نەداین، ئەوا لەدوای خۆی خەڵکی ئەم کارەمان پێ ناسپێرێ، بەخوا من ئەمە لە پێغەمبەری خوا ناپرسم).[1]**

**بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا دەیویست دەربارەی بە خەلیفەبونی ئەبوبەکر بنوسێ ئەوەیە کە (قاسمی کوڕی محمد) لە**

---

[1] ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٧-٢٢٨.

(عائیشه)وە دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (وا هات بە دڵمدا بنێرم بەدوای ئەبوبەکردا و ڕای بسپێرم، بۆ ئەوەی قسەکەران هیچ نەڵێن و خوازیاران ئاواتی بۆ نەخوازن، گەر خوا و بڕواداران بەمە ڕازی بونایە).

پێغەمبەری خوا لە ڕۆژەکانی دوایی تەمەنیدا ئاماژەی بۆ ئەبوبەکر دەکرد، وەك ئەوەی بە موسڵمانان بڵێت ئەم ئەرکە لەدوای خۆی بۆ ئەبوبەکر دەبێ.

لە ئاشکراترین ئەوەی لەم بارەیەوە هاتبێ ئەوەیە کە (جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ) ، دەیگێڕێتەوە، دەڵێ: ((ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا، فەرمانی پێکرد کە دواتر سەری لێ بداتەوە، ئافرەتەکە پێی وت: ئەدی ئەگەر هاتم و تۆم نەبینی؟ مەبەستی وەفاتی بوو، پێی فەرموو: ئەگەر منت نەبینی بچۆ بۆ لای ئەبوبەکر!!))

لە ڕۆژی پێنجشەممەی هەشتی (ربیع الاول)دا، پێنج ڕۆژ پێش وەفاتی، پێغەمبەر لەماڵی عائیشەوە دەرچوو بەرەو مزگەوت و وتارێکی کاریگەری دا، کە دوا وتاری بوو بۆ مسوڵمانان.

ئەم وتارە لەجێ و جێگری ئەو نوسراوە بوو کە دەیویست بۆ موسڵمانانی بنوسێ و خەلافەتی تیا بە ئەبوبەکر بسپێرێ.

هەندێك لە هاوەڵان ئەم وتارەیان گێڕاوەتەوە، لەوانە (ئەبوسەعیدی خودری)و (عبداللەی کوڕی عەباس)و (ئوم سەلەمە)و (عائیشە).

(عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود)لە (عائیشە)، ڕەزای خوای لێ بێ، دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا پێش کۆچی دوایی بە پێنج ڕۆژ فەرموی: لە حەوت کوندە، کە دەمەکانیان نەکرابێتەوە، ئاو بکەن بەسەرمدا، تا بچم بۆ لای خەڵکی و سپاردەی خۆمیان پێ بڵێم.. ئێمەش بەگورجی ئاومان لەو کوندانە دەکرد بەسەریا، تاوەکو بەدەستی ئاماژەی پێ‌داین کە داواکاریەکەیمان جێبەجێ کرد!

(ئوم سەلەمە) ـ خوای لێ ڕازی بێت . ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا بە

**سەرپێچراوی دەرچوو، جا کاتێ چووە سەر دوانگەکە، خەڵکی چاویان بڕیە دوانگەکە و گوێیان لە وتارەکەی دەگرت.**

هەندێك لەوانەی پێغەمبەر لەو وتارەدا فەرموی

**لەم وتارەیدا پێغەمبەری خوا فەزڵی ئەبوبەکری صدیقی بەسەر هاوەڵاندا رونکردەوە، کە ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆیان کە دوای پێغەمبەر لەسەر ئەو کاروبارە ناکۆك نەبن!!**

**(ئەبوسەعیدی خودری‌ﷺ) ، گوتویەتی: پێغەمبەری خوا لە وتارەکەیدا فەرمووی:**

**((بەڕاستی خوا بەندەیەکی سەرپشك کرد لەنێوان دنیا و ئەوەی لای خۆی هەیە، ئەو بەندەیەش ئەوەی لای خوای هەڵبژارد!!)**

**لەنێوان خەڵکیدا (ئەبوبەکر) تێگەیشت، بۆیە گریا و بە پەیامبەری وت: لەجێی باوك و دایکمی ئەی پێغەمبەری خوا، باوك و دایك و خۆمان و ماڵمان فیدات بێت!!**

**(ئەبوسەعیدی خودری‌ﷺ) ، دەڵێ: سەرمان سوڕما لە گریانی ئەبوبەکر، بەڵام پێغەمبەر سەرپشك کرابوو، ئەبوبەکریش لەئێمە شارەزاو زاناتر بوو پێی!!**

ئاماژەی پێغەمبەر بۆ فەزڵی ئەبوبەکر

**لەو شتانەی لەبارەی فەزڵی ئەبوبەکری صدیقەوە لەو وتارەدا فەرمووی: ئەمیندارترین کەسێك لای من لە هاوەڵی و سەروەت و سامانیدا ئەبوبەکرە، ئەگەر جگە لەخوا کەسێکی تر بەزۆرخۆشەویست(خلیل) دابنایە، ئەوا ئەبوبەکرم دەکردە ئەو زۆرخۆشەویستە، بەڵام زۆرخۆشەویستی و مەوەددەت بۆ ئیسلامە.**

**پەروەردگارم منی کردووە بە زۆرخۆشەویست و خەلیلی خۆی، هەروەك ئیبراهیمیشی کردبوو بە خەلیلی خۆی.**

**پاشان فەرمووی: هەموو دەرگاکانی ناومزگەوت دادەخرێن، تەنها دەرگای ئەبوبەکر نەبێ.!!))**

**ئەمەش لەبەر ئەوەی هەندێ لە هاوەڵان دەرگایان خستبوە سەر مزگەوت و لێیەوە دەچونە ناو مزگەوتەوە، پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد بە داخستن و گرتنی سەرجەم ئەو دەرگایانە، جگە لە دەرگای ئەبوبەکری**

صدیق نەبێ کە فەرمانی کرد بە کراوەیی بهێڵرێتەوە.

زانایان ئەم جیاکردنەوەیەی ئەبوبەکرﷺ، بە ئاماژەیەکی پێغەمبەر بۆ موسڵمانان دادەنێن تا بیکەن بە خەلیفەی خۆیان، وەك ئەوەی خەلیفەیەتی ئەو دەرگایە بێ کە ئەبوبەکری صدیق لێوەی دەردەچێ بۆ ئەوەی نوێژ بە موسڵمانان بکات.

لەو شتانەی پێغەمبەری خوا لەو وتارەدا ئەنجامی دا: ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان بوو بە چاکەکردن لەگەڵ پشتیوانان(الانصار)دا و داوای لێخۆشبونی بۆ شەهیدانی ئوحود کرد و، ڕێگری کرد لەوەی گۆڕ بکرێت بە مزگەوت، ئەوەش لە فەرمودەیەیدا کە دەفەرموێ: ((نەتەوەیەك لەوانەی پێش ئێوەدا بون، گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکانیان دەکردە مزگەوت، جا ئێوە گۆڕەکان نەکەن بە مزگەوت، من قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکەم))!

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا لە وتارەکەی بویەوە، گەڕاندیانەوە بۆ ماڵی عائیشە، ئنجا ئازار زۆری بۆ هێنا و نەخۆشیەکەی قورستر بوو.[1]

جا کاتێ لە پێنجشەممەی ناوبراودا ئازارەکەی پێغەمبەری خوا توندتر بوو، نەیتوانی نوێژ بە موسڵمانان بکات، بۆیە فەرمانی دا کە یەکێ نوێژیان پێ بکات.

پێغەمبەر لە ڕۆژی پێنجشەممەدا ناتوانێت بە ئیمامەت نوێژیان بۆ بکات

(عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود) لە (عبداللەی کوڕی زومعەی کوڕی ئەسوەدﷺ) ، دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (کاتێ نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوا توندتر بوو، من و چەند کەسێ لە موسڵمانان لە خزمەتیا بووین، بیلالی کوڕی ڕەباحﷺ، بانگی نوێژی دا، فەرمووی: بە یەکێ بڵێن نوێژ بە خەڵکی بکا! (ئیبن زومعە) دەڵێ: دەرچووم بینیم وا عومەر لەگەڵ خەڵکیدایەو ئەبوبەکر دیارنیە.

پێغەمبەر ئیمامەتی عومەر ڕەتدەکاتەوەو داوای ئەبوبەکر دەکات داوایئەبوبەکر دەکات

وتم: عومەر! هەستە نوێژ بە خەڵکی بکە..

جا کاتێ عومەر هەستا بۆ نوێژکردن، پێغەمبەری خوا گوێبیستی دەنگەکەی بوو، عومەر دەنگێکی گڕو گەورەی هەبووە، پێغەمبەر تورە بوو،

[1] ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٢٨-٢٣١.

فەرمووی: ئەبوبەکر لەکوێیە؟! خواو موسڵمانان ئەو کارەیان ناوێ، خواو موسڵمانان ئەو کارەیان ناوێ.

بۆیە ناردیان بەشوێن ئەبوبەکرداﷺ، ئەویش هات و پێشنوێژی بۆ موسڵمانان کرد!

پاشان عومەر بە (ئیبن زومعە)ی وت: ماڵت خراپ نەبێ، ئەوە چیت کرد؟ بەخوا وا گومانم برد کاتێ کە فەرمانت پێکردم ئەوە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا بووە، گەر ئەوە نەبوایە پێشنوێژیم نەدەکرد..

(عبداللەی کوڕی زومعە)وتی: بەخوا پێغەمبەری خوا فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کاتێ ئەبوبەکرم نەبینی، تۆم لە هەموو ئامادەبوان بەشیاوتر زانی!!

پێغەمبەر فەرمان دەکا بە ئیمامەتکردنی ئەبوبەکر و وەڵامی عائیشە دەداتەوە

پاشان پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵکی بکا.

(عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود) لە (عائیشە)وە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (کاتێ پێغەمبەری خوا نەخۆشی مردنی تووش هات، فەرمووی: بچن بە ئەبوبەکر بڵێن نوێژ بە خەڵکی بکا!

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بەراستی ئەبوبەکر پیاوێکی دڵناسکی حەزینە، کاتێ قورئان بخوێنێ خۆی پێناگیرێ و دەگریێ، جا گەر لەجێی تۆ نوێژ بکا ناتوانێ نوێژ بە خەڵکی بکا، ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر فەرمان کەی بە کەسێکی تر تا نوێژ بە خەڵکی بکا!

عائیشە وتی: بەخوا ئەوەی وای لێکردم ئەوە بڵێم ئەوەبوو دەترسام خەڵکی ڕەشبین بن بەرامبەر بە ئەبوبەکر، چونکە دەمزانی هەرکەسێ شوێنی پێغەمبەری خوا بگرێ خەڵکی ڕەشبین دەبن بەرامبەری، پێم خۆش بوو پێغەمبەری خوا ئەبوبەکر بگۆڕێ بە یەکێکی دی!!

دەڵێ: دوو سێ جار دووبارەم کردەوە، بەڵکو تەکلیف لە غەیری ئەبوبەکر بکا، بەڵام فەرمووی: بە ئەبوبەکر بڵێن نوێژ بە خەڵکی بکا، بەراستی ئێوەش، وەك ئافرەتەکانی دەوری یوسفن).[1]

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٣١-٢٣٣.

دوانوێژێك پێغەمبەری خوا بە ئیمامەت نوێژی کرد پێنجشەممە بوو

عائیشە دەڵێ: لەو ڕۆژەوە ئەبوبەکر نوێژی بە خەڵکی دەکرد تا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای پێنج ڕۆژ گیانی سپارد.

دوا نوێژێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی موسڵمانانی تیادا کرد، نوێژی نیوەڕۆ بوو، لەپێنجشەممەی هەشتی (ربیع الاول)دا.

(ئەسوەد) لە (عائیشە)وە دەگێڕێتەوە کاتێ کە پێغەمبەری خوا فەرمووی: بچن بە ئەبوبەکر بڵێن نوێژ بە خەڵکی بکات).

ئەبوبەکریش ﷺ دەرچوو نوێژیان پێ بکات، جا کاتێ قامەتی نوێژ کرا و ئەبوبەکر وەستا تا پێشنوێژیان بۆ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە لەش سوکیەك کرد، بۆیە بە پشت بەستن بە عەلی و عەباس ﷺ، و لەنێوانیان هاتە دەرەوە، جا کاتێ ئەبوبەکر بینی، ویستی دوابکەوێ بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش بکەوێ و نوێژ بە خەڵکی بکا، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بمێنەوە.

پێغەمبەری خوایان ﷺ لە تەنیشت ئەبوبەکرەوە دانیشاند و ئەبوبەکر لە لای ڕاستی پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستا!! پێشنوێژ پێغەمبەری خوابوو کە بە دانیشتنەوە نوێژی پێ‌دەکردن، ئەبوبەکریش ﷺ، بەپێوە بوو ئیقتدای بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد و خەڵکیش بە نوێژەکەی ئەبوبەکر نوێژیان دەکرد!!).

پاشان پێغەمبەر ﷺ لە نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممەدا گەڕایەوە ماڵی عائیشە، لەوە بەدواوە لەبەر توندبونی نەخۆشیەکەی نوێژی بە خەڵك نەکرد.

پێغەمبەر سێ ڕۆژی تەواو لە خەڵکی دادەبڕێ

پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژی تەواو لە خەڵکی دابڕا، هەینی و شەممە و یەك شەممە، لەبەر زۆرهێنان و توندبونی نەخۆشیەکەی نەیتوانی دەرچێ بۆ لایان، یا نوێژیان لەگەڵدا بکا.

لە بەیانی ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول)، قامەتی نوێژی بەیانی کرا و ئەبوبەکر بۆ نوێژکردن بە خەڵکی پێش کەوت، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ پەردەی ژوورە پیرۆزەکەی لادا و سەیری موسڵمانانی دەکرد و بزە دەیگرت...

(ئەنەسی کوڕی مالیكﷺ) ، کە خزمەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ بەهۆی ئازارەکەیەوە سێ ڕۆژ دەرنەچوو بۆ لامان، لەو ماوەیەدا ئەبوبەکر نوێژی پێدەکردین.

پێغەمبەر لە بەرەبەیانی دووشەممە تەماشاکردنی ماڵئاوایی لە موسڵمانان دەکات

کاتێ کە بەیانی ڕۆژی دووشەممە داهات، قامەتی نوێژ کرا و ئەبوبەکر پێش کەوت بۆ ئەوەی نوێژمان پێبکا، لەو کاتەدا لە ڕیزی نوێژ دابەستنا بووین، پێغەمبەرﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا و سەیری ئێمەی دەکرد، کاتێ کە ڕووی پێغەمبەرمانﷺ بینی، هیچ دیمەنێکی وا جوانمان نەبینیی وەك ڕووی ئەو، دەموچاوی وەك پەڕەی قورئان بوو، بزەو پێکەنین گرتبووی...

نزیك بوو لەخۆشی بینینی پێغەمبەرﷺ بە فەتارەت بچین، ئەبوبەکر بەدوادا گەڕایەوە ڕیزەکە، وای گومان برد پێغەمبەرﷺ دێتە ناومان و نوێژمان پێ دەکات، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ ئاماژەی پێداین کە نوێژەکانتان تەواو بکەن!

پاشان پەردەکەی دادایەوەو موسڵمانان نوێژی بەیانیان کرد.

ئەمەش دواجارێك بوو موسڵمانان پێغەمبەریﷺ تیادا بە زیندوویی ببینن و، بۆ دواجار ئەویش بۆیان بڕوانێ.

ئا بەو شێوازە، پێغەمبەری خواﷺ بەو ڕوانینە سۆز بەخش و بزە خۆشەویستیەوە ماڵئاوایی لێکردن.

ئەبوبەکر وادەزانێ پێغەمبەر چاك بۆتەوەو دەچێت بۆ ناوچەی (سنح)

کاتێ ئەبوبەکر نوێژی بەیانی بە خەڵك کرد و ئەو ڕوانین و بزەیەی پێغەمبەری خوایﷺ بینی، چوو بۆ لای عائیشە، خوای لێڕازیبێت، پێی وت:

عائیشە! وا دەبینم پێغەمبەری خوا ئازارەکەی نەما و نەخۆشیەکەی لاچووە، ئەمڕۆ ڕۆژی (کچی خارجە)یە و دەچم بۆ لای.

(کچی خارجە) یەکێکە لە خێزانەکانی ئەبوبەکری صدیق و لە ناوچەی (سنح) دادەنیشێت، کە ناوچەیەکی کشتوکاڵی بوو دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی مەدینەو لە دەوروبەری مەدینەدا بوو.

لەپاش بەیانی ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول)، ئەبوبەکر

ئیبن مەسعود ئازار و تای پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە

سواری ماینەکەی بوو ڕوی کردە ماڵی خێزانەکەی لە ناوچەی (سنح)!![1]

(عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ)، چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، (لەو کاتەدا هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد بەهۆی ئەو تایەی تووشی هاتبوو).

(عبداللەی کوڕی مەسعود)وتویەتی: (چوومە خزمەتی پێغەمبەرﷺ لە کاتێکدا ئازاری زۆری هەبوو، دەستم لێدا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ تا و ئازارێکی یەکجار قورست هەیە!

فەرمووی: بەڵێ، من هێندەی دووکەس لەئێوە ئازار و تا دەگرم!

وتم: بەڕاستی تۆ دوو پاداشتت بۆ هەیە؟

فەرموی: بەڵێ! سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، هیچ موسڵمانێك لە زەویدا نیە کە توشی ئازارێك ببێ لە نەخۆشی یا شتێکی دی، مەگەر خوا تاوانەکانی لەسەر دەسڕێتەوە، هەروەك چۆن گەڵا لە دار دەوەرێ!!)

عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە ئێش و ئازارەکەی ئەوەندەی ئازاری پێغەمبەری خواﷺ سەخت بووبێ..

ئوسامەی کوڕی زەید سەردانی پێغەمبەر دەکا

ئوسامەی کوڕی زەیدﷺ، لەناوچەی (جرف)دا سوپاکەی مۆڵ دابوو، کاتێ کە توندبونی نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوایﷺ بیست، لە بەیانی ڕۆژی دووشەممەدا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا.

ئوسامە گوتی: (کاتێ پێغەمبەری خواﷺ باری گران بوو، دابەزیم بەرەو مەدینە و، خەڵکیش لەگەڵما دابەزین بۆ مەدینە، چومە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ، لەوکاتەدا کپ و بێدەنگ ببو بەهۆی توندی نەخۆشیەکەیەوە قسەی نەدەکرد، پێغەمبەری خوا دەستی کرد بە دەست بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان، پاشان لە سەر دەم و چاوی دای دەنا، منیش زانیم ئەوە بۆ من دەپاڕێتەوە!)[2]

عائیشە دوا چرکەساتەکانی ژیانی پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە

عائیشە خوای لێ ڕازی بێت، دواچرکە ساتەکانی ژیانی پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ئەویش چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممەی، دوانزەی (ربیع

---

١ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٣٣-٢٣٥.

٢ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٣٧.

**الاول) بوو.**

**عائیشە وتی: (کاتێ پێغەمبەری خواﷺ نەخۆش کەوت جلێکی چوارگۆشەی ڕەشی دەدایە بان ڕوویا، کاتێ کە بێتاقەت دەبوو لەبان ڕووی لایدەدا. ئا لەو حاڵەتەدا دەیفەرموو: نەفرینی خوا لە گاور و جولەکەکان بێ، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکرد بە مزگەوت).**

پێغەمبەر دەموچاوی بەئاو تەڕدەکات

**وتی: (پێغەمبەری خوامﷺ بینی لە سەرەمەرگا بوو، پەرداخێك ئاوی لەلا بوو، دەستی دەخستە نێو پەرداخەکەوە، پاشان دەموچاوی پێ تەڕ دەکرد، پاشان دەیفەرموو: (لا الە الاّ الله، بەڕاستی مردن ئێش و ئازاری زۆری هەیە.. پەروەردگارا! هاوکار و یارمەتیدەرم بە لە ئێش و ئازارەکانی مردندا!)).**

پێغەمبەر دواڕۆژ هەڵدەبژێرێت

**عائیشە وتی: (ئێمە وامان پێ وترابوو کە پێغەمبەرﷺ نامرێ تا سەرپشك نەکرێ لەنێوان دونیا و دواڕۆژدا، جا کاتێ پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا بوو دەنگێکی گڕ بوو، گوێم لێبوو دەیفەرموو: ﴿مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا: لەگەڵ ئەوانەی خودا چاکەی دەگەڵ کردوون" لە ڕیزەی پێغەمبەران و خوداپەرستانی ڕاستی و شەهیدان و پیاوچاکەکان، چ هاوڕێیانێکی چاکیشن ئەمانە!﴾، جا زانیمان وا سەرپشك دەکرێ!)**

دوا وتەیەکی پێغەمبەر

**هەروەها دەڵێ: پێغەمبەری خوامﷺ نا بە سینگمەوە، پێش ئەوەی بمرێ گوێم بۆ شل کردبوو، گوێبیستی بووم دەیفەرموو: ((خوایە لێم خۆشبە، بەزەییت پێمدا بێتەوە و بمگەیەنە لای خۆت-الرفیق الاعلی-))!**

**هەروەها وتویەتی: بەڕاستی لە بەخششەکانی خوا بەسەرمەوە ئەوەیە پێغەمبەری خواﷺ لە نۆرەڕۆژ و ماڵی منا و لەنێوان سینگ و قوڕگما وەفاتی کرد و، خوای گەورە لەسەرەمەرگا لیکمانی تێکەڵ کرد!**

پێغەمبەر سیواك بەکار دەهێنێت

**(عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکر)ی برام هاتە ژوورەوە و سیواکێکی تەڕی پێبوو، منیش پێغەمبەری خوامﷺ پاڵ دابووە سنگمەوە! بینیم پێغەمبەری خواﷺ بۆ سیواکەکەی دەڕوانی، زانیم حەزی لە سیواکەو خوی پێوە**

گرتووە.

پێم وت: بۆتی وەرگرم؟

بەسەر ئاماژەی کرد: بەڵێ.

منیش سیواکەکەم لە (عبدالرحمن) وەرگرت و نەرمم کردەوەو پاشان پێمدا.. جا بە دەمیدا هێنا و بەشێوەیەکی زۆر جوان سیواکی پێکرد، پاشان هەوڵی دا پێمی بدا، بەڵام نەیتوانی و لە دەستی کەوتە خوارەوە.. خوای گەورە لە دواڕۆژی دونیا و یەکەم ڕۆژی ئاخیرەتدا لیکمانی پێکەوە تێکەڵ کرد!!

دەرچوونی ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەر لە لاشەی پیرۆزی

وە گوتویەتی: لەبەر دەستی پێغەمبەری خواداﷺ مەشکۆڵەیەك هەبوو کە ئاوی تێدا بوو، دەستی دەکرد بە ئاوەکەدا و دەم وچاوی پێ دەسڕی، پاشان دەیفەرموو: لا الە الا الله، بەڕاستی مردن ئێش و ئازاری هەیە.. پاشان پەنجەی چەپی ڕاست دەکردەوەو دەیفەرموو: في الرفيق الاعلى، في الرفيق الاعلى.

پاشان پێغەمبەری خواﷺ ڕۆحی کێشرا و دەستی لەناو ئاوەکە لار بویەوە.

کاتێ کە ملی لار بویەوە، من بۆیم دەڕوانی، زانیم کە پێغەمبەر تەواو بووە.

کە نەفسی دەرچوو، هیچ کات بۆنی وا خۆشم نەکردووە.

بۆنی میسك لەماڵەکە دێت

(ئوم سەلەمە) خوای لێ ڕازی بێت، گوتویەتی: (ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، دەستم خستە سەر سینگی، چەند جومعەیەك پاش ئەوە بەسەرمدا تێپەڕی، شتم دەخوارد و دەستنوێژم دەگرت، کەچی بۆنی میسکەکەم لەدەست نەدەڕۆیشت!!)[1]

کۆچی دوایی پێغەمبەر لە چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی - ربیع الاول - دا بوو

کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ لە چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول)ی ساڵی یانزەی کۆچیدا بوو!!

هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ لەنێو موسڵماناندا

---

١ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٣٧-٢٤١.

**بڵاوبویەوە، تووشی صەدمە و سەرسامی هاتن، هەیانبوو بەڕاستی نەدەزانی.!**

عومەر وتار دەدا و وەفاتی پێغەمبەر ڕەت دەکاتەوە

**(ئەبوهورەیرەﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، عومەری کوڕی خەتتاب هەستا و وتی: لە ڕاستیدا چەند پیاوێك لە دووڕوان وا هەڵدەبەستن کە پێغەمبەری خوا وەفاتی کردووە، لە ڕاستیدا نەمردووە، بەڵکو چووە بۆ لای پەروەردگاری، هەروەك چۆن موسای کوڕی عیمران چوو، کاتێك چل ڕۆژ لە گەلەکەی پەنهان بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ لایان دوای ئەوەی وترا مردووە, بەخوا پێغەمبەری خواشﷺ دەگەڕێتەوە، هەروەك موسا گەڕایەوە، دەست و پێی ئەو پیاوانە دەبڕێتەوە کە دەیانوت پێغەمبەرﷺ مردووە!**

ئەبوبەکر لە(سنح) دەگەڕێتەوە

**(سالم کوڕی عوبەیدﷺ) دوای نوێژی بەیانی ڕۆیشت بۆ (سنح) بۆ لای ئەبوبەکر، هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوایﷺ پێگەیاند.**

**ئەویش بەسواری ماینەکەی هات، تا چووە ناو مزگەوتەوە، بینی وا موسڵمانان قسە لەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا دەکەن، هەندێك باوەڕ دەکەن و، هەندێکیشیان باوەڕ ناکەن، قسەی لەگەڵ کەسیان نەکرد.**

**عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، دەڵێ: ئەبوبەکر بەسواری ماینێك لە ماڵەکەیەوە لە (سنح) هات و چووە مزگەوتەوە، قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، تا چووە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ، لە کاتێکدا ئەو بەسەرچەفێك داپۆشرابوو.**

ئەو قسەیەی ئەبوبەکر بەرامبەر بە پێغەمبەری وت

**ڕووی پێغەمبەری خوایﷺ هەڵدایەوەو پاشان کەوت بەسەریدا، ماچی کرد، پاشان گریا.. پاشان وتی: لە جێی دایك و باوکم ئەی پێغەمبەری خوا، لە ژیان و مردندا پاك و پوختی، بەخوا هیچ کات خوا دوو مردنت لەسەر کۆ ناکاتەوە، ئەو مردنەی کەوا لەسەرت نوسرابوو، ئەوا جێبەجێ بوو!!**

**(ئیبن عەباسﷺ) ، دەڵێ: ئەبوبەکر هاتە دەرەوە، لەوکاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب قسەی بۆ خەڵکی دەکرد.. ئەبوبەکر وتی: عومەر دانیشە..**

عومەریش دانەنیشت!

پاشان وتی: عومەر دانیشە.. عومەر دانەنیشت!

پاشان وتی: عومەر دانیشە.. عومەر دانەنیشت!

کاتێ بینی بێدەنگ نابێ، سەرکەوتە سەر دوانگە و ڕووی کردە خەڵکی، کاتێ خەڵکی گوێبیستی قسەکانی بون، ڕوویان تێکرد و عومەریان بەجێ هێشت.

ئەبوبەکر

کۆچی دوایی

پێغەمبەر

ڕادەگەیەنێ

ئەبوبەکر سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی:

خەڵکینە! هەرکەسێك موحەممەدی دەپەرست، بەڕاستی موحەممەد مرد، ئەوەشی خوای دەپەرست، ئەوا خوا زیندووەو نامرێ!

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ: موحەممەد پێغەمبەرێکە و چیتر نیە" لەپێش ئەویش زۆر پێغەمبەر هاتوون و چوون، ئەگەر بمرێ یان بکوژرێ، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟! هەرکەس پاشگەزبێتەوە چ زیانێك بە خودا ناگەیەنێ، خودا پاداشتی سوپاسگوزارانی دەداتەوە.﴾آل عمران/١٤٤.

تا ئەبوبەکر ئەو ئایەتەی نەخوێندەوە، سوێند بەخوا خەڵك وایان لێهاتبوو نەیاندەزانی خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوە، جا هەر هەموویان لێیان وەرگرت و دەیانخوێندەوەو بیریان دەکەوتەوە.

عومەر وتی: بەخوا کاتێ گوێبیستی ئەبوبەکر بووم ئایەتەکەی دەخوێندەوە، وەك ئەوە وابوم لەپێشدا هەر نەمبیستبێ، ئا لەو کاتەدا زانیم ئەو لەسەر هەقە و پێغەمبەری خواشﷺ وەفاتی فەرمووە، بۆیە قاچەکانم هەڵیان نەدەگرتم و کەوتم بەسەر زەویدا.[1]

عائیشە لەسەر

هەڵوێستی

ئەبوبەکر و

عومەر دەدوێ

سەبارەت بە مردنی پێغەمبەری خواﷺ، عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، لەسەر قسەی هەریەکە لە ئەبوبەکر و عومەرﷺ، دەدوێ و دەڵێ: (هەر

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٤١-٢٤٣.

وتارێ لە وتارەکانی ئەوان خودا سودمەندی کرد: عومەر خەڵکی ترساند، لەڕاستیشدا لەناو خەڵکدا دوڕوویی هەبوو، بەوە خوا گەڕاندیانیەوە، ئەبوبەکریش ڕێنمونی پیشانی خەڵکی دا و دەستنیشانی ئەو مافانەی کرد کە دەکەوێتە سەریان!!)

هەر لە هەمان ڕۆژدا و لە دوانزەی (ربیع الاول)دا لە کەپری بەنی ساعیدە بەیعەت درا ئەبوبەکری صدیق بکرێ بە خەلیفەی موسڵمانان.. جارێکی تریش ان شاء الله لە تروسکی دووەمدا دەگەڕێینەوە سەر ئەو بەیعەت دانە.

لێرەدا دێینە سەر باسی شۆردن و پاشان کفن و نوێژ لەسەرکردن و ئەسپەردەکردنی پێغەمبەری خواﷺ.

کۆچی دوایی پەیامبەر لە(٦٣)ساڵیدا بوو

عائیشە، خوای لێ‌ڕازی بێت، باسی ئەو ڕۆژە دەکا کە پێغەمبەرﷺ تێیدا کۆچی دوایی کرد و ئەو تەمەنەی لەسەر رووی زەوی گوزەری کرد.

(عروەی کوڕی زوبەیر) لە عائیشەوە، خوای لێ‌ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی دووشەممە، پاش تێپەڕ بونی دوانزە شەو لە مانگی - ربیع الاول - کۆچی دوایی کرد، لەکاتێکدا ئەو تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو).[1]

موسڵمانان لە ڕۆژی سێشەممەی سیانزەی (ربیع الاول)دا دەستیان کرد بە ئامادەکردنی پێغەمبەر بۆ بەخاك سپاردن، چونکە لە ڕۆژی دووشەممە هەستان بە هەڵبژاردن و بەیعەت دان بە ئەبوبەکر بۆ خەلیفایەتی.

چۆنێتی شۆردنی پێغەمبەر و کێ شۆردی

(عکرمە) لە (ئیبن عەباس‌ رضي الله عنهما)ەوە، دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (کەس و کاری پێغەمبەر کۆبونەوە بۆ شۆردنی کە بریتی بون لە (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)ی مامی و (عەلی کوڕی ئەبوطالب)و (فەضلی کوڕی عەباس)و (قوثەمی کوڕی عەباس)و (ئوسامەی کوڕی زەید).. خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

(عبداللەی کوڕی زوبەیر) لە عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٥: ٢٥٤-٢٥٥.

**کە گوتویەتی: کاتێ ویستیان پێغەمبەرﷺ بشۆن، وتیان: ئایا جلەکان لە پێغەمبەری خوا داماڵێنین هەروەك لە مردووەکانمان دادەماڵێنین، یا هەر بە جلەکانیەوە بیشۆین؟ کاتێ کە جیاوازبون، خوا خەواندنی و هیچ کەسێ نەما چەناگەی بە سینگیەوە نەبێ.. پاشان قسەکەرێك لەلایەکی کەعبەوە کە نەیاندەزانی کێیە، پێی وتن: پێغەمبەرﷺ بە جلەکانیەوە بشۆن!!**

**ئەوانیش هەستان و دەستیان کرد بە شۆرینی پێغەمبەری خواﷺ کە کراسەکەی لەبەردابوو، ئاوەکەیان دەکرد بە سەر کراسەکەیدا و بە کراسەکەیەوە دەستیان بە لەشیدا دەهێنا!![1]**

چۆنێتی کفنکردنی پێغەمبەر

**جا کە شۆردیان، کفنیان کرد.**

**(عروەی کوڕی زوبەیر) لە عائیشەوە، خوای لێ‌ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لە سێ جلی سپی یەمەنی کە لە لۆکە دروست کرابوو کفن کرا، کە کراس و مێزەری لەگەڵ نەبوو..[2]**

نوێژکردن لەسەر پێغەمبەر، بە تاك تاك نەك بە کۆمەڵ

**پاش ئەوە نوێژیان لەسەر پێغەمبەر کرد، نوێژکردنەکەیان بە کۆمەڵ بوو بەڵام لەگەڵ ئیمامدا نەبوو، بەڵکو بە تاك تاك و پۆل پۆل نوێژیان لەسەری دەکرد.**

**کاتێك لە ماڵی عائیشەدا لەسەر تەختەبەندێك دانرابوو لەڕۆژی سێیەممەی یانزەی (ربیع الاول)، پیاوو و ژن و منداڵ و بەندە نوێژیان لەسەر دەکرد.**

**(عیکرمە) لە (ئیبن عەباسﷺ)ەوە دەگێڕێتەوە، گوتویەتی: (کاتێ پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، پاش ئەوەی پیاوان بەبێ ئیمام نوێژیان لەسەر کرد، دوای لێبونەوەیان ئافرەتانیش نوێژیان لەسەر کرد، پاشان منداڵان نوێژیان کرد و دوای ئەوانیش بەندەکان هاتن و نوێژیان لەسەر کرد.)**

هۆی بەتاك نوێژکردنیان

**نوێژەکانیان یەك یەك و بەدوای یەکدا بوو، لە نوێژکردنیان لەسەر**

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٦٠.

٢ـ البداية والنهاية ٥: ٢٦٢-٢٦٣.

پێغەمبەرﷺ کەس ئیمامەتی بۆنەدەکردن.

هۆکاری بەکۆمەڵ نوێژنەکردنەکەیان نەبونی ئیمام نەبوو، چونکە بەیعەت دان بە ئەبوبەکری صدیقؓ بۆ خەلیفەیەتی لە ڕۆژی دووشەممەدا کۆتایی پێ‌هاتبوو!!

لەوانەیە هۆی نوێژنەکردنیان بە کۆمەڵ لەسەر پێغەمبەر-وەك هەندێ لە زانایان دەڵێن-ئەوەبێ کە ڕاستەوخۆ هەریەکە لە خەڵکی نوێژی لەسەر بکا و بەبێ ئیمامیش، بۆ ئەوەی نوێژکردنەکە جارلەدوای جار دووبارە لەسەری بێتەوە، ئەوەبوو هەموو پیاو و ئافرەت و منداڵ و بەندە و ئافرەتێکی کۆیلەی موسڵمان لە مەدینە نوێژیان لەسەر کرد.

ئەمە شێوازێکی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوەﷺ، بەڵام مردووی موسڵمانان نوێژی جەنازەیان بە کۆمەڵ لەسەر دەکرێ.

لە ڕۆژی سێشەممە و شەوی چوارشەممەدا نوێژکردن بەتاك تاك لەلایەن موسڵمانانەوە بەردەوام بوو.[1]

لە شەوی چوارشەممەی (ربیع الاول)دا موسڵمانان ویستیان پێغەمبەری خواﷺ بە خاك بسپێرن.

پێغەمبەر لەشوێنی گیانکێشانیدا لەشەوی چوارشەممەدا نێژرا

نەیان دەزانی لەکوێدا ئەسپاردەی کەن، ئایا لەو شوێنەی گیانی کێشرابوو، کە ماڵی عائیشە بوو، یا لە قەبرستانی(بقیع) لەنێوان مردووی موسڵماناندا؟

(عروە) لە (عائیشە)ەوە، خوای لێ ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (ئەبوبەکری صدیقؓ وتی: گوێبیستی پێغەمبەری خواﷺ بووم دەیفەرموو: هەر پێغەمبەرێك لەکوێ گیانی کێشرابێت، لەو شوێنە نێژراوە).

خەوبینینی عائیشە سەبارەت بە سێ مانگەکە

ئەمەش مانای وایە پێغەمبەری خواﷺ لە ماڵی عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، بنێژرێ.

عائیشە، خوای لێ ڕازی بێت، خەوێکی بینیبوو لەلای باوکی

---

١ ـ البداية والنهاية ٥: ٢٦٤-٢٦٥.

**گێڕابویەوە، لەناو هاوەڵاندا ئەبوبەکرﷺ، لە هەموویان زیاتر خەونی لێك دەدایەوە، پێی وتبوو: سێ مانگم بینی کەوتنە ژورەکەمەوە.**

**ئەویش پێی وتبوو: ئەگەر خەوەکەت ڕاست دەرچێ، لە ماڵەکەتدا سێ کەس لە باشترین خەڵکی سەر زەمین دەشاردرێنەوە!**

**کاتێ پێغەمبەری خواﷺ گیانی کێشرا ئەبوبەکر پێی وت: عائیشە! ئەمە یەکێکە لە چاکترینی ئەو مانگانەی کە لە خەوەکەدا بینیت.**

**هەروەك دەزانین هەر یەك لە پێغەمبەری خواﷺ و پاشان ئەبوبەکر و پاشان عومەر لە ماڵی عائیشەدا بەخاك سپێردراون.**

**ئەو تەختەبەندەی پێغەمبەری خواﷺ ڕۆحی لەسەری کێشرابوو، هاوەڵان خستیانە لاوە، پاشان گۆڕەکەیان لە جێی تەختەبەندەکەدا هەڵکەند..**

**(قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) لە (عائیشە)، خوای لێ‌ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی دووشەممەدا کۆچی دوایی کرد و لەشەوی چوارشەممەدا نێژرا).[1]**

ئەوانەی چوونە ناو گۆڕی پێغەمبەرەوە

**پاش ئەوەی گۆڕەکە هەڵکەندرا و تەواو بوو، هەر یەکە لە (عەباس)و(فەضلی کوڕی عەباس)و(عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ، چوونە گۆڕەکەوە..**

**ژوورەکەی عائیشە دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی پێغەمبەرەوە، گۆڕەکەی پێغەمبەری خواشﷺ دەکەوتە سوچی ڕۆژئاوای خوارووی ژوورەکە.**

لەدواییدا گۆڕەکە کەوتە ناو مزگەوتەوە

**ژوورەکەی عائیشە هەروا لە ڕۆژهەڵاتەوەو لە دەرەوەی مزگەوت مایەوە تا خەلافەتی (وەلیدی کوڕی عبدالملك). بەڵام کاتێ (وەلیدی کوڕی عبدالملك) بوویە خەلیفە، فەرمانی کرد بە والیەکەی لەسەر مەدینە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) کە مزگەوتی مەدینە فراوان بکا.. (عومەری کوڕی عبدالعزیز)یش هەستا بە فراوانکردنی مزگەوتەکە لە رووی**

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٦٦-٢٦٩.

ڕۆژهەڵاتەوە، بەم شێوەیە ژوری پێغەمبەرﷺ کەوتە ناو مزگەوتەکەوە!

بەم شێوەیە گۆڕی پێغەمبەرﷺ و هەروەها دووهاوەڵەکەی ئەبوبەکر و عومەرؓ کەوتنە ناو مزگەوتی پێغەمبەرەوەﷺ.[١]

کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ زۆر کاری لە هاوەڵان کرد و یەکجار زۆر بۆی خەمبار بون و بەکوڵ بۆی گریان.

گێڕانەوەی ئەنەس لەسەر کاریگەری و خەمی موسڵمانان

(ئەنەسی کوڕی مالیک)ؓ گوتویەتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ مەدینە، هەموو شتێك روناك بۆوە، کاتێکیش ئەو ڕۆژە هات کە تیایدا مرد، هەموو شتێك تاریك بوو.. هێشتا دەستمان لە پێغەمبەری خواﷺ بەرنەدابوو دڵەکانمان گۆڕانی بەسەردا هات.

ئەوەی لەهەموو کەس زیاتر خەمبار بوو –کە خەم هەموو موسڵمانانی داگرتبوو– فاتیمەی کچی بوو،خوای لێ‌ڕازی بێت.

فاتیمە قسە لەگەڵ باوکی دەکات و پاش ناشتنیشی قسە دەکات

(ثابیت البنانی) لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: کاتێ پێغەمبەرﷺ لەشی قورس بوو، نەخۆشی و میحنەت دایپۆشی، (فاتیمە) وتی: ئەی هاوار بۆ باوکم، ئەویش پێی فەرموو: لەمڕۆ زیاتر هاوار بۆ باوکت نیە.

جا کاتێ پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، فاتیمە، خوای لێ‌ڕازی بێت، وتی: وای باوکە، خوا نزاکەتی وەرگرت، وای باوکە بەهەشتی فیردەوس جێگاتە، وای باوکە سەرەخۆشی لە جبریل دەکەین.

جا کە پێغەمبەرﷺ بەخاك سپاردرا، فاتیمە، خوای لێ ڕازی بێت، وتی: ئەنەس! چۆن دڵتان ڕێی دا خۆڵ بکەن بەسەر ڕووی پێغەمبەری خوادا‌ﷺ؟!!

ئوم ئەیمەن بەهۆی پچڕانی وەحی دەگری و ئەوانەی دەوروپشتیشی دەگریێنێ

(حەمادی کوڕی زەید) گێڕەرەوەی ئەم فەرمودەیە لە (ثابیت البنانی)یەوە دەڵێ: هەرکاتێ (ثابیت) ئەم فەرمودەیەی فاتیمەی دەگێڕایەوە، دەگریا تا پەراسوەکانی لێك جیادەبویەوە.

(ئوم ئەیمەن) دایەنی پێغەمبەری خواﷺ بوو، زۆر خەفەتبار بوو بەهۆی پچڕانی وەحی لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خواﷺ.

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٧٢-٢٧٣.

**(ثـابیـت البنـانی) لـە (ئەنەسـی کـوڕی مالیـكﷺ)ەوە دەگێڕێتـەوە کـە گوتویـەتی: جارێـك پێغەمبـەری خـواﷺ بـە سـەردانی چـوو بـۆ لای (ئـوم ئەیمەن)، منیش لەگەڵی بووم، خواردنەوەیەکی دایە پێغەمبەری خوا، بەڵام نەیخوارد، جا چ لەبەر ئەوەی بەڕۆژوو بوو، یا لەبەر ئەوەی حەزی لێی نەبوو، (ئوم ئەیمەن) قسەی پێکەنیناوی بۆ پێغەمبەری خواﷺ دەکرد.**

**جا کاتێ پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، ئەبوبەکر بە عومەری گوتﷺ: با بچین سەردانێکی (ئوم ئەیمەن) بکەین!!**

**کاتێ ڕۆیشتن ئەو گریا، پێیان وت: بۆچی دەگری؟ ئەدی نازانی ئەوەی لای خوایە بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ باشترە؟!**

**ئـەویش پێـی وتـن: بـەخوا بەڕاسـتی دەزانم ئـەوەی لای خـوا بـۆ پێغەمبەرەکەیﷺ باشترە، لەبەر ئەوەش ناگریم، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە سروش(وەحی) لە ئاسمان پچڕاوە!!**

**ئەمەش دڵیانی پڕ لە قوڵپەی گریان کرد و دەستیان کرد بە گریان.[1]**

حەسانی کوڕی ثابیت پێغەمبەر دەلاوێنێتەوە

**(حەسانی کوڕی ثابیت) شاعیری پێغەمبەری خوا، یەکێك بوو لەوانەی زۆر خەفەتبار بوو بە کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ، ئەم خەفەتباریەش لە چەند قەسیدەیەکی شیعری بەرزدا تۆمارکردوە، پێغەمبەری خوایﷺ پێ دەلاوێنێتەوە:**

**لەوەی لەو لاواندەوەیەدا هاتووە:**

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٧٣-٢٧٥.

بطيبـــة رســـم للرســـول ومعهـــد — منير قـــد تعفـــو الرســـوم وتهمـــد
ولا تمتحي الآيات مـــن دار حرمـــة — بها منبر الهادي الذي كـــان يـــصعد
وواضـــح آثـــار وبـــاقي معـــالم — وربع لـــه فيـــه مـــصلى ومـــسجد
بها حجرات كـــان يـــترل وســـطها — مـــن الله نـــور يستـــضاء ويوقـــد
معارف لم تطمس على العهـــد آيهـــا — أتاها الـــبلا فـــالآي منـــها تجـــدد
فبوركت يا قبر الرسول وبوركـــت — بلاد ثوى فيهـــا الرشـــيد المـــسدد
وبورك لحـــد منـــك ضـــمن طيبـــا — عليه بنـــاء مـــن صـــفيح منـــضد
تهيل عليـــه التـــرب أيـــد وأعـــين — عليه، وقد غـــارت بـــذلك أســـعد
لقد غيبوا حلمـــا وعلمـــا ورحمـــة — عـــشية علّـــوه الثـــرى لا يوســـد
وراحوا بحزن لـــيس فـــيهم نبـــيهم — وقد وهنت منهم ظهـــور وأعـــضد
يبكون من تبكي الـــسماوات يومـــه — ومن قد بكته الأرض فالناس أكمـــد
وهل عدلت يومـــا رزيـــة هالـــك — رزيـــة يـــومٍ مـــات فيـــه محمـــد؟
فبكـــي رســـول الله بـــأعين عـــبرة — ولا أعرفنك الدهر دمعـــك يجمـــد
ومالكِ لا تبكين ذا النعمـــة الـــذي — على النـــاس منـــها ســـابغ يتغمـــد
فجودي عليـــه بالـــدموع وأعـــولي — لفقد الذي لا مثله الـــدهر يوجـــد
وما فقـــد الماضـــون مثـــل محمـــد — ولا مثلـــه حـــتى القيامـــة يفقـــد

**وصلى الله على سيدنا محمد النبي الأمي، وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً كثيراً، عدد ما أحاط به علمه، وخطٌ به قلمه، وأحصاه كتابه!![1]**

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٨٠-٢٨١.

**لە بابەتی نەخۆشی و سەرەمەرگ و وەفات و سپاردن و لاواندنەوەی پێغەمبەری خواداﷺ، پشتمان بە سەرچاوە مێژووییە دروستەکان بەستووە. زۆر پشت ئەستور بووین بە کتێبی** (البداية والنهاية)**ی پێشەوای مێژوونووسی فەرمودەناس** (ابن كثير)**، سەیری** (البداية والنهاية ٥: ٢٢٣-٢٨٢) **بکە.**
**هەروەها گەڕاوینەتەوە بۆ** (السيرة النبوية)**ی ئیبن هیشام و** (تأريخ الطبري)**و**(تأريخ ابن أثير)**و**(دلائل النبوة)**ی بەیهەقی.**

# ترۆسکی دووەم

## ئەبوبەکری صدیق لەنێوان جێنشین بون و مردندا

هەڵبژاردنی خەلیفە پاش چەند سەعاتێك لە کۆچی دوایی پێغەمبەر

زانیمان پێغەمبەری خوا ﷺ لە چێشتەنگاوی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول)ی ساڵی یانزەی کۆچی لە ماڵی (عائیشه)، خوای لێ ڕازی بێت، کۆچی دوایی کرد، پاش چەند سەعاتێك لە کۆچی دوایی بە خێرایی موسڵمانان بیریان لە هەڵبژاردن و بەیعەتدان بە خەلیفەیەك کردەوە.

خۆری ڕۆژی دووشەممەی ناوبراو ئاوا نەبووبوو، موسڵمانان ئەبوبەکری صدیقیان هەڵبژارد بە خەلیفەی خۆیان، دوای ئەوە دەستیان کرد بە شۆرین و کفن و نوێژ لەسەرکردن و ئەسپەردەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەمە بەلگەیە لەسەر گرنگی جێنشینێتی

ئەم هەنگاوە سەرکەوتووە هەنگاوێکی گەورەو پێشەنگی هاوەڵان بوو، کەوا هەڵبژاردنی خەلیفەی فەرمانڕەوایان پێشخست بەسەر ئەسپەردەکردنی خۆشەویستترین کەس لە دڵیاندا کە (محمد ﷺ)ە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ یاسای فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا و، گرنگی بونی فەرمانڕەوایەکی پێشەوایە کە خەلیفەیە، کە کاروباری موسڵمانان بەڕێوە دەبا و حوکم بە فەرمانەکانی خوا دەکات.

دروستیش نیە پایەی ئیمامەت و خەلافەت لە خەلیفە چۆڵ بێ، هەرچەندە بۆ چەند سەعات یا چەند ڕۆژێکیش بێ، پێویستیشە هەڵبژاردن و بەیعەت دان بە خەلیفە پێش هەموو کاروبارێکی تر بکەوێ، هەروەك چۆن هاوەڵانی بەڕێز رضي الله عنهم جێبەجێیان کرد.

ئیبن عەوف وتەکەی عومەر

(عومەری کوڕی خەتتاب)و(عبدالرحمن‌ی کوڕی عەوف) رضي الله عنهما، فەرموودەی (کەپری بەنی ساعده)وچۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەبوبەکری صدیق بۆ خەلیفەیەتی و بەیعەت پێدانی یەکەمیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

بۆ ئیبن عەباس بۆدەگێڕێتەوە

(عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود) لە (عبداللەی کوڕی عەباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە (ئیبن عەباس) لە حەج بوو، دوا حەجێك

کە عومەر لە خەلافەتەکەیدا بەجێی هێنابێ، (ئیبن عەباس) لەگەڵ (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)دا لە وەرزی حەجدا لە (مینا) بون، قورئانی بە (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) دەخوێندەوەو بۆی هەڵدەسەنگاند و گوێی لێ دەگرت.

جارێکیان (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) گەڕایەوە بۆ لای جێگەکەی خۆی لە مینا، (ئیبن عەباس)یش چاوەڕێی دەکرد بۆ ئەوەی گوێبیستی قورئانەکەی بێت.

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) بە (ئیبن عەباس)ی وت: پیاوێك هات بۆ لای (عومەری کوڕی خەتتاب) ئەو کاتەی لە مینا بووە، پێی وتوە: ئەی ئەمیری بڕواداران، فلان کەس دەڵێ: ئەگەر عومەری کوڕی خەتتاب بمرێ، پاش ئەو بەیعەت بە فلان دەدەم بۆ خەلیفەیەتی!!

عومەریش توڕە بوو، وتی: هەر ئەمشەو لە مینادا وتار بۆموسڵمانان دەدەم، ئاگاداریان دەکەمەوە لەو خەڵکانەی دەیانەوێ کاروبارەکەیان داگیر بکەن! بە دیاریکردنی ئەو کەسەی دەیانەوێ بیکەن بە خەلیفە، بەبێ ڕاوێژ و بەیعەتی موسڵمانان!!

ئیبن عەوف ئامۆژگاری عومەر دەکات کە لە مینا وتار نەدات

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) پێی وت: ئەمیری بڕواداران! ئەوە نەکەی، لەسەر ئەوەش ئەمشەو وتار بۆ خەڵکی نەدەی! چونکە وەرزی حەج هەموو ڕەشۆکی و هەرچی و پەرچیەکی تێدا کۆدەبێتەوە. جا کاتێ دەتەوێ وتار بدەی، ئەوانن لە پێشەوەی کۆڕەکەتدا ئامادە دەبن، دەترسم قسەیەك بکەی حاڵی نەبن و لێی تێ نەگەن و لە شوێنی دروستی خۆیدا داینەنێن، بەڵکو بە هەڵە لێی تێبگەن و لەنێو خەڵکیدا بڵاوەی پێ بکەن و بیدەنە پاڵ تۆش!!

بەڵام چاوەڕێ کە تا دەچیتەوە مەدینە، کە خانە و جێگەی کۆچ و سوننەتە، لەوێ لەگەڵ زانا و خانەدانی موسڵماناندا کۆدەبیتەوەو چیت دەوێ پێیان بڵێ، ئەوانیش لە وتەکانت حاڵی دەبن و لەشوێنی خۆیدا دایدەنێن و لە قسەکانت تێدەگەن!

**(عومـەر) پێـی وت: إنـشاءالله ئەگـەر بـە سـاغ و سـەلامەتی گەڕامـەوە مەدینـە، لـە یەکـەم جێگـەدا کـە لێـی رادەوەسـتم و لـە یەکـەم وتارێـکدا کـە دەیدەم ئەوەیان پێ رادەگەیەنم.**

نیبن عەوف وتارەکەی عومەر لە مەدینە دەگێڕێتەوە

**(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) گوتی: کاتێ کە وەرزی حەج کۆتایی هات و چوینە مەدینە و یەکەم جومعەی پاش گەڕانەوەمان هات، هەر زوو چووم بۆ مزگەوت.**

**کاتـێ کـە چـوومە مزگـەوتی پێغەمبـەرەوەﷺ، دیـتم (سـەعیدی کـوڕی زەیـد) پێشم کەوتووەو لـە سوچێکی لای ڕاسـتی دوانگەکەوە دانیـشتووە. منیش لە تەنیشتیەوە لە نزیکیدا دانیشتم، بەشێوەیەك هەردوو ئەژنۆم بە ئەژنۆکانی نووسابوو.**

**کاتـێ ئێمـە دانیـشتبوین، (عومـەری کـوڕی خـەتتابرضي الله عنه) هاتـە ژوورەوە، لەوکاتـەدا بـە (سـەعیدی کـوڕی زەیـد)م وت: هـەر ئێـستە (عومـەر) لەسـەر دوانگە و وتاری جومعەکەیدا قسەیەك دەکا کە پێشتر نەیوتوەو کەسیش جگە لەو نەیوتوە.**

**(سـەعیدی کـوڕی زەیـد) نکـوڵی لـە قـسەکەم کـرد و وتـی: لەوانـە نیـە قسەیەك بکا کە پێشتر کەس نەیوتبێ.**

**پێم وت: دەیبینی..!**

عومەر لە وتارەیدا چی وت

**(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) وتی: (عومەر) لەسەر دوانگەکە دانیشت، کاتێـك کـە بانگـدەر لـە بـانگ بویـەوە، هەسـتایە سـەرپێ و سـوپاس و ستایشێکی شایەن بە خوای کرد و پاشان وتی:**

**(خەڵکینە! ئێستە چەند وتەیەکتان پێ دەڵێم، قەدەری خوا وایە کە پێتان بڵێم، ناشزانم، لەوانەیە لە نزیکی مردندا بم، هەرکەسـێ لـە قسەکان حاڵی بێ و عەقڵی بیگرێ و تێی بگا، با تا بەکوێ دەگا و دەڕوا بیگەیەنێت و لـەنێو خەڵکیدا بڵاوی بکاتـەوە. هـەر کەسـەش لێـی حاڵی نابێ و عـەقڵی نـایگرێ و تێـی ناگـا، بـا باسـی نـەکا.. رازی نـیم و دروسـت نیـە درۆم بەدەمەوە بکا!!**

ئاماژە بە حوکمی ڕەجمی ژن و پیاوی زیناکار دەکات

خوای بەرز و بالا (موحەممەد)یﷺ بە هەق و ڕەواوە ناردووە، کتێبی دابەزاندووە، لەوەی کە دایبەزاندبوو ئایەتی ڕەجم بوو، خوێندومانەتەوەو لێشی حالی بووین، پێغەمبەری خواﷺ ڕەجمی کردوە و پاش ئەو ئێمەش ئەنجاممان دا، دەترسم ڕۆژگاری زۆر بەسەر خەڵکیدا تێپەڕێ، کەسی وا هەبێ بڵێ: ئایەتی ڕەجم کردن لە قورئاندا نابینین.

لێرەوە بەهۆی وازهێنان لە فەرزێك کە خوا دایبەزاندووە گومڕا ببن، ڕەجم کردن لە کتێبی خوادا بۆ هەرکەسێ خێزاندار بێ لە پیاو و ئافرەت هەق و ڕەوایە، ئەگەر بەڵگە یان سکپڕی یان دان پیانان هەبێ!

ئاگادار بن کەوا ئێمە دەمانخوێند: باووباپیرانتان پشتگوێ مەخەن، ئەگەر پشتگوێیان خەن ئەوا سپڵەییتان کردووە.

عومەر بەبێ ڕاوێژ و هەڵبژاردن ڕەفزی خەلافەت دەکات

ئاگاداربن، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((پیاما هەڵمەدەن، هەروەك گاورەکان بە عیسای کوڕی مەریەمداu، هەڵیان دەدا، چونکە من بەندەی خوام، بڵێن بەندە و پێغەمبەری خوایەﷺ!))

ئەوەشم پێگەیشتووە کە یەکێك لە ئێوە وتویەتی ئەگەر عومەر بمرێ، بەیعەت بە فلان ددەم!

هیچ یەکێ لە ئێوە فریو نەخوا بەوەی بڵێ: لە ڕاستیدا بەیعەتی ئەبوبەکر لەناکاو و کتوپڕ بوو!

بەخەلیفەبونی صدیق پێوەر نیە

بەئاگابن ئەوە بەو شێوەیە بوو، بەڵام خوا لە زیانەکانی پاراستینی، ئەمڕۆ لەنێو ئێوەدا هیچ کەسێ نیە بە وێنەی ئەبوبەکر، گوێڕایەڵی بکرێ و بۆی بڕوانرێت!

لەو دەنگ و باسانەی لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ هەمان بوو، (عەلی)و(زوبەیر رضي الله عنه) لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیان بون لە ماڵی (فاتیمە)ی کچی پێغەمبەری خواﷺ بەجێمان، هەموو پشتیوانانیش لە کەپری بەنی ساعیدە بون و لەگەڵمان نەبون. کۆچەرانیش لە دەوری ئەبوبەکر کۆببونەوە، بە ئەبوبەکرم وت: ئەبوبەکرا با بچین بۆ لای برا

**پشتیوانەکانمان!**

عومەر لەگەڵ ئەبوبەکر دەچن بۆ کەپری بەنی ساعیدە

**چوین بۆ لایان لە کەپری بەنی ساعیدە، لەڕێگادا بە دوو پیاوچاك گەیشتین کە (عوەیمی کوڕی ساعیدە)و (مەعەنی کوڕی عەدی) بون، پێیان وتین ئەی کۆمەڵی کۆچەرییان، دەتانەوێ بۆ کوێ بچن؟!**

**وتم: دەمانەوێ بچین بۆ لای برایانی پشتیوانمان.**

**پێیان وتین: هەقتان نەبێ و لێیان نزیك مەکەونەوە، کاری خۆتان جێبەجێ بکەن!**

**وتم: بەخوا هەر دەبی بچینە لایان!**

پشتیوانان لە کەپرەکە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەیەك لەخۆیان کۆبونەتەوە

**چووین بۆ لایان لە کەپری بەنی ساعیدە، بینیمان وا کۆبونەتەوەو لە نێوانیاندا پیاوێکی داپۆشراو هەیە خۆی بە جلەکانی داپۆشیوە.**

**وتم: ئەوە کێیە؟**

**وتیان: (سەعدی کوڕی عوبادە)یە.**

**وتم: چیەتی؟**

**وتیان: ئازاری هەیە و نەخۆشە.**

**ئێمەش لەگەڵیان دانیشتین.**

وتەی وتاربێژی پشتیوانەکان

**کاتێ دانیشتین وتاربێژەکەیان هەستا، سوپاس و ستایشێکی شایستەی خوای کرد، پاشان وتی:**

**((لەدوای سوپاس و ستایشی خوا، ئێمە پشتیوانی خوا و بەشە هەرەزۆری سوپای ئیسلامین، ئێوەش ئەی کۆچکەران دەستەو کۆمەڵێکن لە ئێمە، کۆمەڵێك لە ئێوە هاتون و دەیانەوێ لە ریشەمان لادەن و مافمان داگیرکەن و لەم کاروبارە(خەلافەت) دەرمان بکەن!!))**

**کاتێ بێدەنگ بوو، ویستم قسە بکەم، قسەم ڕازاندبویەوە و خۆم ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی وەڵامی وتاربێژەکەیان بدەمەوەو لە بەردەمی ئەبوبەکریش ئەم قسانە بکەم.**

**من وا هەستم دەکرد هەندێ توندی تێدابێ، بەڵام ئەبوبەکر لەمن بە حیلم و بەویقارتر بوو، پێمی وت: لەسەرخۆبە! چونکە دەیویست خۆی قسە بکات،**

منیش پێم ناخۆش بوو تووڕەی بكەم، چونكە لەمن شارەزا و بەسام تر بوو.

ئینجا ئەبوبەكر دەستی بە قسەكرد، سوێند بەخوا، هیچ وتەیەكی بەجێ نەهێلا، كە من پێم خۆش بێ، لەوەی خۆم بۆ ئامادە كردبوو و ڕازاندبومەوە، هەر هەمووی بە ئاسانی و لەسەرەخۆیی وت، باشتر لەوەی كە من دەمویست بیلێم.

ئەبوبەكر لە وتارەكەیدا چی وت

لە وتارەكەیدا وتی: (پاش سوپاس و ستایشی خوا، ئەوەی كە باستان كرد، ئێوە شایستەی ئەوەن، بەلام عەرەب بۆ ئەم كارە تەنها دان بەم هۆزەی قورەیش دادەنێ، چونكە لەرووی نەسەب و شوێنەوە لە ناوەندی عەرەبدان، من ڕازیم یەكێ لەم دوانە هەڵبژێرن، دەستی من و (ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح)ی گرت.

لەناو قسەكانی ئەبوبەكردا تەنها ئەمەم پێ ناخۆش بوو، بەخوا ئەگەر لەگەردنم بدرایەو بە مەرجێ لە تاوان نزیكم نەكاتەوە، پێم خۆشترە لەوەی پێشەوای كۆمەڵێ بم ئەبوبەكری تێدابێ.

حەبابی كوڕی مونذر وەلامی ئەبوبەكر دەداتەوە

كاتێ ئەبوبەكر ئەمەی وت، یەكێك لە پشتیوانان كە (حەبابی كوڕی مونذر) بوو وتی: (أنا جذيلُها المحكك، وعذيقها المرجَّب) وەك ئەوەی بڵێ: من شارەزا و لێزانم و پێویستە ڕام وەربگیرێ و بەقسەم بكرێ.

وتی: ئەی قورەیشیەكان، با لە ئێمە ئەمیرێك و لەئێوەش ئەمیرێك هەبێت.

كاتێك (حەبابی كوڕی مونذر) ئەمەی وت، غەڵبەغەڵب زۆر بوو، دەنگەدەنگ بەرزبوویەوە تاوەكو ترسی ناكۆكیم لێ نیشت، بە ئەبوبەكرم وت: ئەبوبەكرا دەستت درێژ كە.. ئەبوبەكر دەستی هێنا۔ عومەریش بەیعەتی پێدا، پاشان كۆچكەران بەیعەتیان پێدا، پاشانیش پشتیوانان بەیعەتیان پێدا.

عومەر لە وتارەكەدا ئەوەش زیاد دەكا و دەڵێ: بەخوا لە هیچ كارێكدا ئامادە نەبون، لە بەیعەتدان بە ئەبوبەكرﷺ بەهێزتر بووبێ.

لە ڕاستیدا ترساین ئەگەر لەوێدا پشتیوانان جیا ببنەوەو بەیعەتەكە

ئەنجام نەدەین، ئەوا لەدوای ئێمە بەیعەتێك بەدی بێنن و بیدەن بە کەسێك لە خۆیان، جا ئەو کاتە یا دەبێ شوێنیان بکەوین و بەیعەت بدەین بە بەیعەت پێدراوەکەیان، بەمەش کارێك بکەین کە پێی رازی نین و بەرژەوەندی موسڵمانانیشی تێدا نیە، یا ئەوەتانێ پێچەوانەو نەیاریان بین، لەمەشەوە خراپەکاری رووبدا.

هەرکەسێ بەبێ راوێژی موسڵمانان بەیعەت بە ئەمیرێ بدا، ئەوا نە خۆی و نە ئەوەشی بەیعەتی پێداوە بەیعەتەکەیان پەسەند نیە.!![1]

ئەبوبەکر هۆکاری پەسەندکردنی بەیعەت پێدادەنەکەی روون دەکاتەوە

پاشتر ئەبوبەکر هۆکاری پەسەندکردنی بەیعەت پێدانەکەی روون دەکاتەوە، لەبارەی رووداوەکانی کەپری بەنی ساعیدە (رافعی طائی رضي الله عنه) پرسیاری لە ئەبوبەکر کرد، جا لەو شتانەی بە (رافع)ی وت ئەوەبوو کە وتی: (بۆیە بەیعەتدانیانم لێ وەرگرتن، لەوە ترسام ئەگەر بەیعەتەکە رەت کەمەوە فیتنە هەڵگیرسێ، پاشانیش هەڵگەڕانەوە رووبدات).[2]

دوو بەیعەت بە ئەبوبەکر درا، یەکەمیان رۆژی دووشەممە لە کەپرەکە بوو

بەیعەت پێدانی ئەبوبەکر لەلایەن کۆچەران و پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە لە ڕۆژی دووشەممەی دوانزەی (ربیع الاول) ئەنجام درا.

(عەباس) یاخود (عەلی) یا (زوبەیری کوڕی عەوام) بەهۆی سەرقاڵییان بە کاروباری ناشتنی پێغەمبەرەوە ﷺ ئامادەی ئەم بەیعەتی یەکەمە نەبون.

دوەمیانبەیعەتی تێکرای خەڵکی بوو رۆژی سێشەممە لە مزگەوت

لە ڕۆژی دواتردا، سێشەممەی سیانزەی (ربیع الاول) لەلایەن کۆچەران و پشتیوانانەوەو لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا بەیعەتی دووەمی گشتی بە ئەبوبەکر درا، ئەمەش پاش بەیعەتی یەکەمی تایبەت بوو کە لە کەپری بەنی ساعیدەدا ئەنجام درا.

لەکاتێکدا (عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه) درێژەی بەیعەتی یەکەمی بۆمان گێرایەوە، ئەوا (ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه) درێژەی بەیعەتی دووەممان بۆ دەگێڕێتەوە.

(ئەنەسی کوڕی مالیك) وتویەتی: کاتێ کە ڕۆژی سێشەممە هات،

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٤٥-٢٤٧.

٢ ـ البداية والنهاية ٥: ٢٤٧-٢٤٨.

**(عومەری کوڕی خەتتاب)ﷺ لەسەر دوانگەکە دانیشت، ئەبوبەکریش لە تەنیشت دوانگەکەی بەبێ دەنگی دانیشتبوو.**

عومەر لە مزگەوتدا وتار دەدا و داوای بەیعەتدان بە ئەبوبەکر دەکا

**کاتێ خەڵکی لە مزگەوتدا کۆبونەوە، (عومەر) هەستایە سەرپێ و وتی: بەهیوابووم پێغەمبەری خواﷺ بمابایە و دوای هەموان و لەپاش هەمووومان بمردایە، جا کە موحەممەدﷺ کۆچی کردووە، ئەوا خوای گەورە نورێکی ڕێنیشاندەری لەنێوتان جێهێشتووە، ڕێنمونی پێ وەردەگرن کە ئەویش ڕێنمونی پێغەمبەری خوایەﷺ، ئەبوبەکریش هاوەڵی پێغەمبەری خوایە و دوهەم کەسی ئەشکەوتەکەیە و، خوای گەورەش لەسەر ئەو کۆکی کردوون، بۆ هەڵسوڕانی کاروباریشتان لە هەموو موسڵمانێ لەپێشترە، دە هەستن بەیعەتی پێ بدەن!**

**پاشان عومەر بە ئەبوبەکری وتﷺ:**

**سەرکەوە سەر دوانگە، ئەبوبەکر چووە سەر دوانگەکە و لەلایەن هەموو کۆچکەران و پشتیوانانەوە بەیعەتی پێدرا.**

دەقی وتارەکەی ئەبوبەکر لەکاتی بەیعەتدانی گشتیدا

**پاشان ئەبوبەکری صدیقﷺ دەستی بە قسەکردن کرد، سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای کرد، دوای ئەوە وتی: لەدوای سوپاس و ستایشی خوا، هۆ خەڵکینە! من کراومەتە کاربەدەستتان، بێئەوەی چاکترینتان بم، جا ئەگەر چاکەم کرد ئەوا یارمەتیم بدەن، ئەگەر خراپەشم کرد ڕاستم بکەنەوە. ڕاستگۆیی سپاردەیە، درۆش ناپاکیە. بێهێزتان بەلامەوە بەهێزە هەتا بەویستی خوا مافی خۆی بۆ بگێڕمەوە، بەهێزیشتان بەلامەوە بێهێزە هەتا بەویستی خوا مافی لێ وەردەگرمەوە.**

**هەر کۆمەڵێکیش دەستبەرداری جیهاد ببێ، ئەوا خوای گەورە زەلیلیان دەکات و، هەر کۆمەڵێکیش کردەوەی خراپەیان تێدا بڵاوبوویەوە، خوای گەورە بەڵایان بەسەردا دەبارێنێ. تا من گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی دەبم گوێڕایەڵیم بۆ بکەن، خۆ ئەگەر لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی بووم،**

ئەوا گوێڕایەڵیم بەسەرتانەوە نامێنێ!!!)[١]

(ئەبوسەعیدی خودری) ﷺ بەیعەتدانەکەی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)مان بۆ دەگێڕێتەوە کە بە (ئەبوبەکری صدیق)ی داوە.

زوبەیر و عەلی لە هەمان ڕۆژدا بەیعەت بە ئەبوبەکر دەدەن

(ئەبوسەعیدی خودری) گوتویەتی: کاتێ ئەبوبەکر سەرکەوتە سەر دوانگە، سەیری دەم و چاوی خەڵکەکەی کرد، (زوبەیری کوڕی عەوام)ی نەبینی، جا داوای (زوبەیر)ی کرد و ئەویش هات، ئەبوبەکر پێی وت: ئەی کوڕی پوری پێغەمبەرﷺ و هاوەڵی دڵسۆزی! ئەوە دەتەوێ هێزی موسڵمانان پەرتەوازە کەی؟

(زوبەیر) گوتی: ئەی خەلیفەتی پێغەمبەری خواﷺ، هیچ گازاندەت لەسەر نیە..

بۆیە، زوبەیر هەستا و بەیعەتی بە ئەبوبەکر دا.

پاشان سەیرێکی تری خەڵکەکەی کرد، (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ی نەبینی، جا داوای (عەلی)ی کرد و ئەویش هات.

ئەبوبەکر پێی وت: ئەی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەری خواﷺ، ئەوە دەتەوێ هێزی موسڵمانان پەرتەوازە کەی؟

(عەلی) وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خواﷺ، گازاندەت لەسەر نیە. عەلی هەستا و بەیعەتی بە ئەبوبەکر دا!!

ریوایەتە صەحیحەکەی (ئەبوسەعیدی خودری) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عەلی و زوبەیر لە ڕۆژی دووەمی وەفاتی پێغەمبەری خوداﷺ کە ڕۆژی سێشەم بوو بەیعەتیان بە ئەبوبەکر داوە.[٢]

گرنگیدانی ئیمامی موسلیم بە فەرمودەی بەیعەتدانی عەلی بە ئەبوبەکر لەگەڵ خەڵکدا

ئەوەشی بەڵگەیە لەسەر گرنگی ئەم فەرمودە صەحیحەی (ئەبوسەعیدی خودری) ئەوەیە کە پێشەوا (موسلیم کوڕی حەجاج) خاوەنی (الجامع الصحیح) کە دروستترین کتێبی فەرمودەیە لەدوای (صحیح البخاری)- چوو بۆ لای مامۆستاکەی پێشەوا (موحەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٤٨.

٢ـ البداية والنهاية ٥: ٢٤٩.

**خوزەیمە) خاوەنی (صحیح ابن خزیمە)وپرسیاری ئەم فەرمودەیەی لێکرد، (ئیبن خزیمە)ش فەرمودەکەی بۆ نووسی و بۆی خوێندەوە.**

**جا موسلیم بە (ئیبن خزیمە)ی مامۆستای وت: ئەم فەرمودەیە وشترێك دەهێنێ!**

**(ئیبن خزیمە) وتی: نەك هەر تەنها وشترێك دەهێنێ، بەڵکو هەزار یان دوو هەزار زێڕ و زیو دەهێنێ.**

حەبیبی کوڕی ئەبوپابیت پەلەکردنی عەلی لە بەیعەتدانمان بۆ دەگێڕێتەوە

**لەوانەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (عەلی کوڕی ئەبوطالب) لە بەیعەتدانی دووەم و گشتی و لە ڕۆژی سێشەممەدا لەو کەسانە بووە بەیعەتی بە ئەبوبەکر داوە، ئەوەیە کە (حەبیبی کوڕی ئەبو ثابیت) دەیگێڕێتەوە کە دەڵێ:**

**(عەلی کوڕی ئەبوطالب) لە ماڵی خۆیدا بوو، پیاوێك هات بۆ لای، پێی وت: ئەبوبەکر بۆ بەیعەت پێدان دانیشتوە.**

**عەلی لەبەر پەلەیی بە کراسەکەیەوە بەرەو مزگەوت چوو، کراس و کەوای لەبەردا نەبوو، پێی ناخۆش بوو لە بەیعەت دوابکەوێ، پاشان بەیعەتی بە ئەبوبەکردا، ئەوجا دانیشت و ناردی بەدوای کەواکەیدا تا بۆیان هێناو لەبان کراسەکەیەوە لەبەری کرد.**

**(عەمری کوڕی حەریث) پرسیاری لە (سەعیدی کوڕی زەیدﷺ) کرد و پێی وت: ئامادەی وەفاتی پێغەمبەری خواﷺ بووی؟**

**وتی: بەڵێ.**

**پێی وت: کەی بەیعەت بە ئەبوبەکر درا؟**

**سەعید وتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، موسڵمانان پێیان ناخۆش بوو بەشێ لە ڕۆژێکیش بمێننەوە بەبێ ئەوەی لەناو کۆمەڵدا بژین!!**

سەعیدی کوڕی زەید ڕادەگەیەنێ کە هیچ هاوەڵێك لە بەیعەت دوانەکەوتوە

**وتی: ئایا هیچ کەسێ بێفەرمانی ئەبوبەکری کرد؟**

**سەعید وتی: نەء، مەگەر کەسێك هەڵگەڕابێتەوە، یا کەسێك کە نزیك بوو هەڵبگەڕێتەوە، خوای گەورە پشتیوانانی ڕزگارکرد، هەموویان کۆك**

بون لەسەری و بەیعەتیان پێدا!

وتی: ئایا هیچ کەس لە کۆچکەران دانیشت و بەیعەتی پێ نەدابێ؟

سەعید گوتی: نەخێر، کۆچکەران بەدوای یەکدا هەموو بەیعەتیان پێی دا!!

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف)یش‌ﷺ وتارێکی تری (ئەبوبەکر)مان بۆ دەگێڕێتەوە، پاش ئەوەی بەیعەتی دووەمی گشتیان پێی دا..

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) گوتویەتی: ئەبوبەکر وتاری دا و گوتی: هیچ کاتێ نە ڕۆژێ نە شەوێ سوور نەبووم لەسەر ئەمیرایەتی نە لە نهێنی و نە لە ئاشکرادا داوام نەکردووە.

زوبەیر و عەلی دوای بەیعەتدانیان سەرزەنشتی خۆیان تۆمار دەکەن

عەلی و زوبەیر گوتیان: بەخوا تووڕەبونمان تەنها لەبەر درەنگ ڕاوێژ پێکردنمان بوو!! ئێمە وادەبینین ئەبوبەکر شیاوترین کەسە بە خەلیفەیەتی، ئەو هاوەڵی ئەشکەوتە، ئێمە ڕێزی ئەو دەزانین، پێغەمبەری خواش لە کاتی ژیانیدا فەرمانی پێی کردووە نوێژ بە خەڵکی بکا.[1]

عەلی دوو جار بەیعەت بە ئەبوبەکر دەدا

عەلی کوڕی ئەبوطالب‌ﷺ دوو جار بەیعەتی بە ئەبوبەکرﷺ داوە:

جاری یەکەم/ ڕۆژی سێشەممە، دووەم ڕۆژی کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ، کاتێك کە بە پەلە هات، تەنها کراسێکی لەبەردابوو، هەروەك (حەبیبی کوڕی ئەبو ثابت) ریوایەتی کردوە.

جاری دووەم/ لەدوای کۆچی دوایی فاتیمە، خوای لێ‌ڕازی بێت، کە پاش شەش مانگ لە کۆچی دوایی باوکی ئەمیش کۆچی دوایی کرد.[2]

عەلی لەو شەش مانگەدا هەردەم لەگەڵ ئەبوبەکر بووەﷺ و لە هیچ کاتێکدا لێی جیانەبوە و لە کوڕ و کۆبونەوەکانی دانەبڕاوە. لە ڕاوێژ و بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵماندا بەشداری دەکرد.

هۆی تووڕەبونی فاتیمە لە ئەبوبەکر و، ڕەوابونی ئەبوبەکر لەو کارەدا

ئەوەشی فاتیمەی لە ئەبوبەکر تووڕە کردبوو، داواکردنی میراتی باوکی بوو لە ئەبوبەکر، ئەویش پێی ڕاگەیاندبوو کە پێغەمبەری خواﷺ هیچ میراتێکی بەجێ نەهێشتووە.

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٥٠.

٢ـ البداية والنهاية ٥: ٢٨٦.

**ئەبوهورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە گوتویەتی: میراتی من لە دینار و درهەم بەش بەش ناكرێ، ئەوەی لەدوای نەفەقەی خێزانەكانم و هاوكاری كاربەدەستەكانم دەمێنێتەوە صەدەقەیە.**

**عائیشە، خوای لێ‌ڕازی بێت، گوتویەتی: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد، خێزانەكانی كۆبونەوە، ویستیان عوسمان بنێرن بۆ لای ئەبوبەكر، بۆ ئەوەی داوای میراتی لێبكەن!**

**عائیشە پێی وتن: ئەدی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە: ئێمە میراتیمان لێ ناگیرێ، ئەوەی جێی دەهێڵین بۆ خێر و صەدەقەیە؟**

**ئیتر لەسەر ئەوە رێككەوتن.**

فاتیمە داوای میراتی پێغەمبەر دەكات لەگەڵ ئەوەیكە میراتی لێ ناگیرێ

**(عروەی كوڕی زوبەیر) ﷺ دەگێڕێتەوە كە: (فاتیمە)و (عەباس) چوون بۆلای ئەبوبەكر ﷺ تكای بەشەمیراتی خۆیانیان دەكرد لە هی پێغەمبەر بەو مەبەستەی زەویەكەی (فەدەك)وپشك(سهم)ی خەیبەریان پێبدات..**

**ئەبوبەكریش پێی گوتن: من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە فەرمویەتی: ئێمە میراتمان لێ ناگیرێ، ئەوەی بەجێی دەهێڵین سەدەقەیە، كەس وكاری موحەممەدیش لەم ماڵە بەشیان دەدرێ! بەخوا من هیچ كارێك وازناهێنم گەر بینیبێتم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دابێ، منیش هەر ئەنجامی دەدەم.**

**(فاتیمە) توڕە بوو، قسەی لەگەڵ (ئەبوبەكر)دا بڕی ﷺ.[١]**

پێش وەفاتی فاتیمە، ئەبوبەكر ڕازی دەكا

**پێش ئەوەی (فاتیمە)، خوای لێ‌ڕازی بێت، كۆچی دوایی بكات، (ئەبوبەكر) چووە ماڵەكەی و رازی كرد!**

**(عامری شەعبی) وتویەتی: كاتێ (فاتیمە)، خوای لێ‌ڕازی بێت، نەخۆش كەوت، ئەبوبەكر چوو بۆ لای، داوای مۆڵەتی لێكرد..**

**عەلی بە (فاتیمە)ی وت: ئەوە ئەبوبەكرە و داوای مۆڵەتت لێ دەكا!**

**(فاتیمە) پێی وت: پێت خۆشە مۆڵەتی بدەم؟**

**گوتی: بەڵێ.**

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٨٥.

(فاتیمە) مۆڵەتی ئەبوبەکری دا، ئەویش هاتە خزمەتی و داوای ڕازیبونی لێکرد و پێی وت: بەخوا خانو و ماڵ و کەس وکار و هۆزم تەنها لەپێناوی ڕازیبونی خوا و ڕازیبونی پێغەمبەری خوا و ئێوە ئەی ئەهلی بەیت بەجێ هێشتووە!

بەردەوام داوای ڕازیبونی لێدەکرد تا ڕازی بوو!![1]

عەلی لەدوای کۆچی فاتیمە جارێکیتر بەیعەت دەدا

کاتێك (فاتیمە)، خوای لێ ڕازی بێت، کۆچی دوایی کرد، عەلی چوو بۆ لای (ئەبوبەکر) لە مزگەوت، لەپێش موسڵماناندا قسەی لەگەڵ کرد، مافی (ئەبوبەکر)ی بە گەورە نیشان دا، فەزڵ و پێشینەی لە ئیسلامدا باس کرد، پاشان بەیعەتی پێدا رضي الله عنهم.

ئا ئەمە دووەم بەیعەتی عەلی بوو بۆ ئەبوبەکر لەدوای کۆچی دوایی (فاتیمە)، وەك تەئکیدکردنەوەی ڕێکەوتنەکە.[2] بەڵام بەیعەتی یەکەمی ڕۆژی سێشەممەی دووەم ڕۆژی کۆچی دوایی پیغەمبەری خوا ﷺ بە ئەنجام گەیشتبوو، هەروەك هاوەڵان دەیگێڕنەوە و ئیمامی (موسلیم)ی خاوەنی (جامع الصحیح)وماموستاکەی ئیمام (ئیبن خزیمە) تەرجیحی دەدەن!

وایان زانی بەیعەتی یەکەمە

بەڵام کاتێ بەیعەتی دووەمی عەلی درا بە ئەبوبەکر، هەندێ لە گێڕەرەوەکان گومانیان برد عەلی لە پێشدا بەیعەتی نەدابێ. بەڵام دروست ئەوەیە کە فەرموودەناسان و گێڕەرەوە جێمتمانەکانی وەك ئیمامی موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێبی فەرمویانە.[3]

---

١ـ البداية والنهاية ٥: ٢٨٩.

٢ مەبەست ڕێکەوتنی فاتیمە و ئەبوبەکرە.. (وەرگێڕ).

٣ البداية والنهاية ٥: ٢٨٦.

بۆ درێژەی ڕوداوی کەپری (بەنی ساعیدە)وبەیعەتی یەکەم و دووەمی ئەبوبەکر و بەیعەتی یەکەم و دووەمی عەلی بۆی، سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

١ـ (الروض الأنف)ی سوهەیلی، ڕاڤەی (سيرة ابن هشام). ٧: ٥٥١-٥٥٧.

٢ـ (مسند احمد بن حنبل) بە تحقيقى (شعيب الأرناؤوط) ١: ٤٤٩-٥٥٤.

٣ـ (تأريخ الطبري) ٣: ٢٠٣-٢١١.

یارمەتی خوایی بۆ موسڵمانان لە هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بە خەلیفە

خوای گەورە خێری بۆ موسڵمانان ویست، کاتێ خستیه دڵیانەوە کە ئەبوبەکرﷺ بە خەلیفە بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

لەراستیدا ئەبوبەکر واجبێکی قورس و ئەرکێکی گەورەی لەپێشدا بوو، بۆ چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتی خیلافەت و چارەسەری گرفتە تووشهاتو و ترسناکەکان، کە لە ئەنجامی کۆچی پێغەمبەری خواوەﷺ هاتەکایەوە.

خوای گەورە ئەبوبەکری سەرکەوتوو کرد بۆ ڕای پەسەند، لەو هەموو کاروبار و ڕووداو و گرفتانەی کە ڕوبەڕوی بونەوە.

ئەبوبەکر لەلایەن ڕاجیاواز و هەڵگەڕاوە و یاخیبوانەوە ڕوبەڕوی چەندەها سازشکاری و فریودان و پێشنیاری سەیر و سەمەرە هات، بۆ ئەوەی واز لە خۆی و موسڵمانان بهێنن، هەندێ لە هاوەڵانیش مەیلی بەلای ئەو پیشنیار و سازشانەدا چوو، تا ئەو کاتەی موسڵمانان بەهێزتر دەبن.

خوای گەورە ئەبوبەکری بۆ ڕای پەسەند سەرکەوتوو کرد

بەڵام خوای گەورە نای بە دڵی ئەبوبەکرەوەﷺ تا هەموو ئەو شتانەی خستیانە بەرچاوی و ئەو سازشانە پەسەند نەکا و تەنازول نەکات و، جێگیر و چەسپاو بێت لەسەر کیتاب و سوننە و ڕێژین(سیرە)ی پێغەمبەری خواﷺ.

ئەگەر ئەبوبەکر ئاماژەی هەندێ لە هاوەڵانی وەربگرتایە بەوەی لەگەڵ یاخی بوان هەڵی بکردایە و نەرم و نیان بوایە و لەگەڵ زەکات نەدەران و هەڵگەڕاوەکاندا ڕێك بکەوتایە، ئەوا هەر لە ڕۆژانی یەکەمیەوە دەوڵەتی ئیسلامی شەرعیەتی لە دەس دەدا و دەوڵەتی ئیسلامی لە پابەندی ورد و بەرچاو ڕۆشنانەی بە کیتاب و سوننەوە لایدەدا.

ڕەزای خوا لە ئەبوهورەیرە بێ کاتێ کە وتی: سوێند بەو خوایەی کە جگە لە خۆی پەرستراوێکی تر نیە کە شایەنی پەرستن بێ، ئەگەر ئەبوبەکر خەلیفە نەبوایە، خودا نەدەپەرسترا!

---

٤ (البدایــــة والنهایــــة)ی ابــن کـــثیر ٥: ٢٤٥-٢٥٤ و ٥: ٢٨٥-٢٩١. زۆربــەی پــشت پێبەستنەکانم لەسـەر گێڕانـەوەکانی (ابـن کـپیر)و تـەرجیح و تەحقیقـە بەنرخـەکانی بوە.(رحمه الله)

سەردەمی ئەبوبەکر بەهەژان و گرفت دەستی پێکرد

سەرەتای خەلافەتی ئەبوبەکر بە کۆمەڵێك هەژاندنی توندوتیژ و گرفتی توند دەستی پێکرد، بەڵام خوای گەورە هاوکاری کرد لە دامەزراندن و جێگیربون و جوان چارەسەرکردنێکی پابەندانە بە کیتاب و سوننەوە.

لەو گرفتە توندانەی ڕوبەڕوی ئەبوبەکر بویەوە:

ترسناکترینی ئەو چوار گرفتەی ڕوبەڕوی بویەوە..

١) گرفتی کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ. لەپێشدا هەڵوێست و چارەسەری ئەومان باس کرد لەو تروسکە مێژوییەی ڕابورد.

٢) گرفتی هەڵبژاردنی خەلیفە و کۆبونەوەی خەڵکی لەسەری و زاڵبون بەسەر تۆوی ناکۆکی و دوبەرەکی و دەستکەوتنی ڕازیبونی پشتیوانان و ڕازیبون و بەیعەتدانی (ئالی بەیت) وێنەی (عەباس)و(عەلی)ﷺ، لە پێشیشدا قسەمان لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم گرفتەمان کرد.

٣) گرفتی بەڕێکردنی سوپای ئوسامە.

٤) گرفتی سازشکار و پێشنیارەکانی زەکات نەدەران.

وەستانی سوپای ئوسامە بەهۆی نەخۆشی و کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە

بەڵام بابەتی سوپای ئوسامە، هەروەك دەزانین پێغەمبەری خواﷺ ئاراستەی سوپای (ئوسامەی کوڕی زەید)ی کردبوو ڕووەو (بلقاء)ی وڵاتی شام بڕوا، بۆ ئەوەی لەوێ ڕوبەڕووی ڕۆم بێتەوەو تۆڵەی باوکی (زەیدی کوڕی حاریثە)ش بسێنێ کە لەوێ و لە جەنگی (مؤتة)دا شەهید ببوو.

سێ هەزار خەباتکاری موسڵمانی لەگەڵدا بوو، تیایاندا گەورە هاوەڵانی وێنەی (عومەری کوڕی خەتتاب) بووﷺ. کاتێ سوپا دەستی کرد بە ڕۆیشتن، پێغەمبەری خواﷺ نەخۆشی مردنی گرت، ئوسامەش سوپاکەی لە ناوچەی (الجرف)ی نزیك بە مەدینە مۆڵ دا، تا بزانێ حاڵ و باڵی پێغەمبەری خواﷺ چۆن دەبێ؟

کاتێ کە پێغەمبەری خواﷺ کۆچی دوایی کرد، سوپاکەی ئوسامەش لە ڕۆیشتن کەوت، بەڵام دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ گرفتەکان لەسەر موسڵمانانی مەدینە زیاتر بوو. کاتێ کە دووڕوویی لە مەدینەدا بەدەرکەوت، هۆزە عەرەبەکانی دورگەی عەرەبی و دەوری مەدینە هەڵگەڕانەوە و چەندەها کەسی درۆزن بە دەرکەوتن کە بانگەشەی

پێغەمبەرایەتیان دەکرد، هەندێ لە عەرەبەکان زەکاتیان نەدا، دوژمن و هەڵگەڕاوە و زەکات نەدەران و یاخیبوان کۆمەڵیان کۆوە کرد بۆ هەڵکوتانە سەر خەلیفە و داگیرکردنی مەدینە و دەستگرتن بەسەر خەلافەت دا.

ئاماژەیان بۆ ئەبوبەکر کردکە سوپای ئوسامە هەڵوەشێنێتەوە

گەورە هاوەڵانی دەوری خەلیفە ئەبوبەکری صدیق‌ﷺ تێبینی ئەم مەترسیانەیان دەکرد، کە چاوی تێبڕیبون، وای بۆچوون سوپای ئوسامە بە هەرسێ هەزار موجاهیدەکەوە لەناو مەدینە بمێننەوە بۆ ڕوبەڕووبونەوەی دەستە داگیرکەرەکان.

هەر بۆیە ئاماژەیان دایە ئەبوبەکر کە سوپاکە بهێڵێتەوە و نەینێرێ بۆ شام، هەروەك کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردبوو بەڕێ بکەوێ، وایان دەبینی حیکمەت لەوەدا نیە سوپاکە لە مەدینە بچێتە دەرەوە و لەم بارودۆخە ناسکەشدا مەدینە لە باشترین پیاوەکانی کە سێ هەزار کەسن چۆڵ بکرێ!!

سوربونی ئەبوبەکر لەسەر بەڕێکردنی سوپاکە

بەڵام ئەبوبەکر بە ئاماژەکردنەکەیان ڕازی نەبوو، هەرچەندە هاوبەش و هاوهەستی مەترسیەکان بوو، هەستی بە ترسناکی هەڵوێستەکە دەکرد. بەڵام چۆن لیوایەك هەڵوەشێنێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ گرێی دابێت؟! چۆن سەردەمی خۆی بە هەڵوەشاندنەوەی فەرمانێك دەست پێ بکا کە پێغەمبەری خواﷺ دەری کردووە؟ ئەی چۆن سوپایەك بوەستێنێ کە پێغەمبەری خواﷺ پێکی هێنابێ؟

پێویستە سوپاکە بخرێتە ڕێ، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی دابوو، دوای ئەوە هەرچیەك دەبێ با ببێ، دیارە هەر چاکەش دەبێ، چونکە خوا ئومەتێك تێك نادا لە کاتێکدا فەرمانی پێغەمبەری خواﷺ جێبەجێ دەکا!!

عائیشە بەسەرهاتی سوپای ئوسامە دەگێڕێتەوە

(عروەی کوڕی زوبەیر) لە (عائیشە)وە، خوای لێ‌ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: کاتێ بەیعەت بە ئەبوبەکر درا و پشتیوانانیش لەسەر ئەوە کۆك بون، عەرەب سەرجەم هەڵگەڕانەوەو دووڕوویی بەدەرکەوت، جولەکە و گاورێتی سەریان بەرز کردەوە، موسڵمانانیش

بەهۆی کۆچی دوایی پێغەمبەرەکەیانﷺ و کەمی خۆیان و زۆری دوژمنیان، وەك مەڕی بەر لێزمەبارانی شەوەزەنگیان لێهاتبوو.

ئەبوبەکر گوتی: با سوپای ئوسامە ئامادەبێ و، بەرێ بخرێ.

ئەوانەی لە دەوری بون وتیان: لە ڕاستیدا سوپای ئوسامە زۆرینەی موسڵمانانی بەردەستی تۆیە، عەرەبیش هەڵگەڕاونەتەوە، ناکرێ کۆمەڵی موسڵمانان پەرتەوازە بکەی، پێویستە لەلای خۆت بمێننەوە!

ئەبوبەکر گوتی: بەخوا لیوایەك هەڵناوەشێنمەوە پێغەمبەری خوا گرێی دابێت، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر بزانم دڕندەکان دەمڕفێنن، سوپای ئوسامە دەخەمە ڕێ، هەروەك چۆن پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردبوو، ئەگەر لە مەدینە تەنها خۆم مابێتمەوە ئەوا دەیخەمە ڕێ.

هەروەها ئەبوبەکر وتی: من سوپایەك بوەستێنم و گێردەم کە پێغەمبەری خواﷺ ناردویەتی، ئەگەر وا بکەم ئەوە جورئەتی کارێکی گەورەم کردوە!

سوێند بەوەی نەفسی منی بە دەستە، ئەگەر هەموو عەرەب بەسەرمدا دەن، پێم خۆشترە لەوەی سوپایەك گێردەم و بوەستێنم پێغەمبەری خواﷺ خستویەتیە ڕێ.

ئوسامە! بکەوە ڕێ بەرەو ئەو شوێنەی فەرمانت پێکراوە، لەو شوێنەوە بجەنگێ کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێکردی، لەلای فەلەستینەوەو بۆ سەر خەڵکی (مۆتە)، بشزانە لەدوای تۆ خوا دەمان پارێزێ!!

سوپای ئوسامە ئامادەی ڕۆیشتن کرا، ئەبوبەکر چوو بۆ (جرف) بۆ بینین و ئامۆژگاری پێدانیان.

ئەبوبەکر بە پیادە سوپا دەخاتە ڕێ و داوای مۆڵەتی مانەوەی عومەر لەلای خۆی دەکا

ئەبوبەکر بە پیادە دەڕۆیشت بۆ لایان، لەکاتێکدا سەرکردەی سوپا (ئوسامەی کوڕی زەید) -کە تەمەنی لە بیست خوارتر بوو- بە سواریی بوو.

ئوسامە ئەمەی بە گونجاو نەزانی، چۆن دەبێ ئەو بە سواریی بێ و خەلیفەی موسڵمانان ئەبوبەکر بەپێ بڕوا.

**ئوسامە بە ئەبوبەکری وت: یا ئەوەتا سوار بە، یاخود منیش بە پیادە دەڕۆم!!**

**ئەبوبەکر پێی وت: بەخوا نە سەردەکەوم و نە تۆش دادەبەزی، چیم لێ دێ گەر سەعاتێك لە پێناوی خوادا پێیەکانم تۆزاوی بن!!**

**لەبەر ئەوەی (عومەری کوڕی خەتتاب) سەربازێك بوو لە سوپای ئوسامەدا، ئەبوبەکریش پێویستی بە عومەر بوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبار ی موسڵمانان، بۆیە ئەبوبەکر مۆڵەتی لە ئوسامە خواست تا عومەر لای خۆی بهێڵێتەوە، ئەبوبەکر پێی وت: ئەگەر پێت باش بێت عومەر لە مەدینە لای خۆم بمێنێتەوە!!! ئوسامەش ڕەزامەندی لەسەر ئەمە دەربڕی.**

گەڕانەوەی سوپاکەی ئوسامە بە سەرکەوتویی پاش شەست ڕۆژ

**ئوسامە بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت تا گەیشتە سنوری (بلقاء)، خواروی وڵاتی شام، لەوێ هەڵی کوتایە سەر عەرەبەکانی ئەوێ، ئەوانەی هاوکار و بەکرێگیراوی ڕۆمەکان بون، ئوسامە بەخۆی و سوپاکەیەوە شەست ڕۆژ ون بون، پاشان بە غەنیمەت و سەرکەوتوییەوە بۆ مەدینە گەڕانەوە.**

**حیکمەت لە دید و بۆچوونی (ئەبوبەکر) لە بەڕێکردنی سوپاکەی ئوسامە و هەڵنەوەشاندنەوەی لیوایەك کە پێغەمبەری خواﷺ گرێی دابوو هەبوو.**

**ئەم حیکمەتەش ئەبوهورەیرە روونی دەکاتەوە کاتێ وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لە خۆی پەرستراوێکی تر نیە، ئەگەر ئەبوبەکر هەڵنەبژێررایە بە خەلیفە، خودا نەدەپەرسترا! لەسەر ئەمە سێ جار سوێندی خوارد.**

**پێیان وت: ئەبوهورەیرە! بۆ؟**

**وتی: پێغەمبەری خواﷺ (ئوسامەی کوڕی زەید)ی ئاراستەی شام کرد، بەڵام کاتێ گەیشتنە (ذي خشب) پێغەمبەری خواﷺ ڕۆحی کێشرا، عەرەبەکانی دەوری مەدینە هەڵگەڕانەوە.**

**هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ لە دەوری ئەبوبەکر کۆبونەوەو پێیان وت: ئەبوبەکر! سوپای ئوسامە بگێڕە دواوە! چۆن دەیاننێری بۆ بەردەمی ڕۆم لەکاتێکدا عەرەب هەڵگەڕاونەتەوە؟**

ئەبوبەکر گوتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەو پەرستراوێکی تر نیە، گەر سەگ قاچی خێزانەکانی پێغەمبەری خواﷺ بەکێش کەن، سوپایەك ناگێڕمەوە پێغەمبەری خوا ئاراستەی کردبێ و لیوایەك هەڵناوەشێنم پێغەمبەری خواﷺ گرێی دابێ!!

کاتێ سوپای ئوسامە بەرەو شام ڕۆیشت، بەلای هەر هۆزێکی عەرەبدا دەڕۆیشتن، دەیان وت: ئەگەر بڕوادارەکان لە مەدینەدا بەهێز نەبونایە، ئەم سوپایەیان بەڕێ نەدەخست.

ئەو هۆزانە ترسیان لێ نیشت و کۆڵیان دا لە ڕوبەڕوبونەوەی موسڵمانانی مەدینە.

ئەمەش فەزڵ و گەورەیی دامەزراویە لەسەر بەرنامەی پێغەمبەری خواﷺ، هەروەك (صدیقﷺ) ئەنجامی دا!!

گرفتی زەکات نەدەرەکان لەبەردەم ئەبوبەکردا

گرفتی چوارەم زەکات نەدانی هەندێك و، خستنەپێش چاوی هەندێ پێشینار و سازش بوو بۆ (ئەبوبەکر)، هەڵوێستی ئەبوبەکریش، سەرەڕای ئەو بارودۆخە قورسەی کە تیایدا دەژیا، دامەزراوی لەسەر هەق و تەنازل نەکردن لە هیچ بەشێك و، سازش نەکردن یا موداهەنە نەکردن بوو!

هۆزە عەرەبەکان یا هەلگەڕاوە یا زەکات نەدەر بون

(موحەممەدی کوڕی ئیسحاق) وتویەتی: لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەرداﷺ جگە لە خەڵکی مەککە و مەدینە، هەموو عەرەب پاشگەز بونەوە:

(اسد و غطفان) پاشگەزبونەوەو سەرکردەکەیان (طەلحەی کوڕی خوەیلدی ئەسەدی) بوو.

(کندە) پاشگەزبوویەوەو سەرکردەکەیان (ئەشعەثی کوڕی قەیسی کیندی) بوو.

(ربیعە) پاشگەزبونەوە و سەرکردەکەیان(مەعروری کوڕی نوعمان) بوو.

(حنیفە) پاشگەزبونەوەو سەرکردەکەیان (موسەیلەمەی کوڕی حەبیب)ی درۆزن بوو.

(سُلَیم) پاشگەزبونەوەو سەرکردەکەیان (الفَجاءة بن عبد یالیل) بوو.

(تمیم) پاشگەزبونەوەو سەرکردەکەیان (سوجاجی کچی حارث) بوو.

(قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) وتویەتی: (اسد)و(غطفان)و(طيء) لەسەر (طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی) کۆبونەوە و چەند وەفدێکیان نارد بۆ مەدینە تا لەگەڵ ئەبوبەکر و موسڵماناندا لەسەر نەدانی زەکات ڕێك بکەون.

چەند پێشنیارێك بۆ ئەبوبەکر تا نوێژیان بەبێ زەکات لێ پەسەند بکات

وتیان: بەڵام نوێژ، ئەوە جێبەجێی دەکەین و ئەنجامی دەدەین، بەڵام زەکات نادەین، چونکە جزیەیە، ئێمە کاتی خۆی زەکاتمان دەدا بە پێغەمبەری خواﷺ، بەڵام کە ئەو مرد، ئەوا لەپاش ئەو نایدەین بەهیچ کەس.

زەکات نەدەرەکانی هۆزە عەرەبەکات زۆر بون، زەکات نەدەران ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە دەهێنایەوە بۆ زەکات نەدانەکانیان:

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ: لە داراییەکی هەیانە سەدەقەیان لێ وەرگرە، تا بەوە پاك و خاوێنیان بکەیتەوە. نزای باشیان دەرهەق بکە، نزای تۆ ئۆقرەیە بۆ وان.﴾التوبة:١٠٣.

وتیان: ئێمە تەنها زەکات بە کەسێك دەدەین کە نزای ئۆقرەو ئارامی بێت بۆمان، کە ئەوەش پێغەمبەری خوایەﷺ، جا کاتێ مردووە، پاش ئەو نایدەین بە هیچ کەس.

یەك لە شاعیرەکانیان بەشیعر دەیوت:

أطعنا رسول الله ما كان بيننا فيالعباد الله: ما لأبي بكر؟
أيُورثنا بكراً إذا مات بعده وتلك لعمر الله قاصمة الظَّهر!

گەورە هاوەڵان مەیلیان بەلای نەرم و نیانیدایە

هەندێ لە هاوەڵان نەرم و نیانیان لەگەڵ زەکات نەدەرەکاندا پێ باشتر بوو، کە بەنوێژکردن وازیان لێبهێنرێ و لەئاست زەکات نەدانیان بێدەنگی بنوێنرێ، چونکە کاتێ کە بڕوا لە دڵیاندا بەهێز دەبێ زەکاتەکە دەدەن.

[...]سپاوی ئەبوبەکر [...]ربونی لەسەر حەق

بە ئەبوبەکریان وت: وازیان لێبێنە لەوەی کە زەکات نادەن، تەنها بەنوێژ پەسەندیان بکە و دڵیان ڕاگرە، تا ئیمان لە دڵیان دامەزراو دەبێ،

پاش ئەوە زەکات دەدەن!!

ئەبوبەکرﷺ وەڵامێکی کەسێکی دانەوە کە لەسەر هەق دامەزراوە و لێی دانابەزێ و سازشی لەسەر ناکا:

بەخوا ئەگەر بزنێك -یا ئەو پەتەی کە وشتری زەکاتی پێ دەبەسترێتەوە- پێم نەدەن کە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەری خواﷺ، ئەوا لەسەر نەدانی لەگەڵیان دەجەنگم، لەراستیدا زەکات مافی ماڵە، بەخوا دەجەنگم لەگەڵ کەسانێك جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەکاتەوە.!

گفتوگۆی ئەبوبەکر لەگەڵ عومەر لەبارەی جەنگان لەگەڵ زەکات نەدەرەکان

جا کاتێ ئەبوبەکر ویستی لەگەڵ زەکات نەدەران بجەنگێ، لەو بارەیەوە عومەر گفتوگۆی لەگەڵ کرد، پاشتر عومەر بە رایەکەی ئەبوبەکر رازی بوو.

(ئەبو هورەیرە)ﷺ گوتویەتی: عومەر بە ئەبوبەکری وت: لەسەر چی لەگەڵیان بجەنگین، لە کاتێکدا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا شاهێدی دەدەن کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخوا و، موحەممەدیش نێرراوی خوایە، ئەگەر ئەمەیان وت، خوێن و ماڵیان لێم حەرام دەبێ، مەگەر بە مافی خۆی نەبێ)؟!

پاشان کۆك بونی عومەر لەگەڵ ئەبوبەکر

ئەبوبەکر گوتی: بەخوا ئەگەر بزنێك -یا ئەو پەتەی کە وشتری زەکاتی پێ دەبەسترێتەوە- پێم نەدەن کە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەری خواﷺ، ئەوا لەسەر نەدانیان لەگەڵیان دەجەنگێم، لەراستیدا زەکات مافی ماڵە، بەخوا لەگەڵ کەسانێك دەجەنگم جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژ و زەکاتەوە.

عومەر وتی: هەر ئەوەندەبوو کە هەستم کرد خوای گەورە سینەی ئەبوبەکری بۆ جەنگان گوشاد کردووە، جا زانیم ئەو لەسەر حەقە!!

(عومەری کوڕی خەتتاب) روکار(ظاهر)ی فەرمودەکەی وەرگرتبوو، بەو شێوەیەی هاتووە کە دان دەنێ بە پاراستنی خوێنی هەرکەسێك کە گۆ بە شایەتمان دەکا.

لەجەنگی زەکات نەدەرەکاندا، ئەبوبەکر پێکابووی

سەرنجی ئەو تێبینیە گرنگەی نەدا کە ئەبوبەکر هەستی پێی کردبوو، لە پەیوەست کردنی نوێژ بە زەکاتەوە و جیاوازی نەخستن لە نێوانیاندا و چەسپان لەسەر هەق و دانەبەزین لە هیچ بەشێکی.

لە ڕاستیدا ئەبوبەكر پێكابووی، هەر بۆیە خوای گەورە سینگی عومەر و هاوەڵانی بۆ ئەو هەقەی كە لەگەڵ ئەبوبەكر بوو گوشاد كرد، سەرەنجام هەموویان هاودەنگ بون لەسەر جەنگی زەكات نەدەران، ئەگەر بە پاشگەزبووەوە و هەڵگەڕاوەش دانەنرێن.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ: ئەگەر تەوبەیان كرد و نوێژیان بەجێهێنا و زەكاتیان دا، ئەوا ڕێیان لێ مەگرن.﴾التوبة/٥.

(ئیبن عومەر) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات دەنرێ: شایەتیدان بەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ، و بەجێهێنانی نوێژ و زەكات دان و حەجی ماڵی خوا و ڕۆژوی ڕەمەزان.

ئایەت و فەرمودەكە نوێژ و زەكاتی پێكەوە هێناوەو جیاوازی نەخستۆتە نێوانیان.

بەڵكو بەپێی گێڕانەوەیەكی تری ئەو فەرمودەیەی كە (عومەر) بە بەڵگە هێناویەتیەوە هاویەكی لەنێوان شایەتمان و نوێژ و زەكات كردوە.

(عبدالله‌ی كوڕی عومەر) رضي الله عنه لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە بە جەنگان لەگەڵ خەڵكیدا تا شایەتی دەدەن بەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش نێرراوی خوایە، نوێژ جێبەجێ بكەن و زەكات بدەن، ئەگەر ئەمەیان ئەنجام دا ئەوا خوێن و ماڵیان پارێزراوە، مەگەر بە مافی ئیسلام و لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە!!

چی ڕوودەدا ئەگەر ئەبوبەكر لەگەڵیان نەرم بوایە؟!

هەركاتێ بیر لە هەڵوێستەكەی (ئەبوبەكر) رضي الله عنه دەكەینەوە لە گرفتی زەكات نەدان و دەمەزراو بونی لەسەر هەق، ئێمە پێی ڕازین، حاڵی موسڵمانان دەبوایە چۆن بوایە ئەگەر لەگەڵ زەكات نەدەراندا سازش و مەرایی بكردایە و لەسەر هەندێ هەق دابەزیایە؟! كەواتە دامەزراوی

لەسەر هەق بەم شێوەیە دەبێ.[1]

جێگیربونی کاروبار لەسەردەمی ئەبوبەکردا

لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا ﷺ کاروباری دەوڵەتی ئیسلامی جێگیر و ئارام بوو، لەگەڵ زەکات نەدەرەکان جەنگا و شەڕی هەڵگەڕاوەکانی کرد و بەسەر بانگەشەکارانی پێغەمبەرایەتی‌دا زاڵ بوو، (ئەسوەدی عەنسی) لە یەمەن و (موسەیلەمە)ی درۆزن لە یەمامە کوژران و (طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی)و(سوجاجی کچی حارثی تەمیمی) بۆ ئیسلام گەڕانەوە.

دوو بەرەی جیهادی لە سەردەمی ئەودا

لە خەلافەتی ئەبوبەکر ﷺ دەستکرا بە رزگارکردنە ئیسلامیەکان(الفتوحات الإسلامية)، ئەبوبەکر مۆڵەتی دا دوو بەرەی جیهادکردن دژ بە کافران بکرێتەوە:

بەرەی عێراقی

بەرەی یەکەم/ بەرەی عێراقی بۆ جیهادی فارسەکان.

موجاهیدەکان بە سەرکردایەتی موجاهیدی رزگارکەر (موثەنای کوڕی حارثەی شەیبانی) چەندەها جەنگی توندی دژ بە فارسەکان ئەنجام دا و تیایدا خوای گەورە سەرکەوتن و سەرفرازی کردە بەشی موسڵمانان.

کاتێکیش (خالیدی کوڕی وەلید ﷺ) لە جەنگی هەڵگەڕاوە و زەکات نەدەرەکانی دورگەی عەرەبی لێبویەوەو زاڵ و سەرکەوتوو بوو بەسەر (موسەیلەمەی درۆزن)وسوپاکەیدا، ئەبوبەکر فەرمانی پێکرد رووەو بەرەی عێراق بکشێ بۆ ئەوەی سەرکردایەتی موسڵمانانی تێدا بگرێتە دەست و هەستێ بە جیهادی فارسەکان.

(موثەنای کوڕی حارثە)وسوپاکەی هاتنە پاڵ سوپاکەی خالید.. لێرەوە خالید و برا موجاهیدەکانی چەندەها جەنگی سەرکەوتوانەیان دژ بە فارسەکان ئەنجام دا.

بەرەی شام

بەرەی دووەم/ بەرەی شام بوو، کە لەوێ جیهاد دژ بە رۆمەکان بوو، کە بەهێزترین دەوڵەتی جیهانی ئەو سەردەمە بوو.

---

[1] لەسەر هەڵوێستی ئەبوبەکر بەرامبەر زەکات نەدەران سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: البداية والنهاية لأبن كثير ٦: ٣١١-٣١٤، شرح النووي لصحيح مسلم ١: ٢٠٠-٢١٠.

**ئەبوبەكری صدیق‌ﷺ چوار سوپای بە سەركردایەتی چوار هاوەڵی گەورە نارد كە (ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح)و(عەمری كوڕی عاص)و(یەزیدی كوڕی ئەبوسوفیان)و(شەرحەبیلی كوڕی حوسنە) بون.**

**لە بەرەی شامدا چەندەها جەنگ لەگەڵ ڕۆمەكاندا رویان دا، پاشان جەنگی یەكلاكەرەوەی (یەرموك) رویدا كە ئەبوبەكر لەو كاتەدا كۆچی دوایی كرد.**

خەلافەتی ئەبوبەكر كورت بوو

**سەردەمی ئەبوبەكرﷺ درێژ نەبوو، كۆچ كردنەكەی لە ڕۆژی سێشەممەی ٢٢ی (جمادي الآخرة)ی ١٣ی كۆچی بوو، واتە خەلافەتەكەی دوو ساڵ و سێ مانگ و دە ڕۆژ بوو.**

**لەكاتی وەفاتیدا تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو، كە هەر لەو تەمەنەدا پێغەمبەری خواش وەفاتی كرد.**

**ئەبوبەكرﷺ زۆر خەمبار بوو بە كۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ.**

هۆی مردنی ئەبوبەكر

**(عبداللەی كوڕی عومەرﷺ) گوتویەتی: هۆی مردنی ئەبوبەكر، كۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ بوو، چونكە زۆر خەمی لێ دەخوارد و بەردەوامیش لاشەی لاواز دەبوو تاوەكو مرد، لەپێش كۆچی دواییدا تووشی تایەك هات.**

**عائیشە، خوای لێ‌رازی بێت، وتویەتی: ئەبوبەكرﷺ لە ڕۆژێكی سارددا خۆی شۆرد، بەو هۆیەوە تووشی تا هات، پانزە ڕۆژ پێوەی نەخۆش كەوت، نەیدەتوانی بچێت بۆ نوێژ، لەو كاتەدا عومەری كوڕی خەتتاب پێشنوێژی خەڵكی دەكرد.**

**خەڵكی سەریان لێدەدا و زیارەتیان دەكرد و پێیان وت: ئەرێ پزیشكت بۆ بانگ نەكەین؟! گوتی: بینیومیەتی، وتیان: چی پێ وتی؟ گوتی: پێمی وت: (إني فعال لما أريد) بەراستی ئەوەی بمەوێ دەیكەم!!**

ئەبوبەكر ماڵ دەگێڕێتەوە بۆ (بیت المال)

**عائیشە گوتویەتی: كاتێ ئەبوبەكر نەخۆشی مردنی گرت، گوتی: سەیركەن بزانن لەوەتەی بوومەتە سەركردەی موسڵمانان چەندە ماڵم زیادی كردووە، پاش خۆم بینێرنەوە بۆ خەلیفە و، بیگەڕێننەوە بۆ (بیت المال)ی موسڵمانان.. من هیچم لەو ماڵە ناوێ.**

کاتێ کە کۆچی دوایی کرد بینیمان بەندەیەکی (نوبی)ووشترێکی ئاوکێش و هەسانێك بۆ تیژکردنی شمشێر و پارچەقوماشێك کە پێنج درهەم ناهێنێ بەجێی هێشتووە!!

ئێمەش ئەوانەمان بۆ لای (عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه) نارد تا لە (بیت المال)دا دایبنێ، کاتێ عومەر بینی دەستی کرد بە گریان و گوتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر بێ، لەدوای خۆی، والیەکانی خۆی زۆر ماندوو دەکا!!

عائیشە، خوای لیێرازی بێت، گوتویەتی: کاتێ ئەبوبەکر لەسەرەمەرگا بوو، دانیشت و شایەتمانی هێنا و پاشان پێی وتم:

ئامۆژگاری ئەبوبەکر بۆ عائیشە و کەرامەتەکەی

کچەکەم! ئەوەی زۆر پێم خۆش بێ لەدوای خۆم دەوڵەمەند بێ تۆی، قورسترین کەسیش لام ناخۆش بێ هەژار بێ هەر تۆی، ئەگەر من بیست بار خورمام پێدابووی، لەو بەرەی کە لە دارخورماکەمی دەڕنن، بەڵام ئەوانی تر دوو برا و دوو خوشکەکەت لەگەڵ تۆدا لەدوای من میرات دەگرن.

عائیشە وتی: ئەوانە هەردوو براکەمن، ئەی خوشکەکەم کێیە؟

وتی: ئەوەی لە سکی (کچی خارجە)دایە، من وا گومان دەبەم کچ بێت!

کاتێ مرد، ژنەکەی (کچی خارجە) کچێکی بوو ناویان نا (ئوم کەلثوم)!

ئەمەش کەرامەتێکە لە کەرامەتەکانی ئەبوبەکر رضي الله عنه کە هەواڵی داوە بەوەی خێزانە زگپڕەکەی (حەبیبەی کچی خارجەی کچی زەید) کچی دەبێ، ئەوەبوو لەپاش مردنیشی کچی بوو.

مەبەستی لە وتەکەی بۆ عائیشە: دوو برا و دوو خوشکەکەت. دوو براکەی (عبدالرحمن و موحەممەد)ودوو خوشکەکەی (ئەسما و ئوم کەلثوم) بوو.

عائیشە، خوای لیێرازی بێت، گوتویەتی: لەو ڕۆژەی ئەبوبەکر کۆچی دوایی تێدا کرد، پرسیاری لێم کرد پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە چەند جل کفن کرا؟ وتم: لە سێ جلدا.

کفن کردنی ئەبوبەکر لە کفنێکی کۆندا.

ئەبوبەکر بە عائیشەی وت: ئەم دوو جلەم بۆ بشۆن (ڕەنگ کرابون)و

جلێکی تریشم بۆ بکڕن.

عائیشە وتی: باوکە! ئێمە حاڵمان باشە، ئەی بۆ سێ جلی نوێت بۆ نەکڕین!!

وتی: زیندوو لەمردوو شایستەترە بۆ شتی تازە، ئەمانە جلی کێم و زوخاون!!!

ئەبوبەکر لەدوای خۆی خەلیفەیەك دەپاڵێوێ

ئەبوبەکر خێری موسڵمانی لەوەدا دەبینی کە دەستنیشانی خەلیفەیەکیان بۆ بکا، ئەم جێنشینی کردنە بریتی نیە لە دیاریکردنی خەلیفەی پاش خۆی، بەڵکو پاڵاوتنی ئەوە بۆ خەلیفەیەتی، لەدوای خۆیشی کاروبار بۆ موسڵمانانە، جا یا ئەوەتانێ ئەو هەڵدەبژێرن کە خەلیفە پاڵاوتویەتی و بەیعەتی پێ دەدەن، یاخود پەسەندی ناکەن و جگە لەو هەڵدەبژێرن، بەو مانایەی بە خەلیفەبون لەدوای بەیعەت پێدانی خەڵکی تەواو دەبێ و بەئەنجام دەگات.

مێژوونوس (عیزەدینی کوڕی ئەثیر) لە کتێبە مێژووییەکەیدا (الکامل) باسێکی پوخت و بەسودی جێنشین کردنی عومەری لەلایەن ئەبوبەکرەوە ﷺ باس کردوە.

شایەتی ئیبن عەوف بۆ عومەر

(ئیبن ئەثیر) وتەیەتی: کاتێ ئەبوبەکر وەختی مردنی هات، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ی بانگ کرد و پێی وت:

لەبارەی عومەرەوە هەواڵم بدەرێ.

شایەتی ئیبن عەوف بۆ عومەر

عبدالرحمن گوتی: بەراستی ئەو لە هەموو ئەوانە باشترە کە تۆ بەشیاوی خەلافەتیان دەزانی، بەڵام توندوتیژیەکی تێدایە.

ئەبوبەکر پێی گوت: توندوتیژیەکەی لەبەر ئەوەیە من بە نەرم و نیانی دەبینێ، ئەگەر کاروبار بکەوێتە دەستی و ببێتە خەلیفە، ئەوا زۆرێك لەو توندوتیژیانە واز لێ دێنێ، من بینیومە ئەگەر تووڕە بووبێتم لە کەسێك لێخۆشبونی پیشانداوم، گەر نەرم و نیانیش بووبێتم بەرامبەر کەسێك، توندی کردوومەتەوە لەسەری!

پاشان ئەبوبەکر، (عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ)ی بانگ کرد و پێی وت:

لەبارەی عومەرەوە هەواڵم پێ بدە؟

وتی: نهێنیەکەی باشترە لە ئاشکراکەی، لە ناوماندا وێنەی ئەو نیە.

ئەبوبەکر بە عوسمان و عبدالرحمنی وت: لەبارەی ئەوەی پێم وتن هیچ باس مەکەن.

گەلحەی کوڕی عبیدالله پێی باش نیە ئەبوبەکر، عومەر بکات بە خەلیفە

پاشان (طەلحەی کوڕی عبیدالله) چووە ژوورەوە بۆ لای ئەبوبەکر و پێی وت: چۆن عومەر دەکەی بە جێنشین بەسەر خەڵکیەوە؟ خۆت دەبینی عومەر چۆنە لەگەڵ خەڵکی، لەگەڵ ئەوەی خۆت لە گەڵیدای، ئەی ئەبێ هەر خۆی بێت چۆن بێت؟؟! تۆ بە خزمەتی پەروەردگارت دەگەی، پرسیاری رەعیەتەکەت لێدەکا!!

ئەبوبەکر گوتی: دام نیشێنن... دایان نیشاند..

بە (طەلحە)ی وت: ئایا ترسی خوا دەخەیتە بەردەمم! ئەگەر پەروەردگار پرسیاری لێ کردم، پێی دەڵێم: چاکترین کەسم کردوە بە خەلیفە بەسەر چاکترینی بەندەکانتەوە.

عوسمان نوسراوی جێنشین بون دەنوسێ

پاشان ئەبوبەکر، عوسمانی بە تەنها بانگ کرد، بۆ ئەوەی نوسراوی جێنشین بون بنوسێ، بە عوسمانی وت: بنوسە:

(بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە ئەو پەیمانەیە کە ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقوحافە بۆ موسڵمانانی کردووە.

لەپاش ئەوە..

ئەبوبەکر نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات، لەهۆش خۆی چوو..

عوسمان ترسا ئەبوبەکر بمرێ پێش ئەوەی ناوی جێنشینەکە باس بکا و لەمەشەوە موسڵمانان تووشی ناکۆکی و جیاوازی بن، لەو کاتەی ئەبوبەکر لەهۆش خۆی چوو، عوسمان نووسی:

لەپاش ئەوە:

ئەوا عومەری کوڕی خەتتابم کرد بە خەلیفەتان، لەچاکەکردنی ئێوەدا کەمتەرخەم نەبووم..

پاشان ئەبوبەکر هاتەوە هۆش خۆی و بە عوسمانی وت: چیت نوسیوە بۆم بخوێنەوە.

عوسمانیش ئەوەی نوسیبوی خوێندیەوە.

ئەبوبەکرﷺ تەکبیرێکی کرد و بە عوسمانی گوت:

ناوی عومەرت بۆیە نوسی، چونکە ترسای لەوەی من لەو لەهۆش خۆ چوونەدا بمرم و موسڵمانان ناکۆکیان تێبکەوێ!

عوسمان گوتی: بەڵێ.

ئەبوبەکر پێی وت: خوای گەورە لە جێی ئیسلام و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە.

ئەبوبەکر وتار بۆ خەڵك دەدا

پاشان ئەبوبەکر چوو بۆ لای ئەو خەڵکەی بۆی کۆبیبونەوە، نوسراوی جێنشین کردنەکەی بەسەردا خوێندنەوە و پێی وتن:

من کەسێکی خزمی خۆمم نەکردوە بە جێنشین، عومەرم کردووە بە جێنشین، گوێبیست و فەرمانبەری بن، بەخوا لەم رایەشمدا هەوڵی زۆرم داوەو کەمتەرخەمی و کەموکورتیم نەکردوە.

دوای ئەوە ئەبوبەکر ناردی بە شوێن عومەردا و ئامۆژگاریەکی تێر و تەواوی کرد، ئەوەی لەو وەسیەتەدا هاتووە:-

ئەبوبەکر ئامۆژگاری عومەر دەکا

(عومەر! لەخوا بترسە، ئەوەش بزانە کردەوەی ڕۆژی وا هەیە خوای گەورە لە شەودا وەری ناگرێ و کردەوەی شەوی وا هەیە لە ڕۆژدا وەری ناگرێ، خوای گەورە سوننەت وەرناگرێ تا فەرزەکان جێبەجێ نەکرێن.

ئەوانەی کە لە قیامەتدا تەرازوویان قورس دەبێ بە هۆی شوێنکەوتنی رەوا و هەقە لە دونیادا، مافی خۆشیەتی ئەو تەرازوەی کە تەنها هەق و رەوای تێدا بێ، قورس و سەنگین بێ و ئەوانەشی کە تەرازوویان لە قیامەتدا سوك دەبێ بە هۆی شوێنکەوتنی ناڕەوا دەبێ و مافی خۆشیەتی ئەو تەرازوەی کە تەنها ناڕەوای تێدابێ سووك و خواربێتەوە.

خوای گەورە کە باسی بەهەشتیانی کردووە، باسکردنەکەیان بەهۆی کردەوەی باشیان بووەو، لە کردەوەی خراپیان خۆشبووە. جا منیش کە

باسیان دەکەم وتوومە: دەترسم بە بەهەشتیان نەگەم!

لە ڕاستیدا خوای گەورە باسی دۆزەخیانی کردووە، باسکردنەکەیان بەهۆی خراپی کردەوەیانە و کردەوەی باشیانی ڕەت کردۆتەوە، کاتێکیش باسیان دەکەم وتوومە: هیوام وایە لەگەڵ ئەوانەدا نەبم!

ئەمەش بۆ ئەوەیە بەندە هیوا و ترسی هەبێ، تەنها هەر هیوای بە لێخۆشبونی خوا نەبێ و، لە ڕەحمەتی خوا نائومێد نەبێ.

ئەگەر وەسیەتەکانم بپارێزی، ئەوا هیچ نادیار و ونێك لەلات بە ئەندازەی مردن خۆشەویست نابێ، لەکاتێکدا بەرەو ڕووت دێ.

ئەگەر وەسیەتەکانیشم نەپارێزی، هیچ ونێك بە ئەندازەی مردن لەلات ڕقاوی نابێ، ناشتوانی لێی دەرباز بی!!)

ئەبوبەکر ڕەخنە لە شیعرەکەی عائیشە دەگرێ

لە کاتێکدا ئەبوبەکر لە گیانەلآ و ئازار و ناخۆشی مردندا بوو، عائیشە هاتە ژورەوە بۆ لای و ئەو وتەیەی شاعیری بۆ هێنایەوە کە دەڵێ:

لَعَمْرُكَ مَا يَغْنِي الثَّـراءُ عَنِ الفَتَى     إذا حَشْرَجَتْ يَوْمًا وَضَاقَ بِها الصَّدْرُ

ئەبوبەکر وەك کەسێکی تورە بۆی ڕوانی، پاشان پێی گوت: وەها مەڵێ، بەڵکو بڵێ:

﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ: لەهۆش خۆچونی گیانەلآ وا دیاری دا، هەر ئەمەشە کە نەت دەویست توشی بی.﴾ق/١٩.

عائیشە وتویەتی: ئەبوبەکرﷺ لەنێوان مەغریب و عیشادا کۆچی دوایی کرد.

دواوتەیەك ئەبوبەکرﷺ وتویەتی، ئەوەبو کە وتی:

(رب توفني مسلماً والحقني بالصالحين!: پەروەردگارم! بە موسڵمانی بم مرێنە و بم گەیەنە بە پیاوچاکان.)

کۆچی دوایی و نوێژ لەسەر کردن و ئەسپەردەکردنی ئەبوبەکر

کە کۆچی دوایی کرد، خێزانەکەی (ئەسمای کچی عەمیس)و(عبدالرحمن)ی کوڕیﷺ هەستان بە شۆرینی، ئەبوبەکر وەسیەتی بۆ (عائیشە)ی کچی، کرد کە لە تەنیشت پێغەمبەرەوەﷺ بنێژرێ.

جـا کاتــێ کۆچــی دوایــی کــرد گۆڕەکــەیان لــە تەنیــشت گــۆڕی پێغەمبەرەوەﷺ هەڵکەند، لە نوێژ لەسەرکردنیدا عومەری کوڕی خەتتاب پێشنوێژی موسڵمانانی کرد.

هەر یەکە لە عومەر و عوسمان و طەلحە و عبدالرحمنی کوڕی" هەڵیان گـرت بـۆ لای گۆڕەکـەی، سـەریان گەیانـدە لاشانی پێغەمبـەری خـواﷺ و کەمێك کردیانە دوای ئەوەوە.[1]

هەنـدێ وای بـۆ چـوون کـە ئەبوبـەکر بـەو ژەهـرە مـردووە کـە جولەکـە ژەهرخواردی کربێ.

دەڵێن بە کاریگەری ئەو ژەهرەوە مردوە، کە جولەکە دەرخواردیان داوە

ئیمامی (طەبەری) گوتویەتی: وتویانە بەهۆی ژەهر کردنە ناو برنجەوە کۆچی دوایی کردووە، دەشوترێ لەنێو شیری ئارداویدا دەرمانخواردیان کـردوە، کـە لەگـەڵ پزیـشکی ناسـراوی عـەرەب (حـارثی کـوڕی کیلـدەی ثـەقـەفی) خواردویـەتی، جـا کاتــێ (حـارث) لێـی خـواردوە زانیویـەتی ژەهراویـە، بۆیـە دەسـتی کێشاوەتەوەو بـە ئەبوبـەکری وتـوە: بەراسـتی خواردنێکی ژەهراویمان خوارد.. پاش ساڵێك هەردوکیان مردن.[2]

ڕای پەسەند ئەوەیە کە بە(تا) کۆچی دوایی کردووە

بـەڵام جـەماوەری مێژوونوسـان پـشت بـەم گێڕانەوەیـە نابەسـتن، بـەڵکو ڕایان وایە بەپێی گێڕانـەوەی یەکـەم بە کاریگـەری تـا مـردوە، کاتـێ کـە لـە ڕۆژێکی ساردا خۆی شۆریوە، بەوهۆیەوە تووشی (تا) هاتووەو پانزە ڕۆژ بەو تایەوە ماوەتەوە، پاشان لەدوای ئەوە کۆچی دوایی کردوە.

ئەمــەش ئــەو هەواڵەیــە کــە عائیــشە داویــەتی، ئێمــەش پــشت بــەم گێڕانەوەیە دەبەستین و مەیلمان بەلایدایە.

خوای گەورە لە ئەبوبەکر خۆش بێ و ڕازی بکات.

---

١ـ سەیری (الكامل في التأريخ)ی ئیبن ئەثیر بکە ٢: ٤٢٥–٤٢٧ بکە.

٢ ـ تأريخ الطبري ٣: ٤٢٢.

# تروسکی سێیەم

## عومەری کوڕی خەتتاب لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا

کۆبونەوەی ئەهلی حەل و عەقد بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە

لە تروسکەکانی پێشوودا وتمان ئەبوبەکری صدیقﷺ لە ڕۆژی سێشەممەی بیست و دووی مانگی (جمادي الآخرة)ی ساڵی سیانزەهەم کۆچی دوایی کرد و، (عومەری کوڕی خەتتابﷺ)یش هەستا بە نوێژ لەسەرکردنی و، لەهەمان ڕۆژدا ئەسپەردەی خاکیان کرد.

هەر لە هەمان ڕۆژی بەخاك سپاردنی ئەبوبەکردا ئەهلی حەل و عەقد لە هاوەڵە دیارەکان کۆبونەوە، کە لەناویاندا (عومەری کوڕی خەتتاب)ﷺ هەبوو، جا چاویان خشاندەوە بەو نامەی کە (ئەبوبەکر) بەر لەکۆچی دوایی بۆی نوسیبون بە مەبەستی (جێنشین کردن) یان (پاڵاوتن) کە عومەری تێدا پاڵاوتبوو بۆ ئەوەی لە دوای خۆی کاروباری موسڵمانان بەڕێوەبەرێ.

دان دەنرێ بە پاڵاوتنی ئەبوبەکر بۆ عومەر و لە هەمان ڕۆژی کۆچی دوایی ئەبوبەکر بەیعەتی پێ دەدرێ

هەر لە هەمان ڕۆژدا ئەهلی حەل و عەقد هەستان بە بەیعەت دان بە عومەر کە ببێتە ئەمیری بڕواداران، واتە پایەی (خەلافەت) هیچ کاتێك چۆڵ نەبوە، هاوەڵان زۆر بەخێرایی هەستان بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی مردنی ئەبوبەکر دروستی کردبوو، ئەوەش بە دانانی عومەر لەجێی ئەودا، هەروەك لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەری خواﷺ ئەنجامیان دا، کە لە هەمان ڕۆژدا بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکر.

سەرەتای خەلافەتی عومەرﷺ لە ڕۆژی سێشەممەی بیست و دووی (جمادي الآخرة)ی ساڵی سیانزەی کۆچی یەوە دەستی پێکرد.

کاتێك بەیعەتیان پێیدا، سەرکەوتە سەر دوانگە و پلەیەك هاتە خوار لەو پلەیەی کە ئەبوبەکری صدیق وتاری لەسەر دەدا و دەستی کرد بە وتار و گوتی:

یەکەم وتاری عومەر لە دوای خەلیفایەتیەکەی

(خودایە! من لاوازم، بەهێزم! من توند و ڕەقم نەرم و نیانم کەی، خودایە من ڕژد و ڕەزیلم، سەخی و چاوتێرم کەی..

قورئـان بخـوێنن ئاشـنای دەبـن، کـاری پێبکـەن قورئـان ویـست دەبـن، خۆتـان هەڵسەنگێنن پێش ئـەوەی هەڵسەنگێنرێن، خۆتـان بڕازێننـەوە بـۆ پیشاندانی گەورە(قیامەت)، ڕۆژێك پیشانی خوا دەدرێن، کە هیچ شتێکی لێ شـاراوە نیـە، بەراسـتی مـافی هـیچ مافـدارێك نەگەیشتوەتە ئاسـتێك کـە لەبێفەرمانی خوادا بەگوێی بکرێ.

ئاگادارین لـە راسـتیدا مـن لـەماڵی خـوادا، وەکـو سەرپەرشـتیاری مـاڵی هەتیو هەڵس و کەوت دەکەم، ئەگەر دەوڵەمەند بووم خۆمی لێ دەپارێزم، ئەگەریش هەژار بووم بەپێی پێویست و گونجاو(معروف) لێی دەخۆم).

وتارێکی تری، بەرنامەی خەلافەتی خۆی تێدا باس دەکات

دوای چەند ڕۆژێك لە بەیعەت پێدانی وتـارێکی تـری بـۆ موسـڵمانان دا، لە وتارەکەیدا هاتووە:

(پێم گەیشتووە خەڵکی لە توندیم سڵ دەکەنەوەو لە ڕەقیم دەترسن و، وتویانە لە کاتێکدا پێغەمبەری خواﷺ لەناوماندا بوو عومەر لەگەڵمان توند بوو، پاشان هەر توند بوو لەگەڵمان لە کاتێکدا ئەبوبەکر سەرپەرشتیارمان بـوو نـەك ئـەو، ئـەی دەبـێ کـار بەچـی بگـا کاتێـك هـەموو کاروبارەکـان لـە دەستیدایە؟!

ئـەوەی وای وتـوە راسـتی کـردوە؟ مـن کاتێـك لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا بوومﷺ، خزمەتکاری ئەوبووم، هیچ کەسێ لە نەرم و نیانی و بەزەیی ناگا بە ئەو، پێغەمبەر بەو شێوەیە بوو کە خوا فەرمویـەتی: ﴿بِـالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ: دڵسۆزی بڕوادارانە و دلۆڤانە﴾التوبـة/١٢٨،، جـا مـن لەبـەر دەسـتیدا شمـشێرێکی هەڵکێـشراو بـووم، جـا یـا دەیکـردم بـە کێلانـا یـا وازی لێ دەهێنام، بەردەوام لەگەڵ پێغەمبـەری خـواﷺ بەو شـێوەیە بووم تا کۆچی دوایی کرد و لەمن ڕازی بوو، زۆر سوپاسی خوا لەسەر ئەوە دەکەم و بەوە زۆر بەختیارم.

پاشان ئەبوبەکر بووە سەرپەرشتیاری موسڵمانان، بەشێوەیەك بوو هیچ کەس ئینکاری بەڵێن و بەخشین و نەرم و نیانیەکەی ناکا، من خزمەتکار و هاوکاری بووم، توندیەکەم بە نەرم و نیانیەکەی ئەو تێکەڵ دەکرد، دەبووم

بە شمشێرێكی هەڵكێشراو، یا دەیكردم بە كێلانا یا وازی لێ دەهێنام، بەردەوام بەو شێوەیە بووم لەگەڵی، تا خوای گەورە گیانی كێشا، ئەویش لەمن رازی بوو، زۆر سوپاسی خوا دەكەم لەسەر ئەوە، من بەوە زۆر بەختیارم!!

خەڵكینە! ئێستاش من كاروبارتانم گرتوەتە دەست، بزانن ئەو توندیە لاواز بووە، مەگەر لەسەر ستەمكار و دەستدرێژیكەر بۆ سەر موسڵمانان نەبێت، بەڵام بۆ دیندار و ئاشتیخوازان، لە هەندێكیان بۆ هەندێكی تریان نەرم و نیانترم!

لێ ناگەڕێم كەس ستەم لەكەس بكا، یا دەستدرێژی بكاتە سەر، تا رووی دەخەمە سەر زەوی و پێ دەخەمە سەر رووەكەی تری، تا ملكەچی هەق دەبێ، منیش پاش ئەو توندوتیژیە رووم دەخەمە سەر زەوی بۆ دەست و داوێن پاكان و چاوتێران.!!

خەڵكینە! چەند شتێك هەیە و مافی خۆتانە داوایان بكەن، بۆتانی باس دەكەم:

مافتان لەسەرمە هیچ باجێ نەخەمە سەر خەراج و دەستكەوتەكانتان، مەگەر لەڕێی خۆیەوە بێت، مافتان لەسەرمە ئەوەی دەستم دەكەوێ تەنها لەڕێی خۆیەوە سەرف بكرێ، مافتان لەسەرمە بەخشش و رۆزیەكانتان بەویستی خوا زیاد بكەم و، كەلێنەكانتان پڕ بكەمەوە و تووشی لەناوچوونتان نەكەم، كاتێكیش بۆ شوێنێك دەتاننێرم، من باوكی ماڵ و منداڵتانم تا دەگەڕێنەوە بۆ لایان..

بەندەكانی خوا، لەخوا بترسن، خۆتان هاوكاریم بكەن لەبەر خۆتان و منی لێ دووربگرن، هاوكاریم بكەن بە فەرمان بەچاكە و بەربەستی لە خراپە، ئامۆژگاریم بكەن لە كاروباری خۆتاندا كە خوا پێی سپاردووم، ئەم وتانە دەڵێم و داوای لێخۆشبون بۆ خۆم و ئێوە دەكەم!)

ماوەی خەلیفایەتی عومەر

عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بەیعەتی پێدرا، لە ڕۆژی سێشەممەی بیست و دووی (جمادي الاخرة)ی سیانزەی كۆچی بوو بە خەلیفە و لە ڕۆژی

چوارشـەممەی بیـست و شەشـی (ذو الحجـة)ی بیـست و سـێی کۆچـی شەهید کرا.

ماوەی خەلافەتی عومەرﷺ دە ساڵ و شەش مانگ و چەند ڕۆژێ بوو!

جـوانترین وتەیـەك دەربـارەی عومـەر و خەلافەتەکـەی وترابـێ، وتـەی (عبداللهی کوڕی مەسعودﷺ)ە، کە گوتویەتی: (ڕەحمەتی خوا لـە عومـەری کـوڕی خـەتتاب بـێ، ئیـسلام بونەکـەی ڕزگـارکردن بـوو، کۆچـکردنەکەی سەرکەوتن بوو، ئەمیرایەتیەکەی ڕەحمەت بوو!!

لە سەردەمی ئەودا ئیسلام چووە زۆربـەی وڵاتانی دەوروبـەی دورگـەی عەرەبییەوەو تەواوی وڵاتی شام و عێراق و میصر و فارس و ئەرمینیا و ئازەربیجان و جرجان و وڵاتی ئەوبەر روبار و تـەرابلس و بەرقـەی ئـەفریقیا ڕزگار کران.

سەردەمی عومەر بەربەستی فیتنە بوو

لەراستیدا خەلافەتی عومەر بەربەستێکی توندوتۆڵ بوو بەرامبەر فیتنە، خـودی خـۆی دەرگایـەکی داخـراو بـوو، فیتنەچـیەکان لـەژیانی ئـەودا نەیانتوانی بێنە ناویـەوە، فیتنـەش لەسـەردەمی ئەودا نـەیتوانی سـەر بڵند بکا!!

هەر کە عومەرﷺ شەهید بوو، بەربەستی فیتنە لاچوو، ئەو دەرگایـەی بەربەسـتی فیتنەچـیانی دەکـرد لەتێکـدانی ژیـان و کاروبـاری موسـڵمانان بەیەکـدا شـکا، بـاو بـۆرانی فیتنـەی سەرشـێت وەکـو دەریـا لـەدوای شەهیدبونی ئەوﷺ شەپۆلی دەدا.

گفتوگۆیەك لەنێوان عومەرو حوذەیفە دەربارەی فیتنە

با گوێبیستی ئەم گفتوگۆیە سـەیرەی نێوان عومـەری کوری خـەتتاب و حوذەیفەی کوڕی یەمان بینﷺ.

حوذەیفەی کوڕی یەمانﷺ گوتویەتی: ئێمە لە خزمەت عومـەری کـوڕی خەتتابدا بوینﷺ، گوتی:

کامتان فەرمودەی پێغەمبەری خوایﷺ لەسەر فیتنە لەبەرە؟

وتم: من لەبەرمە، وەکو ئەوەی فەرمویەتی.

گوتی: ڕەحمەت لەباوکت، دە بیهێنە، بەراستی چاونەترسی!

وتم: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دەیفەرموو: (مرۆڤ بەهۆی ماڵ و منداڵ و نەفس و ڕۆڵە و دراوسێیەوە توشی فیتنە دەبێ، ڕۆژوو و نوێژ و سەدەقە و فەرمان بەچاکە و بەربەستی کردنی خراپە دەیسڕێتەوە).

عومەر گوتی: مەبەستم ئەوە نیە، مەبەستم ئەو فیتنانەیە کە وەك دەریا شەپۆڵ دەدا.

شکاندنی دەرگا بە کوشتنی عومەر

وتم: ئەی ئەمیری بڕواداران! تۆ ئەوەت بۆ چیە؟ لەنێوان تۆ و ئەو فیتانەدا دەرگایەکی داخراو هەیە!!

گوتی: دەرگاکە دەشکێنرێ یان دەکرێتەوە.

وتم: نا، بەڵکو دەشکێنرێ!!

وتی: ئەمە ئەشێ تا هەستانی قیامەت هەرگیز دانەخرێ!!

(ئەبو وائیل) کە فەرمودەکەی لە حوذەیفەوە گێڕاوەتەوە، دەڵێ: لە حوذەیفەم پرسی: ئایا عومەر دەیزانی دەرگاکە کێیە؟

حوذەیفە گوتی: بەڵێ، هەروەك چۆن دەیزانن لەپاش سبەی شەوە، من فەرمودەیەکم پێ وتووە هەڵەی تێدا نیە!

(ئەبو وائیل) وتویەتی: سامان کرد لە حوذەیفە بپرسین دەرگاکە کێبوو؟ بە (مەسروق)مان وت: لە حوذەیفە بپرسە دەرگاکە کێبوو.

(مەسروق)یش بە حوذەیفەی وت: دەرگاکە کێیە!!

حوذەیفە پسپۆڕی زانستی فیتنەکان بوو

حوذەیفە وتی: عومەر بوو!!

لە ڕاستیدا حوذەیفەی کوڕی یەمان ﷺ لە (زانستی فیتنە)دا پسپۆڕ بوو، ئەم زانستەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ زیاتر لە هاوەڵانی‌تر شارەزا ببوو، هەر بۆیە بە عومەری دەگوت: من لەبەرم کردووە هەروەك خۆی فەرمویەتی.

عومەریش ئەمەی لە حوذەیفە دەزانی و ئاشنای بوەو ستایشی لەسەر دەکا بەوەی دەڵێ: ڕەحمەت لەباوکت، بەراستی چاونەترسی.

حوذەیفە هەواڵ بە هەڵقولانی فیتنە لەدوای کوژرانی عومەر دەدا

حوذەیفە زانیاری ئەوە بەعومەر ﷺ دەدات کە ئەو دەرگا داخراوەیە دەبێتە بەربەست لەڕێی هەڵقولانی فیتنە بۆ سەر موسڵمانان و دەبێتە ڕێگر

لێیان، ئەو دەرگا داخراوە بەشێوەیەکی سروشتی ناکرێتەوە، تا بتوانی بە ئاسانی دایبخەیتەوە، بەڵکو بە شکاندن دەشکێ و بەسەریەکدا تێك دەشکێ، ئەمەش مانای وایە لەدوای ئەو تا هەڵسانی قیامەت داناخرێ.
عومەر ئاوا تێگەیشتبوو، واتە فیتنە بەردەوام بەربلاّو و بە پەرش و بلاّوی دەمێنێتەوە، ناشتوانن لایدەن یا بیوەستێنن یا لەناوی بەن.

لێرەوە دان بەوەدا دەنێین کە حوذەیفە لەخۆیەوە ئەو شتانە ناڵێ و خۆی گریمانی ڕوودانیان ناکا، چونکە ئەو غەیب نازانێت.

لە ڕاستیدا حوذەیفە پسپۆڕی (زانستی فیتنە)یە، ئەمەشی لە پێغەمبەری خواوەﷺ بیستوەو هەروەك خۆی تێی گەیشتوەو پاراستویەتی، هەر بۆیە بە دواداچونێکی قسەکانی خۆی بۆ عومەر دەکا و دەڵێ: من فەرمودەیەکم پێ وتووی هەڵەی تێدا نیە.

واتە: فەرمودەیەکی ڕاستم پێ گوتوی، هیچ هەڵە و درۆیەکی تێدا نیە، چونکە بەڕاستی لە پێغەمبەری خوامﷺ بیستووە.

عومەر دەزانێ بەکوشتن دەمرێ

پاشان عومەریش ئەو ڕاستیە دەزانێ کە حوذەیفە هەواڵی پێداوە، ئەشزانێ خۆی ئەو دەرگایەیە لەبەرامبەر فیتنەدا دەشکێ.

واتە عومەر دەزانێ خەلافەتەکەی دەرگایەکی پتەوەو ناهێڵێ فیتنە لێوە هورژم کاتە سەر موسڵمانان و فیتنە لەناو خەلافەت و سەردەم و ژیانی ئەودا موسڵمانان داگیر ناکا.

هەروەها ئەوەشی دەزانی بە کوشتن دەمرێ و دوژمنەکانی دەتوانن بیکوژن و بەم شێوەیەش لەسەر دەستی ئەواندا بە شەهیدی دەگاتە دیداری پەروەردگاری، ئا لەو کاتەشدا فیتنە هورژم دەهێنێ بۆ موسڵمانان.

عومەر دەزانێ بە شەهیدبون دەرگاکە دەشکێ، ئەمەش مانای وایە سیستەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامی تا هەستانی قیامەت جێگیر نابێ.

ئەمەش لەدوای شەهیدبونی عومەر ڕوویدا، هەردوو خەلیفەی پاش خۆی (عوسمان و عەلی) شەهیدبون و هەردوو جەنگی (جەمەل)و(صفین) ڕوویان دا.

**پاشان دەستە و گرۆهە ئیسلامی و جیاوازیە سیاسیەكان بەدەركەوتن، كە تا ئێستاش موسڵمانانی هەراسان كردووە، ئێستاش بەردەوام سیستمی فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا بە شەهیدبونی عومەرﷺ شكاوەو كەلێنی تێكەوتووە، لەدوای ئەو دانەخراوە، تا ڕۆژی قیامەتیش داناخرێ!**

**ڕەحمەتی خوا لەو دوو هاوەڵە بەڕێزە (عومەری كوڕی خەتتاب)و(حوذەیفەی كوڕی یەمان) لەسەر ئەو گفتوگۆ سەیرەی نێوانیان!!**

**كەواتە عومەرﷺ لە پێغەمبەری خواوەﷺ دەیزانی كە بە كوشتن دەڕوا و بەشەهیدی دەگات بەدیداری پەروەردگاری.**

هەواڵدانی پێغەمبەر بە شەهیدبونی عومەر و عوسمان

**(ئەنەسی كوڕی مالیكﷺ) وتویەتی: جارێكیان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان سەركەوتە سەر شاخی ئوحود، شاخەكە كەوتە لەرزە، پێغەمبەری خواﷺ بە پێیەكانی دای بەسەر شاخەكەدا و فەرمووی: ((ئەی ئوحود جێگیربە، چونكە پێغەمبەرێك و راستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە)).**

**(عوسمانی كوڕی مەظعونﷺ) گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بە دەست ئاماژەی بۆ عومەر كرد و فەرمووی: ئەوە داخەری دەرگای فیتنەیە! پاشان فەرمووی: تا ئەمە لەناوتاندا بێ، بەردەوام دەرگای فیتنەتان لێ داخراوە!!!.**

**پاش دە ساڵ و نیو لە خەلافەتی پیرۆزی عومەر، كە موسڵمانان تیایدا پێشكەوتن و ئیسلام تیایدا بڵاوبویەوەو وڵاتانی تیادا رزگار بوو، موسڵمانان بەسەركەوتن و سەرفرازی و دەسەڵاتەوە بەختیار بون.**

**لەدوای هەموو ئەمانە كاتێ كۆتایی ئەم خەلیفە راشدیە هات و ئەجەل یەخەی گرت و بەشەهیدی گەیشت بە خوا.**

پاڕانەوەی عومەر لە دوا حەجیدا لە ساڵی ٢٣ی كۆچی

**جا لەگەڵ چەند دیمەنێكی لێدانەكەیدا دەژین و پاشان باس لە شەهیدبونەكەی دەكەین.**

**ئەمیری بڕواداران عومەرﷺ دوا حەجی لە ساڵی (٢٣)ی كۆچیدا**

بەئەنجام گەیاند، کاتێ لە مینادا بوو لە (أيام التشريق)دا، تەپۆڵکەیەی لەخۆڵ و وردەبەرد خڕکرد و بەرگەکەی دا بەسەریدا، پاشان لەسەری دانیشت و دوایی دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو بە پاڕانەوەوە وتی:

(پەروەردگارا! وا پیر و لاواز بووم و فەرمان بەردار و ڕەعیەتەکەم بڵاوبونەتەوە، بمبەرەوە بۆ لای خۆت، بێئەوەی پێشێلی مافێکم کردبێ یا کەمتەرخەمیم کردبێ، پەروەردگارم، داوای شەهیدبونی پێناوی تۆ دەکەم، مردنێك کە لەشاری پێغەمبەری خواداﷺ بێ).

لە ڕاستیدا عومەر دەیویست لە پێناوی خوا لەشاری پێغەمبەری خواﷺ شەهید ببێ، خوای گەورەش نزاکەی وەرگرت، ئەوەبوو پاش کەمتر لە دوو هەفتە لەم پاڕانەیەوە، عومەر بە شەهیدی بە دیداری خوا گەیشت.

خەونێکی ئەبوموسای ئەشعەری دەربارەی کۆچی دوایی عومەر

کەمێك پێش شەهیدکردنی عومەر، (ئەبوموسای ئەشعەریﷺ) خەونێکی بینی و گوتی: چەند ڕێگەیەکم لەپێش خۆمەوە بینی، پاشان هەموو ڕێگاکان ون بون و لاچوون، تەنها ڕێگەیەکیان مایەوە، پێیدا ڕۆیشتم، تا گەیشتم بە شاخێك، بینیم وا پێغەمبەری خواﷺ لەسەرەوەی شاخەکەدا بوو، لە تەنیشتیەوە ئەبوبەکر بوو، پێغەمبەری خواﷺ ئاماژەی بە عومەر دەکرد: وەرە بۆ لامان.. ئینجا بەخەبەر هاتم..

پاشان وتم: انا لله وانا اليه راجعون، ئەمیری بڕواداران مردووە.

(ئەنەسی کوڕی مالیك) گوتی دەربارەی خەونەکەت بۆچی کاغەزێ بۆ عومەر نانێری؟ هەردوکیشیان ئەوکاتە لەعێراق بون.

ئەبوموسا گوتی: من هەواڵی مردنی خۆی پێ نادەم.!!

دوا وتاری هەینی عومەر لە مەدینە

کاتێ عومەر لەدوا حەجی گەڕایەوە مەدینە، دوا وتارێکی دا لە مەدینە، عبدالرحمنی کوڕی عەوف هەندێ لە وتەکانی ئەو وتارەی عومەرمان بۆ باس دەکا کە لە وتاری هەینی ٢١ی (ذي الحجة)ی ساڵی ٢٣ی کۆچی داوێتی.

ئەو وتەیەی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)مان باس کرد، کاتێ کە باسی چۆنێتی هەڵبژاردنی (ئەبوبەکری صدیقﷺ)مان لە (تروسکە

مێژووییەکە)ی پێشوودا کردا

عومەر خۆیشی باسی خەونێك بۆ موسڵمانان دەکا کە بینیویەتی و هەر خۆیشی بۆیان لێك دەداتەوە.

خەونی عومەر بەوەی کەڵەشێر دەنوکی لێدەدا

هەر لە هەمان وتار گوتویەتی: من خەونێکم بینیوە، تەنها ئامادەبونی مەرگی لیّ دەخوێنمەوە، بینیم وەك ئەوەی کەڵەشێرێك دوو دەنوکی لێم دا!!

هەندیّ کەسیش فەرمانم پیّ دەکەن کە کەسێك بکەم بە جێنشین و خەلیفەی دوای خۆم دیاری بکەم!!

لە ڕاستیدا خوای گەورە ئاین و خەلافەت و بەرنامەی پێغەمبەرەکەی تێك نادا.

جا ئەگەر خێرا شتێکم بەسەرهات، ئەوا خەلافەت بەراوێژ دەبیّ لەنێوان ئەو شەش کەسەدا کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد و لێیان ڕازی بوو!

پێش شەهیدبونی بە چوار ڕۆژ، واتە ڕۆژی یەکشەممەی ٢٣ی (ذي الحجة) چاوی کەوت بە هەردوو هاوەڵان حوذەیفەی کوڕی یەمان و سەهلی کوڕی حەنیفﷺ، حوذەیفەی کردە لێپرسراوی ئەندازەگیری باجی ئەو زەوییانەی بە ئاوی ڕوباری دیجلە ئاو دەدران و (سەهلی کوڕی حەنیف)یشی کردە لێپرسراوی ئەندازەگیری باجی ئەو زەویانەی بە ئاوی فورات ئاو دەدران. پێشی گوتن: چیتان کرد؟ دەترسم شتێکتان لەسەر ئەو زەویانە دانابیّ کە لەتوانادا نەبیّ.

وتیان: بەپێی توانا کاروبارمان ڕێکخستووە! (ئەوەندەمان لەسەر داناوە کە لەتوانایدایە).

عومەر گوتی: گەر خوا ساغ و سەلامەتم بکا، شتێك بۆ بێوەژنەکانی عێراق دابین دەکەم کە دوای خۆم هەرگیز پێویستیان بەهیچ پیاوێکی تر نەبیّ!!!

عومەر ڕێی نەدەدا گیراوەکانی شەڕ لە مەدینەدا نیشتەجیّ بن

بەڵام لە ڕۆژی چوارەمی ئەم گفتوگۆیەی نێوانیاندا لێی درا.!!

عومەرﷺ ڕێی نەدەدا گیراوەکانی وڵاتانی ڕزگارکراو بێنە (مەدینەی منورە) پایتەختی دەوڵەتی خیلافەت، هەر بۆیە ڕێگری دەکرد لە

ئاگرپەرستەکانی عێراق و فارس و گاورەکانی شام و میصر کە لە مەدینەدا بمێننەوە، مەگەر موسڵمان بن و بێنە ناو ئەم ئایینەوە.

ئەم هەڵوێستەی عومەر لە هەڵوێستە جوان و بەرچاوڕۆشنیەکانی بوو، چونکە ئەوانە لە قەومە شکست خواردوو و سەرنەکەوتوەکان بون، بەرامبەر ئیسلام کینە لەدڵ بون و بەرامبەر موسڵمانان رق ئەستور بون، هەر بۆیە لەسەر پیلان دانان بۆ موسڵمانان و فێڵ کردن لە ئیسلام سوور دەبن!

بونیشیان لە پایتەختی خەلافەتدا فرت و فێڵ و پیلانەکانیان بۆ ئاسان دەکا، بەرهەڵستی و ڕێگری کردنی لە نیشتەجێ بونیان لە مەدینە بۆ ئەوە بوو تا موسڵمانان لە زیانیان بپارێزێ.

هەندێ هاوەڵ داوای هێنانی کۆیلەکانیان دەکرد بۆ مەدینە

بەڵام هەندێ هاوەڵ لەو گیراوانەی شەڕدا بەندە و کۆیلەیان هەبوو، چ گاور بوبێتن یان ئاگرپەرست، هەندێکیان زۆر داوایان لە عومەر دەکرد کە مۆڵەتیان بدا، بۆ ئەوەی هەندێ لەو بەندە و کۆیلە ژێردەست کراوانە لە مەدینەدا نیشتەجێ بکەن، بۆ ئەوەی لە کاروبارەکانیاندا پشتیان پێ ببەستن، عومەریش لەگەڵ پێناخۆشبونیدا مۆڵەتی بە هەندێکیان دەدا لە مەدینە نیشتەجێ بن.

ئەوەی عومەر لێی دەترسا و پێشهاتی ڕوودانی کردبوو ڕوویدا..

پیلانی تیرۆرکردنی عومەر و پیلانگێڕان

چەند کەسێك لەو دوابڕاوە قین لەدڵانەی لە مەدینەدا نیشتەجێ بون، پیلانێکیان بۆ ئەمیری بڕواداران ڕێکخست، ڕێککەوتن لەسەر کوشتنی، لەبەر ئەوەی دەوڵەتەکانیانی لەناو بردبوو و هێز و تواناکانیانی نەهێشتبوو!

تیرۆرکردنی عومەرﷺ پیلانێکی ستەمکارانە بوو، هەرسێ لایەنی جولەکە و گاور و ئاگرپەرست هاوبەشیان تیادا کرد.

پیلانگێڕەکان چواربون:

هورموزانی فارسی

١- (هورموزان): فارسیەکی ئاگرپەرست بوو، پاشای ئەهواز بوو، یەکێك بوو لە گەورە سەرکردەکانی فارسی لە جەنگەکانیان دژ بە

موسڵمانان لە جەنگی قادسیەدا و لە پێش و پاشی جەنگەکەدا. خوای گەورە بەدەستی موسڵمانە تێکۆشەرەکان لە جەنگی (تەستور)دا لە ئەهواز تێکی شکاند و، ئەمیان دەستگیر کرد و بەدیلی لە ساڵی ١٨ی کۆچیدا ڕەوانەی مەدینەیان کرد، پاش ئەوەی لەلایەن عومەرەوە ئەمانەتی پێدرا، لە مەدینە مایەوەو نیشتەجێ بوو.

کەعبی ئەحبار

٢- (کەعبی ئەحبار): لە جولەکەکانی یەمەن و لە زاناکانی جولەکەی ئەوێ بوو، زانابوو بە تەورات.

ئەبولوئلوئەی ئاگرپەرست

٣- (ئەبو لوئلوئەی فەیروز): بەندەی (مغیرەی کوڕی شوعبە) بووﷺ، کە لە جەنگی فارسەکاندا گرتبووی، فارسێکی ئاگرپەرست بوو، ببوە بەندەو کۆیلە لە یەکێك لە جەنگەکانی فارسی و موسڵماناندا، کاتێکیش بەندە کۆیلەکان بەسەر موجاهیدەکاندا دابەش کران، ئەو وەبەر بەشی (موغیرەی کوڕی شوعبە) کەوت.

(ئەبولوئلوئە)ەی ئاگرپەرستی فارسی پیشەکار و ئاسنگەرێکی شارەزابوو، ئامرازە ئاسنینەکانی بە شارەزایی و وردکاریەوە دروست دەکرد.

(مغیرەی کوڕی شوعبە) زۆر پێی داگرت لەسەر عومەر بۆ ئەوەی (ئەبو لوئلوئە) لە مەدینەدا نیشتەجێ بێ تا موسڵمانان سودی لێ ببینن، چونکە ئاسنگەر و دارتاش و نەخشەساز و پیشەکار بوو، (موغیرە)ش لە دەست هات و ماڵەکەی سودمەند دەبێ چونکە کۆیلەی ئەوە! عومەریش مۆڵەتی پێدا.

جوفەینەی ڕۆمی

٤- (جوفەینە): بەندە و کۆیلەیەکی گاوری ڕۆمی بوو، لە گیراوەکانی ڕۆم بوو لە ڕزگارکردنی شامدا، بوو بە کۆیلە و بەشی یەکێك لە موسڵمانەکان و لە مەدینەدا نیشەجێ بوو.

ئەم چوارە، پیلانیان بۆ کوشتنی عومەرﷺ دانا.

قسەی کەعبی ئەحبار بۆ عومەر

(کەعبی ئەحبار) هەواڵی بە عومەری کوڕی خەتتاب دا کە ئەجەلت نزیك بۆتەوە و نزیکە وەفات بکەی، گوایە ئەمە لە تەورات باسکراوە!

(سەعدی جاری)-بەندەی ئازادکراوی عومەری کوڕی خەتتاب-

وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب دەچێت بۆ لای خێزانەکەی (ئوم کەلثومی کچی عەلی کوڕی ئەبوطالب)، دەبینێ دەگری، پێی دەڵێ: بۆچی دەگری؟

گوتی: (کەعبی ئەحبار)ی جولەکە دەربارەت دەڵێ عومەر لەسەر دەرگاکانی دۆزەخە!

عومەر پێی گوت: ماشاء الله! بەخوا ئومێدم بەخوای گەورەیە بە بەختیاری دروستمی کردبێ.

پاشان عومەر (کەعبی ئەحبار) بانگ دەکا، کاتێك کە دێتە لای، کەعب دەڵێ: ئەی ئەمیری بڕواداران، پەلەم لێ مەکە، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، ئەم مانگی (ذي الحجة)یە تەواو نابێ تا تۆ دەچیتە بەهەشتەوە.

عومەر پێی گوت: ئەمە چیە؟ جارێك دەمکەیتە دۆزەخی و جارێك دەمکەیتە بەهەشتی؟!

کەعب وا هەڵدەبەستێ کە عومەر ناوی لە تەوراتدا هاتوە

ئەویش وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، بەخوا ئێمە لە تەوراتی کتێبی خوادا دەبینین، تۆ لەسەر دەرگایەك لە دەرگاکانی دۆزەخ دای، بەربەستی لە چوونەناوەوەی خەڵکی دەکەی، کاتێ کە دەشمری خەڵکی دەچنە ناویەوە.

کەعبی ئەحبار هەواڵ بەعومەر دەدا کە لەدوای سێ ڕۆژ شەهید دەبێ

پاشان پێی وتوە: ئەمیری بڕواداران! وەسیەتی خۆت بکە، ئەوەی دەتەوێ دەستنیشانی بکە، بەراستی تۆ پاش سێ ڕۆژی تر دەمری!!

عومەر بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: تۆ چۆن ئەوە دەزانیت؟!

وتی: ئەوە لە تەوراتی کتێبی خوادا بینیومە.

عومەر پێی وت: الله، الله، ئایا عومەری کوڕی خەتتاب لە تەوراتدا دەبینی؟!

کەعبی ئەحبار وتی: نەخێر، بەڵکو کارەکانت دەبینم، تیاشیدا دەبینم کە تەمەنت تەواو بووەو ئەجەلت هاتوە!!

لە ڕۆژی دووەمدا (کەعبی ئەحبار) هات بۆ لای عومەر و پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، ڕۆژێك ڕۆیی و تەمەنت دوو ڕۆژی ماوە!

لە ڕۆژی دواتر (کەعب) هاتە لای (عومەر)وتی: دووڕۆژ ڕۆیی و یەك ڕۆژ تەمەنت ماوە!!

لەکاتی بەیانی ڕۆژی چوارەمدا عومەر لە میحرابدا پێکرا!!

ئەم دیاریکردنە یەك لەدوای یەکەی (کەعبی ئەحبار) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەپیلانی تیرۆرەکە ئاگادار بووە و، بەشدار بووە تیایدا و، کاتی جێبەجێکردنەکەشی زانیوە و، ویستویەتی خۆی بەسەر عومەر و موسڵماناندا بە زانا نیشان بدا و وا هەڵبەستێت کە ئەمە لە تەوراتدا هاتوە!!

ئەبولوئلوئە سکاڵا لەسەر موغیرە دەباتە بەردەم عومەر

پێش تیرۆرکردنی عومەر، (ئەبولوئلوئەی فەیروز)ی فارسی هاتبوە لای عومەر و لە (مغیرە) سکاڵای کردبوو، (مغیرە) داوای لێکردبوو هەر ڕۆژێ لەبری ئەو ئامرازی ئاسن و ئاشانەی دروستی دەکات چوار درهەمی پێ بدا.

(ئەبولوئلوئە) وای دەزانی ستەمی لێکراوە و، (موغیرە) بەکاری دەهێنێ و ستەمی لێ دەکات و ماڵێکی زۆری لێ دەستێنێت، کە بریتیە لە چوار درهەم لە ڕۆژێکدا!.

گفتوگۆیەکی نێوان عومەر و ئەبولوئلوئە

ئەبولوئلوئە بە عومەری وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، لە ڕاستیدا (موغیرە) سەربارمی قورس کردوە، دیارە ماڵێکی زۆرم لێ وەردەگرێ، قسەی لەگەڵ بکە تا لە سەرم سوك بکا.

عومەر پێی وت: تۆ چ کارێ باش دەزانی؟

ئەویش هەموو ئەو کارانەی کە دەیکرد لە ئاسنگەری و دارتاشی و نەخشەسازی هەموو باسکرد.

عومەر پێی وت: خۆ (مغیرە) ماڵێکی زۆری لێت داوا نەکردووە، لەخوا بترسە، لەگەڵ گەورەکەت باش بە.

لەنیازی عومەردا بوو کاتێ کە چاوی بە (موغیرە) بکەوێت لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکا و، داوای بارسوك کردنی (ئەبولوئلوئە)ی لێبکا.

(ئەبولوئلوئە) بە توڕەییەوە ڕۆی و دەیوت: دادگەری عومەر جگە لەمن

هەموو خەڵکی گرتۆتەوە، لەگەڵ مندا دادگەر نەبوو.

ئەبولوئلوئەی دوابڕاوەی قین لەدڵ

(ئەبولوئلوئە) دوابڕاوەیەکی قین لەدڵ بوو، بەتایبەت لەسەر خودی عومەر، چونکە لە خەلافەتەکەی ئەودا مسوڵمانان سەرکەوتن لە تێك و پێکدانی دەوڵەتی فارسی.

کاتێ (ئەبولوئلوئە) لەمەدینەدا منداڵی گیراوی ئاگرپەرستەکانی دەبینی، دەستی بەسەردا دەهێنان و دەگریا و دەیوت: عومەر جەرگمی بڕیوە!!!

لەپاش ئەو وتوێژەی نێوان خۆی و عومەر لەناخی خۆیدا بڕیاری کوشتنی دا.

ڕێکەوتنی ئەبولوئلوئە لەگەڵ هورموزان لەسەر کوشتنی عومەر

(ئەبولوئلوئە) خەنجەرێکی دووسەری دروست کرد، کە زۆر تیژ بوو، نیازی کوشتنی عومەری هێنا، چوو بۆ لای (هورموزان)وخەنجەرەکەی پیشان دا و پێی وت: ئەمە چۆن دەبینی؟

هورموزان وتی: لەهەر کەسێکی بدەی یەکسەر کوشتوتە.

ڕۆژێك عومەر لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵان بەناو مەدینەدا دەڕۆی، لەرێگەدا (ئەبولوئلوئە)ی پێ گەیشت.

عومەر پێی وت: بیستومە وتوتە: ئەگەر بمەوێ ئاشێك دروست بکەم کە بە ئاوی دێراو کار بکات.!

ئەبولوئلوئە هەڕەشە لە عومەر دەکا

(ئەبولوئلوئە) بە تووڕەیی و قین و مۆنیەوە وەڵامی دایەوە و وتی: ئاشێکت بۆ دروست دەکەم دەنگ بداتەوە کە خەڵکی قسەی لەسەر بکەن!!

عومەر بەو هاوەڵانەی لەگەڵی بون گوتی: ئەم بەندەیە هەڕەشە و گوڕەشەم لێ دەکا!!

عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکر هەرسێ پیلانگێڕەکان پێکەوە دەبینێت

سێ لە پیلانگێڕەکات کۆببونەوە" هورموزان و ئەبولوئلوئە و جوفەینە، لە چۆنێتی جێبەجێکردنی پیلانەکە و تیرۆرکردنی عومەریان دەکۆڵیەوە، (ئەبولوئلوئە) ئەو خەنجەرەی پێبوو کە بۆ تاوانەکەی ئامادەی کردبوو.

لەکاتێکدا ئەم سیانە کۆببونەوە، (عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکری صدیق ﷺ) بەلایاندا تێپەڕی، کاتێ کە بینیان ترس و بیم گرتیانی،

لەپێشدا لەسەر زەوی دانیشتبون، بۆیە بە ترسێكەوە كەوتنە خۆیان و هەستانە سەر پێ، (ئەبولوئلوئە) ئەو خەنجەرەی كە پێی بوو لەدەستی كەوتە خوارەوە، هەر ئەو خەنجەرەش بوو كە پاشتر دای لە عومەر!!

پێكرانی عومەر لە بەیانی ڕۆژی چوارشەممەی ٢٦ی ذیالحجة

(ئەبولوئلوئە) پیلانەكەی جێبەجێ كرد، لە بەیانی ڕۆژی چوارشەممەی ٢٦ی ذي الحجة ٢٣كۆچی بە خەنجەرە ژەهراویە دووسەرەكەی دای لە عومەر.

با لێگەڕێین یەك لە ئامادەبوانی ڕوداوە دڵتەزێنەكە، درێژەی ڕوداوەكەمان بۆ بگێڕێتەوە:

عەمری كوڕی مەیمون ڕوداوەكە دەگێڕێتەوە

(عەمری كوڕی مەیمونی ئەودی)-ڕەحمەتی خوای لێبێ- دەڵێ:

ڕۆژی لێدرانەكەی ئاگام لە عومەر بوو، ئەوەی وای كرد كە لە ڕیزی یەكەمی پێشەوەدا نەبم سامی عومەر بوو، عومەر پیاوێكی سامدار بوو، من لە ڕیزی دووەمدا بووم، لەنێوان من و عومەردا (ئیبن عەباس) هەبوو، واتە عەمر لە ڕیزی دووەمدا بووە و ئیبن عەباس لە ڕیزی یەكەمدا، ڕاستەوخۆ لەدوای عومەرەوە بووە.

كاتێ كە قامەتی نوێژی بەیانی كرا، عومەر لە میحرابەكەیدا وەستابوو.

عەمری كوڕی مەیمون وتویەتی: كاتێ كە قامەت بۆ نوێژدەكرا، عومەر بەنێو ڕیزەكاندا هات و چۆی دەكرد و دەیوت: ڕێك ڕاوەستن.. ڕووی لە خەڵكەكە دەكرد و سەیریانی دەكرد.. ئەگەر پیاوێكی ببینیایە لە پێشتر بوایە یا لە دوابوایە ڕێكی دەخستە، پاشان پێش دەكەوتە میحرابەكە و (الله اكبر)ی دەكرد.

لەنوێژی بەیانیدا جاری وا هەبوو لە ركاتی یەكەمدا سورەتی (یوسف) یا (نحل)ی دەخوێند تا خەڵكی كۆببنەوە و بەنوێژەكە ڕابگەن.

لە ڕۆژی ڕوداوەكەدا، قامەتی نوێژ كرا، عومەر سەیرێكی خەڵكی دەكرد بۆ ڕێكخستنی ڕیزەكانیان، لەدوایەوە ڕاستەوخۆ (عبداللهی كوڕی عەباس)و(عبدالرحمنی كوڕی عەوف) هەبونﷺ، (ئەبولوئلوئە) هاتە ژورەوە و خەنجەرە ژەهراویەكەی پێبوو..

عومەر لە (الله اکبر)ی ئیحرامدا لێی درا

**عومەر بە (الله اکبر) نوێژی دەست پێکرد، نوێژکەرانیش لەدواوە (الله اکبر)یان کرد و چوونە ناو نوێژەوە.**

**پێش ئەوەی دەست بە خوێندنی سورەتی (فاتیحە) بکا، (ئەبولوئلوئە) لەنێو ریزی نوێژکەراندا بۆی دەرچوو، بە خەنجەرە ژەهراویەکەی سێ خەنجەری قوڵی لێدا، یەکێکیان لە شانی و دوانەکەی تریان لە کەلەك و سکی.. لێدانەکەی سکی بڕەر بوو.**

**عومەر گوتی: سەگەکە کوشتمی، یا سەگەکە خواردمی!!**

**عومەر بەهۆی بەهێزی لێدرانەکەی کەوتە سەرزەوی و خوێنەکەی بەخوڕ لێی دەڕۆیشت، لەوکاتەدا عومەر ئەم فەرمودەیەی خوای گەورەی دەخوێند ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا: خوا بەهەرچی فەرمان بدا-بێ زیاد و کەم- دەبێ بکرێ.﴾**الأحزاب:٣٨.

ئەبولوئلوئە لە سیانزە نوێژکەری تر دەدا و پاشان خۆی دەکوژێ

**(ئەبولوئلوئە) دوای ئەوەی بە خەنجەرەکەی لە عومەری دا، دەستی کرد بە لێدانی ئەو نوێژکەرانەی کە لەناو نوێژدا بون، بەلای ڕاست و چەپدا لێی دەدان، لەو لێدانانەدا سیانزە پیاو بەرکەوتن و حەوتیان شەهید بون!!**

**کە (عبدالرحمنی کوڕی عەوف**ﷺ**) ئەو دیمەنە دڵتەزێنەی بینی، بەکارێکی زیرەکانە هەستا، جلێکی گەورەی فڕێدایە سەر (ئەبولوئلوئە) تا پەل بەست بکرێت!!**

**کە (ئەبولوئلوئە) خۆی لەناو بەرگەکەدا دیتەوە و، زانی دەستگیر دەکرێ و ناتوانێ ڕابکات، یەکسەر بە خەنجەرەکەی خۆی کوشت!!**

**(عەمری کوڕی مەیمون) گێڕانەوەی ڕوداوەکە تەواو دەکات:**

عبدالرحمنی کوڕی عەوف نوێژی بەیانی تەواو دەکات

**پاشان عومەر دەستی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ی گرت کە لە پشتیەوە بوو، پێشی خست تا نوێژەکە تەواو بکات، (عبدالرحمن) پێشکەوتە میحرابەکە.**

**ئەوانەی لە پشت عومەرەوە بون ڕوداوەکەیان بینی، پێکرانی عومەر و سێزدە پیاوەکە و کوژرانی (ئەبولوئلوئە)یان بینی.**

بەڵام ئەوانەی لە لایەکانی تری مزگەوتدا بون نەیانزانی چی رویداوە، کاتێك عومەر دوای (الله اکبر)ی ئیحرام (فاتیحە)ی نەخوێند، دەستیان کرد بە وتنی (سبحان الله، سبحان الله).

(عبدالرحمن) پێشکەوت، نوێژێکی زۆر سوکی بە نوێژکەران کرد و تیایدا کورتترین دوو سورەتی قورئانی خوێند.

(عبدالرحمن)وموسڵمانان نوێژیان کرد، ئەگەر چی پێشەواکەیان لە میحرابەکە بەبریندراری کەوتبوو، بەڵام نوێژی بەیانیان پێش فریاکەوتنی ئەمیری بڕواداران خست، چونکە کاتەکەی زۆر تەسکە!!!

عومەر نوێژی بەیانی کرد و برینەکەی خوێنی لێ دەچۆڕا

(عبدالله‌ی کوڕی عومەر)ﷺ دەڵێ: عومەر لەهۆش خۆی چوو، هەتا ڕۆژ زەرد بوو، خەریك بوو ڕۆژ هەڵبێت، ئەویش نوێژی بەیانی نەکردبوو.

وتیان: بەهیچ شتێك ناتوانن بەخەبەری بێنن، مەگەر بە بیرخستنەوەی نوێژ نەبێت، جا ئەگەر ژیانی تێدا مابێت بەخەبەر دێت.

وتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران، نوێژ، نوێژ!

عومەر لە لەهۆشخۆچونەکەی بەئاگا هاتەوەو گوتی: بەڵێ، بەخوا نوێژ، هەرکەسێ وازی لێ بێنێ ماف و بەشی نیە.!

تەماشای دەموچاوی کردین و گوتی: خەڵکەکە نوێژیان کرد؟

وتم-ئیبن عەباس-: بەڵێ ئەمیری بڕواداران.!

گوتی: ئیسلام بۆ کەسێك نیە واز لەنوێژ بێنێت!!

جا هەر لە میحرابەکەدا ئاویان بۆ هێنا، دەستنوێژی شۆری و بەر لە ڕۆژهەڵات نوێژی بەیانی کرد و، برینەکەشی خوێنی لێ دەچۆڕا.

عومەر، ئیبن عەباس رادەسپێرێت تا بزانێ بکوژەکە کێیە

عومەر دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، بە ئیبن عەباسی گوت: بڕۆدەرەوە بزانە کێ منی کوشت؟

(ئیبن عەباس) وتویەتی: پرسیارم لە خەڵکە کۆمەڵبوەکە کرد: کێبوو لە ئەمیری بڕوادارانی دا؟

وتیان: (ئەبولوئلوئەی ئاگرپەرست)ی دوژمنی خوالێی دا، کە کۆیلەی (موغیرەی کوڕی شوعبە)یە، لەگەڵ ئەوا لە ژمارەیەك موسڵمانی تریشی

داوەو پاشان خۆی كوشتوە!!

(ئیبن عەباس) وتویەتی: گەڕامەوە، عومەریش هەر تەماشای دەكردم، وەك ئەوەی بلێ دواكەوتی و لەسەرخۆ هاتیەوە.

پێم وت: كۆیلەی (موغیرەی كوڕی شوعبە) بوو!

گوتی: پیشەسازەكە؟ وتم: بەڵێ.

گوتی: خودا بیكوژێ، خۆ من فەرمانم دابوو لەگەڵی چاك بن، سوپاس بۆخوا مردنم بەدەستی كەسێك نەبوو خۆی بە ئیسلام دابنێ، سوپاس بۆ خوا بكوژەكەم كەسێك نیە بە تەنها سوژدەیەكیش لای خوا بیانو بهێنێتەوە!!

عومەر لۆمەی ئیبن عەباس دەكات

پاشان پێی وتم: خۆت و عەباسی باوكت حەزتان دەكرد مەدینە پڕبێت لە كافرەكانی ڕۆم و فارس!

پێم وت: ئەگەر حەزدەكەی هەر ئێستا هەمویان دەكوژین!

گوتی: ئێستا دەیانكوژن، دوای ئەوەی بە زمانی ئێوە قسە دەكەن و نوێژی ئێوە دەكەن و حەجی ئێوە ئەنجام دەدەن؟؟!!

پاشان عومەر لە میحرابەوە بەرەو ماڵەكەی هەڵگیرا و برینەكەشی هەر خوێنی لێ دەچۆڕا.

عومەر داوا لە ئیبن عەباس دەكات بزانێ ڕای موسڵمانان دەربارەی عومەر چۆنە

عومەر ویستی لەوە دڵنیا بێت كە موسڵمانان بە كوشتنی ئەو ڕازی نین و ئەوان لێی ڕازین و، لێی توڕە نین و ڕقیان لێی نابێتەوە.

(عبداللهی كوڕی عومەر) گوتویەتی: كاتێ لە باوكم درا، ترسا تاوانێكی موسڵمانانی لەسەر بێ و پێی نەزانێ، هەر بۆیە (عبداللهی كوڕی عەباس)ی بانگ كرد -كە خۆشی دەویست- پێی گوت: پێم خۆشە ئاگادارم كەی لە حاڵ و باری موسڵمانان.

(ئیبن عەباس) چووە دەرەوە، ڕاپرسی دەربارەی پێكرانی ئەمیری بڕواداران لە خەڵك دەكرد!

هەموویان وتیان: بەخوا هەر هەموومان ئاواتەخواز بووین خوای گەورە لە تەمەنی ئێمە هەڵگرێ و بیخاتە سەر تەمەنی ئەمیری بڕواداران!

**جا گەڕایەوە لای عومەر و پێی وت: بەلای هەر کۆمەڵێکدا هاتبێتم دەگریان، وەك ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆڵەکانی خۆیانیان لەدەست چووبێ!**

**کاتێك لە چێشتەنگاوی ڕۆژی چوارشەممەدا عومەر لەماڵی خۆی دانرا، موسڵمانان لەگەڵیدا چوونەوە بۆماڵ، وەك ئەوەی لە پێشدا هیچ کات تووشی موسیبەت نەبوبێتن!**

**لە دیاریکردنی چۆنێتی پێکرانەکەی و ئەندازەی مەترسی برینەکەی جیاواز بون، هی وایان هەبوو دەیوت: هیچ نیە و برینەکەی سوکە.**

**ئەوانی تر دەیانوت: پێکرانەکەی ترسناکە و دەترسین بمرێ!**

پزیشك دەستنیشانی ترسناکی پێکرانی عومەر دەکات

**پزیشکیان هێنا تا سەیری برینەکەی بکا، کاتێ پزیشکەکە هات، گوشراوی خورمای پێدا-کە بریتی بوو لە دەنکەخورما و لەناو ئاودا خوسابوو تا تامەکەی شیرین بێت، نەك ئەو بادەیەی سەرخۆشکەرەو لە شەرعدا حەرامە-، گوشراوی خورماکە وەکو خۆی و بە پوختی لە بۆشایی سکیەوە دەردەچوو!! پاشان شیری پێدا، بەهەمان شێوە وەکو خۆی لە بۆشایی سکیەوە دەردەچوو!!**

**پزیشکەکە زانی لێدانەکەی بڕەرە و پێکرانەکەی ترسناکە، بە عومەری وت: چ سپاردەیەکت هەیە بیکە، چونکە تۆ دەمری!**

**عومەر گوتی: پزیشکەکە ڕاستی لەگەڵ وتم، ئەگەر جگە لەوەی بوتبایە درۆی لەگەڵ دەکردم!**

**کاتێ دەوروپشتەکەی ئەوەیان بیست گریان، عومەر نەیهێشت بگرین و پێی وتن: بەسەرماندا مەگرین، ئەوەی دەگریێ با بچێتە دەرەوە!**

موسڵمانان سەردانی عومەر دەکەن

**موسڵمانان چوونە لای عومەر و سەریان لێدەدا و دڵیان دەدایەوەو خواحافیزیان لێی دەکرد و ستایشی کردەوەی چاکی ئەویان دەکرد.**

**لاوێکی موسڵمان هاتە خزمەتی و پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! مۆژدەم پێ بدە، چونکە خوا مۆژدەی پێداوی، تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایﷺ، وەك خۆشت دەزانی، جێپێت لە ئیسلامدا دیارە، سەرپەرشتیاریت کرد و دادگەر بووی، وا ئێستاش لەپێناوی خوا**

شەهادەت بەدەست دەهێنی!!

عومەریش پێی گوت: ئاواتەخوازم ئەوەندە بەسم بێ، بە مایەی خۆم دەرچم.

عومەر ئامۆژگاری لاوێکی موسڵمان دەکات

کاتێ لاوەکە هەستا و کۆڕەکەی بەجێ هێشت، عومەر بۆی ڕوانی، بینی جلەکانی شۆڕە و لە زەوی دەخشێ، (عومەر) بانگی کرد، کاتێ لەبەرامبەری وەستا پێی گوت: کوڕی برام، جلەکەت بەرزکەوە، ئەوە بۆ جلەکەت پاکترە و بۆ ڕازیبونی خوا باشترە!!

ئیبن عەباس ستایشی عومەر دەکا و شایەدی بۆ دەدا

(عبداللەی کوڕی عەباس) قسەی لەگەڵدا کرد و، باسی چاکەکانی کرد و ستایشی لەسەر کرد، لە قسەکانیدا ڕاستگۆش بوو.

لەو قسانەی پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، هاوەڵی پێغەمبەری خوات کردوە و هاوەڵێکی باش بووی، کاتێکیش لێی جیابویتەوە لێت ڕازی بوو، پاشان هاوەڵێتی ئەبوبەکرت کرد و هاوەڵێکی باش بووی، کە لێی جیابویتەوە ئەویش لێت ڕازی بوو، پاشان هاوەڵێتی هاوڕێیانی پێغەمبەری خوات کردوەﷺ، هاوەڵێکی باش بووی بۆیان، خۆ ئەگەر لێیان جیابیتەوە، بەشێوازێك بەجێیان دەهێڵی کە هەموو لێت ڕازین!

بەڕاستی تۆ ئەمیر و ئەمین و گەورەی بڕوادارانی، بە کتێبی خوا داوەری دەکەی، شت بە یەکسانی دابەش دەکەی! لەراستیدا موسڵمان بونت سەربەرزی بوو، ئەمیرایەتیەکەت فەتح بوو، زەویت پڕ لە دادگەری کردووە!

قسەکانی (ئیبن عەباس)ی بەدڵ بوو، بۆیە ڕێك دانیشت و بە (ئیبن عەباس)ی گوت-لەو کاتەدا (عەلی کوڕی ئەبوطالب)یشی لەگەڵدا بووﷺ-.

عومەر پێی گوت: ئیبن عەباس! لەلای خوا ئەم شاهێدیەم بۆ دەدەی؟

پێم وت: بەڵێ، من ئەو شاهێدیەت لەلای خوا بۆ دەدەم.

(عەلی کوڕی ئەبوطالب)یش وتی: هەروەها منیش لەلای خوای گەورە ئەو شاهێدیەت بۆ دەدەم!!

خەڵکی بەردەوام سەردانی عومەریان دەکرد و ستایشیان دەکرد، لە

قسەکانیشیاندا ڕاستگۆ بون.

دەیانوت: ئەی ئەمیری بڕواداران! خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، بەراستی تۆ .... واو .... واو .... وابووی.

پاشان دەڕۆیشتن و کەسانی تر دەهاتن، ئەوانیش ستایشیان دەکرد و.. ئیتر بەم شێوەیە.

عومەر وەڵامی قسەکاران دەداتەوە و لە خەلیفایەتی دەترسێت

عومەریش وەڵامی دەدانەوەو دەیگوت: ئەوە بە ئەمیرایەتی تەزکیەم دەکەن، لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووم، ئەو لێم رازی بوو، لەگەڵ ئەبوبەکریشدا بووم گوێبیست و گوێڕایەڵی بووم، کاتێکیش ئەبوبەکر کۆچیدوایی کرد من لە خزمەتیا گوێڕایەڵ بووم.

ئەوەی کە لێی دەترسم تەنها ئەو ئەمیرایەتیکردنەی ئێوەیە! بەخوا ئاواتەخوازم سەربەسەر و بە دەست مایەوە لێی دەرچم هەروەك چۆن سەرەتا هاتم، نە پاداشتم هەبێ و نە گوناهیشم لەسەر بێ!!

عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکر هەواڵی پیلانەکە بە عبیداللهی کوڕی عومەر دەدات

کاتێ کە عومەر بە خەنجەرەکەی (ئەبولوئلوئە) پێکرا، (عبیداللەی کوڕی عومەر) زۆر کاری تێکرا، ھاربوو و ھەڵچوو وەکو دڕندەی لێھات.

لە ڕێگەدا (عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکری صدیق) پێی گەیشت، ئەویش هەواڵی هەرسێ پیلانگێڕەکەی پێدا، (ئەبولوئلوئە)و(هورموزان)و(جوفەینە)، کە بە نهێنی کۆببونەوە و کاتێ ئەمیان بینیوە ترس و بیم گرتویانە و بەترسەوە هەستاون و (ئەبولوئلوئە) خەنجەرەکەی لەدەست کەوتوەتە خوارەوە، کە هەمان ئەو خەنجەرە بووە کە (ئەبولوئلوئە) لە لێدانی عومەر و ئیمانداراندا بەکاری هێناوە.

(عبیداللەی کوڕی عومەر) دڵنیا بوو لەوەی ئەمە پیلانێکی ئاگرپەرستانەیە و ئەو سێ کەسە تیایدا بەشدارن، بەو پێیەی (ئەبولوئلوئە) خۆی کوشتوە، ئەوا دەبێ ئەو دوانەکەی تر بە کوشتن تۆڵەیان لێ بکرێتەوە و تۆڵەی عومەریان لێ بسەنرێتەوە.

عبیدالله سێ کەس دەکوژێت

(عبیداللەی کوڕی عومەر) شمشێرەکەی دەرکرد و چوو بۆ لای (هورموزان)وبە شیرەکەی لێی دا و کوشتی!!

(عبیدالله) وتویەتی: کاتێ هورموزان شیرە هەڵکێشراوەکەی بینیوە وتویەتی (لا اله الاّ الله)!!

پاشان چووە بۆ لای (جوفەینە)وئەویشی کوشتوە!

(عبیدالله) وتویەتی: کاتێ شیرەکەم لە (جوفەینە) بەرزکردەوە، خاچێکی لەسەر دەم و چاوی دانا!

واتە خاچەکەی خستە سەر دەم و چاوی وەك ئاماژەیەك بەوەی لەسەر گاورێتی مردووە.

پاشان چوو بۆ ماڵی (ئەبولوئلوئە)، کچە بچوکەکەی بینیوە، ئەویشی بەشمشێر کوشتوە!

(عبیدالله‌ی کوڕی عومەر) ویستی هەرچی گیراوانی فارس و ڕۆمێك هەیە ئەوەی دەستی پێی بگا، بیانکوژێ، بەدوایاندا دەگەڕا بۆ ئەوەی بیانکوژێ، بەڵام موسڵمانان لێی کۆبونەوە، لەکاتێکدا شمشێرەکەی بەدەستیەوە خوێنی لێ دەتکا..

(عەمری کوڕی عاص) بەرەو ڕووی ڕۆیشت، ماوەیەك بە نەرم و نیانی گفتوگۆ و قسەی لەگەڵ کرد تاوەکو شمشێرەکەی پێدا.

جیاوازی لە سەر حوکمدان بەسەر عبیدالله ی کوڕی عومەر

ئیتر (عبیدالله‌ی کوڕی عومەر)یان گرت و خستیانە بەندیخانەوە.

موسڵمانان جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بە (عبیدالله‌ی کوڕی عومەر)، کە دوو پیاو و کچێکی کوشتووە، ئەمەش بۆ ئەو دروست نیە، هەتا ئەگەر پیلانەکەش لەسەر (هورموزان)و(جوفەینە)ش بسەلمێنرێ، چونکە ئەمە مافی خەلیفەیە، ئەویش لە مافی خۆی تێپەڕاندوەو دەستدرێژی کردۆتە سەر مافی خەلیفە!

هەندێ لە هاوەڵان وای بۆچون (عبیدالله‌ی کوڕی عومەر) لە تۆڵەدا بکوژرێ، چونکە ئەو سێیەی کوشتوە!!

ئەوانی تر وای بۆچوون لە تۆڵەدا نەکوژرێ، بەڵکو داوای لێبوردنیان بۆ دەکرد و، وتیان: نەفرینی خوا لە (هورموزان)و(جوفەینە) بێت، خوای گەورە دووری خستنەوە، ئایا دەتانەوێ (عبیدالله)ش بکوژن و بیگەیەننە

**باوکی؟ ئایا ڕەوایە عومەر دوێنێ بکوژرێ و ئەمڕۆش ئێوە کوڕەکەی بکوژن؟!**

**جا کۆك بون لەسەر ئەوەی (عبیداللەی کوڕی عومەر) لە بەندیخانەدا بمێنێتەوە تا کاتێك خەلیفە هەڵدەبژێردرێت.**

عوسمان لێی خۆش دەبێت و خوێنی کوژراوەکان دەدا

**کاتێك کە عوسمانی کوڕی عەفانﷺ کرا بە خەلیفە، (عەمری کوڕی عاص) پێی وت: پێش ئەوەی تۆ ببیتە خەلیفە، (عبیداللە) ئەو سێ کەسەی کوشت، واتە لە سەردەمی دەسەڵاتی تۆدا ڕووی نەداوە، بۆیە بەرپرسیارێتی تۆی تێدا نیە، من ڕام وایە لێی ببورێ!**

**(عوسمان)یش (عبیداللەی کوڕی عومەر)ی ئازاد کرد و خوێنی هەردوو پیاو و کچەکەی لە ماڵی تایبەتی خۆی دا..!**

عومەر کوڕەکەی ڕادەسپێرێت قەرزەکانی بۆ بژمێرێت

**کاتێ (عومەری کوڕی خەتتاب) لە ماڵەکەی خۆیدا لە گیانەلادا بوو، (عبداللە)ی کوڕی بانگ کرد و پێی وت: عبداللە! ئەو قەرزەی لەسەرمە بۆمی کۆبکەرەوە، بۆی کۆکردەوەو بینی هەشتا و شەش هەزار درهەمە.**

**عومەر گوتی: عبداللە! کاتێ مردم ئەم قەرزە لە ماڵی بەرەی عومەر بدەرەوە، ئەگەر ماڵەکەشیان بۆ ئەم قەرزە بەشی نەکرد، ئەوا لە ماڵی بەرەی (عەدی) تەواوی کە، ئەگەر ئەوەش بەشی نەکرد، ئەوە لە ماڵی قوڕەیش تەواوی بکە!!**

**(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) پێی گوت: ئەمیری بڕواداران! ئایا ئەو ماڵە بۆ لە (بیت المال) قەرز ناکەی؟**

**عومەر گوتی: پەنا بەخوا ئەگەر شتی وابکەم، تا تۆ و هاوەڵەکانم لەپاش خۆم نەڵێن: بەشی خۆمان بۆ عومەر واز لێهێنا، بەخشیمان، ئیتر قەرزی (بیت المال) نەدەنەوەو منیش قورساییەکەی لای خوا لەئەستۆ بگرم.**

ئیبن عومەر قەرزەکەی دەخاتە سەر شانی خۆی

**(عبداللەی کوڕی عومەر) دەڵێ: باوکەگیان! قەرزەکەت لەسەر من و من بۆتی دەدەمەوە.**

**کاتێ (عومەر) ئەسپەردەی خاك کرا، (عبداللە)ی کوڕی لە بەرامبەر**

ئـەهلی شـورا و کۆچـەر و پـشتیوانەکاندا وەسـتا و ڕایگەیانـد کـە ئـەو بەرپرسێتی دانەوەی قەرزەکانی عومەر لەخۆی دەگرێت.

هەفتەیـەك لـە خەلافـەتی عوسمـان تێنەپـەڕیبوو، (عبـدالله) هـەموو قەرزەکـەی کـۆکردەوەو دایـەوە بـە خاوەنـەکانی و عوسمـانیش شـاهێدی قەرزدانەوەکەی بوو.!!

عومەر داوای مۆڵەت لە عائیشە دەکات تا لەگەڵ دوو هاوەڵەکەی بنێژرێت

عومەر بە (عبـدالله)ی کوڕی وت: کوڕەکـەم، بچۆ بۆ لای عائیشە و پێـی بڵـێ: عومەر سەلامت لێ دەکات، نەڵێی ئەمیری بڕواداران، چونکە من لـەمڕۆ بەدواوە ئەمیری بڕواداران نیم!!!

پێـی بڵـێ: عومـەر داوای مۆڵـەتت لێ دەکـات لەگـەڵ دوو هاوەڵەکەیـدا" پێغەمبەری خواﷺ و ئەبوبەکرﷺ ئەسپەردە بکرێ!

(عبداللەی کوڕی عومەرﷺ) چوو بۆ لای عائیشە، داوای مۆڵـەتی کـرد و چووە لای، بینی وا بۆ عومەر دەگری.

پێـی وت: عومـەر سـەلامت لێ دەکا، داوای مۆڵـەتت لێ دەکا تا لـە ماڵی تۆدا و لەگەڵ هەردوو هاوەڵەکەیدا بنێژرێ.

عائیشە، عومەر پێش خۆی دەخا

گوتی: من ئـەم گـۆڕەم بۆخـۆم دانابوو، لای مێرد و باوکم، بـەڵام عومـەر پێش خۆم دەخەم!! وا مۆڵەتم دا..!!

(عبـداللەی کـوڕی عومـەر) گەڕایـەوە، کاتـێ بـاوکی بینـی گـوتی: بـەرزم کەنەوە و شتێك بخەنە پاڵ پشتم.

پاشان گوتی: ها کوڕەکەم چیت لایە؟

وتی: ئەوەی تۆ پێت خۆشە، عائیشە مۆڵەتی دای!!

عومـەر گـوتی: (الحمـد لله رب العـالمین، هـیچ شـتێکم بـە ئەنـدازەی ئەسپەردەکردنم لەتەنیشت پێغەمبەری خواﷺ و ئەبوبەکرەوە بەلاوە گرنگ نیە.

پاشان بە کوڕەکەی گوت: عبدالله، سـەیرکە! هـەرکاتێ مردم، هـەڵمگرن، پاشـان لەبـەر دەرگـای عائیـشەدا بموەسـتێنن و بڵـێ: (عومـەری کـوڕی خەتتاب داوای مۆڵەتت لێ دەکا).

ئەگەر مۆڵەتی دان بمبەنە ژورەوەو لەوێ ئەسپەردەم کەن، ئەگەر رەتی کردمەوە ئەوا بمگێڕەوەو لە گۆڕستانی موسڵماناندا بمنێژن، من دەترسم ئێستا لەبەر شەرم مۆڵەتی دابێتم، چونکە ئەمیری بڕوادارانم و تا ئێستاش زیندووم.!!

قسە لەنێوان عبدالله و حەفصە سەبارەت بە جێنشین دانان

(عبدالله‌ی کوڕی عومەر) وتویەتی: چوومە خزمەتی (حەفصە)-خوشکی-، وتی: بیستومە باوکت لەدوای خۆی کەس ناکاتە جێنشین!

پێم وت: شتی وا ناکا!

وتی: بەڵێ.. دەیکات.

عبدالله دەڵێ: سوێندم خوارد لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکەم، چووم بۆ لای، سامم کرد قسەی لەگەڵ بکەم، وەك ئەوەی شاخم هەڵگرتبێ، پرسیاری حاڵی خەڵکی لێکردم، هەواڵم پێدا.

عبدالله داوا لە باوکی دەکات کە جێنشین لەجێی خۆی دیاری بکات

پاشان پێم وت: قسەیەکم لە خەڵکی بیستووە، سوێندیشم خواردووە پێی بڵێم، وای بۆ چوون کە تۆ پاش خۆت خەلیفەیەك دەستنیشان ناکەی، باوکەگیان، ئەگەر سەروکاری زەویەکەت بانگ بکەی تا بیبینی، ئایا حەز ناکەی کەسێکی لە شوێن دابنێی لەکاتی دیارنەبونی لە زەویەکەدا تا بۆی دەگەڕێتەوە؟!

عومەر گوتی: بەڵێ.

وتم: باوکە! ئەی ئەگەر بتەوێ شوانەکەت ببینی، ئایا پێت خۆش نیە پیاوێك لەجێی دانێی تا دەگەڕێتەوە بۆ لای مەڕەکانت؟!

گوتی: بەڵێ.

وتم: باوکە! ئەی کاتێ بە دیداری پەروەردگارت دەگەی چی پێ دەڵێی، کە جێنشینێکت بەسەر بەندەکانیەوە بەجێ نەهێشتوە؟

عومەر وەکو پێغەمبەر دەکا و جێنشین دانانێ

عومەر دڵتەنگیەکی تووش بوو، ماوەیەکی زۆر سەری داخست، پاشان سەری بەرز کردەوەو پێمی گوت: خوای گەورە ئەم ئاینە هەر دەپارێزێ، هەر کارێکیان ئەنجام بدەم، جێنشین دانێم یان داینەنێم، هەر سوننەتە:

ئەگەر جێنشین دانەنێم ئەوا پێغەمبەری خواﷺ دای نەناوە.

ئەگەر جێنشینیش دانێم ئەوا ئەبوبەکر جێنشینی داناوە.

(عبداللەی کوڕی عومەر) وتی: جا زانیم کەس بە پێغەمبەری خواﷺ ناگۆڕێتەوە و، لەدوای خۆشی خەلیفە دانانێت!!

دەربارەی جێنشین دانان، عومەر قسە لەگەڵ سەعیدی کوڕی زەید دەکات

لە ڕۆژێکی تردا (سەعیدی کوڕی زەید)ﷺ هاتە خزمەتی کە یەکێکە لە (دە) موژدەپێدراوەکانی بەهەشت، بە عومەری وت:

ئەی ئەمیری بڕواداران، بەڵکو ئاماژە بە پیاوێ بکەی بۆ جێنشینی، چونکە خەڵکی تۆیان بە ئەمین داناوە.!

عومەر پێی گوت: دەبینم هاوەڵان خراپ سورن ها! من جێنشینێك لەو شەش هاوەڵە دەستنیشان دەکەم کە پێغەمبەری خواﷺ کۆچی‌دوایی کرد و لێیان ڕازی بوو.

ئەگەر عوبەیدە و سالم زیندوبان

ئەگەر یەك لەو دوو پیاوەم پێ بگەیشتنایە و بە زیندوویی بمانایە، دەمکرد بە خەلیفە و متمانەم پێی دەبوو، کاروباری موسڵمانانیشم پێی دەسپارد: (سالمی-بەندەی ئازادکراو-ی ئەبو حوذەیفە)و(ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح). ئەگەر خوای گەورە دەربارەی (ئەبو عوبەیدە) پرسیاری لێم کرد دەڵێم:

لە پێغەمبەرەکەتم بیستﷺ دەیفەرموو: عوبەیدە ئەمین و دەسپاکی ئەم ئوممەتەیە.

ئەگەر لە (سالم)یش پرسیاری لێم کرد ئەوا دەڵێم: لە پێغەمبەرەکەتم بیستووەﷺ دەیفەرموو: لە ڕاستیدا (سالم) زۆر خوای خۆش دەوێ.

لە ڕۆژێکی تردا کۆمەڵێك لە هاوەڵان هاتنە خزمەتی عومەر، کە (موغیرەی کوڕی شوعبە)یان لەگەڵ بووﷺ.

عومەر بە ڕەقی قسە لەگەڵ موغیرە دەکات سەبارەت جێنشینی کردنی عبدالله

(موغیرە) پێی وت: (عبداللەی کوڕی عومەر) بکە بە خەلیفە.

عومەر پێی وت: خوا بتکوژێ، بەخوا لەم قسەیەتدا مەبەستت خوا نەبوو! پێویستمان بە کاروبارتان نیە، بەخوا ستایشی خەلافەتم نەکردووە، تا هانی یەکێك لە خاووخێزانمی بۆ بدەم.

ئەگەر خەلافەت چاك بێ، ئەوا بەرمان کەوت و بەشی خۆمان لێ برد،

ئەگەریش زیان و خراپ بێ، ئەوا ئالی عومەر با تەنها یەکێکیان موحاسەبە بکرێت و، لەسەر کاروباری ئوممەتی موحەممەدﷺ لێی بپرسرێتەوە.

بەراستی خۆمم ماندوو کرد، خێزانم بێبەش کرد، ئەگەر بەدەستمایەوە دەرچم، نە تاوانم لەسەر بێ و نە گوناحباریش بم، ئەوا زۆر دڵخۆش و بەختیارم!

خەلافەت لەنێوان شەش کەس بە ڕاوێژ دەبێ

عومەر وایکرد کاروباری خەلافەت بە ڕاوێژ بکرێ لەنێوان ئەو شەش هاوەڵە موژدەپێدراوەی بەهەشت، کە پێغەمبەری خواﷺ بەر لە کۆچیدوایی لێیان ڕازی بوو.

ئەوانیش: (عوسمانی کوڕی عەفان)و(عەلی کوڕی ئەبوطالب)و(عبدالرحمنی کوڕی عەوف)و(سەعدی کوڕی ئەبووەقاص)و(طەڵحەی کوڕی عبیداللە)و(زوبەیری کوڕی عەوام)ﷺ.

عومەر بۆچی سەعیدی کوڕی زەید دووردەخاتەوە

حەوتەم موژدەپێدراوی بەهەشتی دانەنا کە (سەعیدی کوڕی زەید) بووﷺ کە ئەویش هەر لە ژیاندا بوو، چونکە لە نەوەی (عەدی)ولە خزمانی عومەر بوو، عومەریش زۆر سوور بوو لەسەر دوورخستنەوەی خزمەکانی لە ئەمارەت، لەگەڵ ئەوەی تیایاندا بوو شیاوی ئەو پلەو پایەیە بوو!

ئەوەتا دەبینین بە خەلیفەکردنی کوڕەکەی پەسەند ناکا و (سەعیدی کوڕی زەید)ی لە لیستی پاڵێوراوانی خەلافەت دوور دەخاتەوە!!

عومەر لەگەڵ شەش پاڵێوراوەکەدا قسە دەکا

(عومەر) ئەو چەند پاڵێوراوەی خەلافەتی کۆکردەوە، ئەوانیش کاتێك هاتنە خزمەتی، پێی وتن:

من سەیری کاروباری خەڵکیم کرد، هیچ ناکۆکیەکم تیا بەدی نەکردن، ئەگەر ناکۆکی ببی ئەوا لە ئێوەدایە!!

پاشان گوتی: لەڕاستیدا قەومەکەتان یەك لەم سێیەتان (عوسمان و عەلی و عبدالرحمن) هەڵدەبژێرن.

پاشان ڕوانیە عەلی و پێی گوت: ئەگەر شتێکت لە کاروباری موسڵمانان گرتە دەست، نەوەی هاشم نەخەیتە سەر ملیان.

پاشان ڕوانیە عوسمان و پێی گوت: ئەگەر شتێکی کاروباری

موسڵمانانت گرتە دەست، نەوەی ئومەییە نەخەیتە سەر ملیان.

پاشان ڕوانی بۆ (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)وپێی فەموو: عبدالرحمن! ئەگەر تۆش سەروکاری موسڵمانان بووی، خزم و کەسوکارت سواری ملی خەڵکی نەکەی!

پاشان عومەر گوتی: ئەم شەشە کۆ دەبنەوە، تا لە نێوانیاندا پیاوێك هەڵبـژێرن، (عبـداللەی کـوڕی عومـەر)یـش ئامـادە دەبـێ، لـە کاروبـاری خەلافەتدا هیچی بۆ نیە.

وە وتی: ئەگەر (سەعدی کوڕی وەقاص)تان کردە سەرپەرشتیار ئەوە شایەنێتی، ئەگەر ئەویش دەرنەچوو ئەوا خەلیفە ڕاوێژی پێ بکا، چونکە لەبەر بێتوانایی و ناپاکی لام نەبردووە!

صوهەیبی ڕۆمی بۆ پێشنوێژی دیاری دەکا

وتـی: (صـوهەیبی کـوڕی سـەنان)ی پـشتیوان-بەنـدەی ئـازادکراو-ی (بەنی جەدعان) کە صوهەیبی ڕۆمیە، سێ ڕۆژ پێشنوێژیتان بۆ دەکا.

ڕۆڵی ئەبوطەڵحە و میقداد

عومەر بە (ئەبوطەڵحەی ئەنصاری) وت:

بە پـەنجا کەسـەوە لـە قەومەکـەت (کـە لـە ئەنـصاریەکانن) لەگـەڵ ئـەو شـەش کەسـەی خـاوەن ڕاوێـژەدا دەبـی، ئەمانـە لەماڵێکـدا سـێ ڕۆژ کۆدەبنـەوە، لـەنێو خۆیانـدا یـەکێك هەڵدەبـژێرن، تـۆ و هـەر پـەنجا کەسـی هاوەڵت لەبەر دەرگای ئەو ماڵەدا سێ ڕۆژ بوەستن، ڕێی کـەس مـەدەن بچێ بۆ لایان، لێ مەگەڕێن ئەو سێ ڕۆژە تێپەڕێ تا یەکێکیان دەکەن بە ئەمیر!

ڕێنماییەکانی عومەر بۆ میقداد

بـە (میقـدادی کـوڕی ئەسـوەد)ی سوارچـاکی پێغەمبـەری خـواﷺی وت: لەگەڵ ئەم شەش کەسەی ئەهلی ڕاوێژ سێ ڕۆژ ڕاوەستە، ئەگەر پێنجیـان بە یەکێکیان ڕازی بون، یەکێکیان نەیار بوو، ئەوا بە شمشێر سەری لەت کە!

خـۆ ئەگـەر چواریان بـە یـەکێکیان ڕازیبـون و دوانیـان نـەیار بـون، ئـەوە بەشمشێر لەسەریان دە!

ئەگەر سیانیان یـەکێکیان پـێ بـاش بـوو، سـێیەکەی تـریش بـە یـەکێکی دی، ئەوا (عبداللەی کوڕی عومەر) بکەنە داوەر، هەر دەستەیەکیان (عبدالله) حـوکمی پـێ دا، بـا یـەکێك لـەخۆیان هەڵبـژێرن، ئەگـەر بـە داوەریەکـەی

(عبدالله‌ی كوڕی عومەر)یش ڕازی نەبون، لەگەڵ ئەوانەیاندا بن كە (عبدالرحمن‌ی كوڕی عەوف)یان لەگەڵدایە، ئەوانی تریش ئەگەر هەر ڕازی نەبون بەوەی خەڵكی لەسەری كۆ و كۆكە، ئەوا بیانكوژن!

ئەگەر هەر سێ ڕۆژەكەش تەواو بوو، ڕۆژی چوارەم هات، كەسێكیان لەنێو خۆیاندا هەڵنەبژاردبوو، ئەوا هەموویان بكوژن!!

عومەر وەسیەت بۆ خەلیفەی دوای خۆی دەكات

عومەر ئامۆژگاری خەلیفەی دوای خۆی كرد و گوتی:

ئامۆژگاری خەلیفەی دوای خۆم دەكەم: مافی كۆچكەرە یەكەمینەكانی لەیاد نەچێ، ڕێز و حورمەتیان پارێزراو بكا.

ئامۆژگاری دەكەم چاكەكاربێ لەگەڵ پشتیوانان، ئەوانەی لەپێش هەموو كەسدا جێگە و سامان و ئیمانیان لەپێشوازی موسڵماناندا بوو، بەوەی چاكەی چاكەكارانیان پەسەند كا و لەخراپەكانیان ببورێ.

ئامۆژگاری دەكەم لەگەڵ خەڵكی وڵاتاندا چاك بێ، ئەوانە یارمەتیدەری ئیسلام و كۆكەرەوەی سامان و جێرقی دوژمنن، هیچیان لێ وەرنەگیرێ تەنها ئەوە نەبێ كە لێیان زیادە و بە ڕەزامەندی خۆیان دەیدەن.

ئامۆژگاری دەكەم لەگەڵ بیابانشینەكان چاكەكار بێ، ئەوانە ڕیشەی عەرەب و كەرەستەی ئیسلامن، لە پەراوێزی ماڵەكانیان وەربگیرێ و بدرێت بە هەژارەكانیان.

ئامۆژگاری دەكەم بە (ذمی)یەكان، ئەوانەی لەپەنای خوای گەورەو پێغەمبەركەیدانﷺ، وەفا بە پەیمانەكانیان بكا، بەرگریان لێ بكا، بەپێی تواناش داواكارییان لێ بكرێ!!

عومەر دوای پێكرانی، سێ ڕۆژ دەژی، لە شەوی یەكشەممە كۆچی دوایی دەكا

عومەر لە ڕۆژانی دوای لێدرانەكەی (ڕۆژی چوارشەممە ٢٦ی ذي الحجة‌ی ٢٣ی كۆچی) سەرجەم ئەو كاروبارانەی ڕێكوپێك كرد.

لەدوای لێدرانیشی سێ ڕۆژ بە زنیدویەتی ما، كە ڕۆژانی پێنجشەممە و هەینی و شەممە بوو.

لەو ڕۆژانەدا (صوهەیبی سونانی ڕۆمی) پێشنوێژی موسڵمانانی

دەكرد.

عومەرﷺ لە شەوی یەكشەممەی یەكی مانگی موحەڕەمی ٢٤ی كۆچی كۆچی دوایی كرد.

ئامۆژگاری عومەر بۆ عبداللە ی كوڕی

تۆزێ پێش كۆچی دوایی، ئامۆژگاری عبداللەی كوڕی كرد و پێی گوت: كوڕەكەم، ئەگەر كاتی مردنم هات، ئەوە بمسوڕێنەو روم لە قیبلە كە، دەستی راستت بخەرە سەر تەوێڵم و، دەستی چەپیشت بخەرە سەر چەناگەم.

كاتێكیش مردم چاوەكانم بنوقێنە.

كفنێكی مامناوەندیم بۆ بكەن، ئەگەر لای خوا باشەم هەبێ، ئەوا بەباشتر بۆم دەگۆڕێ، ئەگەر ئەوەش نەبم، ئەوا هەر بە زویی لێم زەوت دەكرێ!

گۆڕەكەشم هەر با ناوەندی بێ، ئەگەر لای خوا چاكەم هەبێ، ئەوا بەپێی بڕكردنی چاو بۆم فراوان دەكا، ئەگەر ئەوەش نەبم، ئەوا لێمی تەنگ دەكاتەوە تا پەراسوەكانم بەیەكدا دەچن!

با لەگەڵ جەنازەكەمدا هیچ ئافرەتێك دەرنەچێ، تەزكیەو پاكانەی شتێكم بۆ مەكەن كە تیامدا نیە، چونكە خوای گەورە زاناترە پێم!

ئەگەر بۆ گۆڕتان بردم، بە پەلە هەنگاو بنێن، چونكە بەراستی ئەگەر لای خوا چاكەم هەبێ، ئەوا بۆ شوێنێكم دەبەن كە زۆر چاكترە بۆم، ئەگەر بەو شێوەیەش نەبوم، ئەوا خراپەیەكتان هەڵگرتووە!!!

حەفصە خواحافیزی لەباوكی دەكا

چەند سەعاتێ بەر لە كۆچی دوایی، حەفصەی كچی و دایكی بڕواداران لەگەڵ چەند ئافرەتێكدا هاتن بۆ لای و ماوەیەك گریان و پاشان دەرچون، دوای ئەوانیش كۆمەڵێك پیاو لە بڕواداران هاتن بۆ لای.

عوسمان دوا چركەساتەكانی عومەرمان بۆ دەگێڕێتەوە

عوسمانﷺ لە شەوی یەكشەممەدا چوە بۆ لای، كە دواچركەساتەكانی ژیانی (عومەر)مان بۆ دەگێڕێتەوە.

گوتی: من لەدوای هەموتانەوە ئاگاداری عومەر بووم، چووم بۆ لای،

سەری لەسەر ڕانی عبداللەی كوڕی بوو.

بەكوڕەكەی وت: رووومەتم لەسەر زەوی دانێ.!

كوڕەكەی وتی: ئایا رانم و زەویەكە وەك یەك نیە؟

پێی وتەوە: ڕومەتم لەسەر زەوی دانێ.

كاتێ رومەتی لەسەر زەوی دانا، گوێبیستی بووم دەیگوت:

خوایەگیان، هاوار بۆ من، بۆ دایكیشم، ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبی!!!

پاشان لاشەی سارد بویەوەو گیانی دەرچوو، خوای گەورە لێی ڕازی بێ.

كە شەوی یەكشەممە كۆچی دوایی كرد، كوڕەكەی بە ئاو و مۆرتك(سدر) شۆردی و لە سێ جلدا كفنی كرد.

موسڵمانان لەدوای ئەوەی نوێژی بەیانی ڕۆژی یەكشەممەیان كرد، نوێژی جەنازەیان لەسەر (عومەر) كرد، لەنوێژكردنەكەشیدا (صوهەیبی رۆمی) پێشنوێژی بۆ كردن.

عومەر بەیانی رۆژی یەكشەممە بەخاك سپێردرا

پاشان هەڵگیرا بۆ ماڵی عائیشە، (عبداللەی كوڕی عومەر) لە دەرگاكەدا وەستا و سڵاوی لە عائیشە كرد، پاشان داوای مۆڵەتی كرد و وتی: عومەر داوای مۆڵەتت لێ دەكا؟

گوتی: بیهێننە ژورەوە.

عبداللەی كوڕی و عوسمان و سەعیدی كوڕی زەید و عبدالرحمنی كوڕی عەوف، دایانگرتە ناو گۆڕەكەیەوە.

گۆڕەكەی لەلای پێیەكانی پێغەمبەری خواوە بووﷺ، لەكاتێكدا گۆڕی ئەبوبەكری صدیق لەلای شانی پێغەمبەری خوادا بوو!

عائیشە، خوای لێ رازی بێت، وتویەتی: بەردەوام سەرپۆشم لادەدا و جلەكانم سوك دەكرد و دەموت ئەمانە پێغەمبەری خوای مێردم و ئەبوبەكری باوكمە، كاتێ عومەر لەلایان نێژرا، لە جلەكانم خۆپارێزیم دەكرد، چونكە عومەر لەگەڵیانە!!!

ئەو تەمەنەی عومەر تیایدا كۆچی دوایی كرد، شەست و سێ ساڵ بوو،

**وەك تەمەنی پێغەمبەری خواﷺ و ئەبوبەکری صدیقی هاوەڵی بووﷺ.**

**خوای گەورە لە ئەمیری بڕواداران خۆش بێ و شاد و ڕازی بکات.**[١]

---

١ ـ درێـژەی خەلیفایـەتی عومـەر و لێـدران و شـەهیدبونەکەیمان لەچـەند کتێبێکـەوە وەرگرتووە کە گرنگترینیان:

تأريخ الطبرى ٤: ١٩٠-٢٣٠.

(الطبقات الكبرى)ی ابن سعد: ٣: ٢٠١-٢٨٧

(الكامل في التاريخ)ی ابن كثير: ٣: ٤٩-٦٩

(صفة الصفوة)ی ابن الجوزي بە تەحقیقی فاخوری: ١: ٢٦٨-٢٩٣.

(أخبار عمر)ی علي طنطاوي: ٥١-٥٧، ٣٩٦-٤٢٠.

# ترووسکی چوارەم

## عوسمانی کوڕی عەففان، لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا

ئامۆژگاریەکانی عومەر پێش شەهیدبونی

لە (ترووسکە مێژوویی)یەکەی پێشوودا قسەمان کرد لەسەر لێدرانی عومەرﷺ و ئامۆژگاریەکەی پێش شەهیدبونی، لەوەی خەلافەت بە ڕاوێژ بێ لەنێوان ئەو شەش هاوەڵەدا و، ئامۆژگاریکردنی عومەر لەوەی کە (ئەبوطەڵحەی ئەنصاریﷺ) لەگەڵ پەنجا پشتیوانەکانی تردا پاسەوانیان بکات، ئامۆژگاریکردنی (میقدادی کوڕی ئەسوەدﷺ) کە سێ ڕۆژ پاسەوانیان بێ، ئەگەر کۆك نەبون لەسەر هەڵبژاردنی خەلیفەیەك لەنێوانیاندا، هەموویان بکوژێ.

هەروەها باسی ئەوەمان کرد کۆچی دوایی عومەرﷺ لەشەوی یەکشەممەی یەکی -محرم-ی ٢٤ی کۆچیدا بووەو لە هەمان شەودا سپاردە کراوە، پاش ئەوەی (صوهەیبی ڕۆمیﷺ) نوێژی لەسەر کردوە.

ئێستاش لەدواداچوونی ناوکۆ(سیاق)ەکەی دەکەین و لەگەڵ دیمەنی کۆبونەوەی شەش پاڵێوراوەکەدا دەژین بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەیەك لەنێوانیاندا، کە لەو ماوەیەی عومەرﷺ پێش کۆچکردنی بۆی دەستنیشان کردبون، کە بریتی بوو لە سێ ڕۆژ.

بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لە خۆیان ڕۆژانی یەکشەممە و دووشەممە و سێشەممەیان لە پێش بوو، ئەگەر نا (میقداد) هەمویان دەکوژێ.!

شەش پاڵێوراوە موژدەپێدراوەکانی بەهەشت بریتی بون لە (عوسمان) و (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر) و (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) و (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ﷺ.

کۆبونەوەی پێنج پاڵێوراو لەماڵی میسوەری کوڕی مەخرەمە

پێنج لە پاڵێوراوەکە-جگە لە طەڵحە چونکە لە مەدینە نەبوو، لە بەیانی ڕۆژی یەکشەممەی یەکی موحەڕەمدا، لەماڵی (میسوەری کوڕی مەخرەمە)داﷺ کە خوشکەزای (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ە کۆ بونەوە،

(عبداللەی کوڕی عومەر)یشیان لەگەڵدا بوو بۆ ئەوەی (ئەگەر هەردوو لا وەك یەك بون لە هەڵبژاردنەکەدا —وەرگێڕ—) تەنها دەنگێکی پەسەندکەری هەبێ، بەمەرجێ هەڵنەبژێردرێ، هەورەك باوکی وەسیەتی بۆ کردبوو.

(ئەبوطەڵحە) و (میقدادی کوڕی ئەسوەد)یش ﷺ لەگەڵ پاسەوانەکاندا، پاسەوانیان دەکردن.

سەعد، موغیرە و ئیبن عاص دوور دەخاتەوە

لەکاتێکدا ئەوان کۆببونەوەو (موغیرەی کوڕی شوعبە) و (عەمری کوڕی عاص ﷺ) هاتن و لەبەر دەرگادا وەستان، بەلام (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ) دووری خستنەوەو پێی وتن: لەبەردەرگا دانیشتوون بۆ ئەوەی بڵێن ئامادەی هەڵبژاردنی خەلیفەبووین و ئێمە لە ئەهلی راوێژ بووین!!

ئیبن عەوف داوای کشانەوەی دوایینی پالێوراوەکان دەکات

پاش ئەوەی پاڵێوراوان کۆبونەوە، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف ﷺ) پێی وتن: کامتان پێی خۆشە لە پاڵێورانەکە خۆی بکێشێتەوە، بۆ ئەوەی کەسی تر لە ئەستۆی خۆی بگرێ؟

لەراستیدا (عبدالرحمن ﷺ) دەیویست یەکێك لە شەش پاڵێوراوەکە بکشێتەوە و لە پاڵێورانەکەی وازبهێنێ، بۆ ئەوەی دانیشتن و گفتوگۆکان بەڕێوە ببات و هەستێ بە رێکخستنی پەیوەندی و تاوتوێکردنەکانی هەڵبژاردنی خەلیفە لەو پێنج پاڵێوراوەی دەمێنێتەوە.

کاتێ (ئیبن عەوف) ئەم پرسیارەی ئاراستە کردن، بۆ ئەوەی یەکێك واز لە پاڵێورانەکەی بهێنێ، بەلام کەسیان وەلامی نەدایەوە!

کشانەوەی ئیبن عەوف لەگەڵ ئەوەی هەلی سەرکەوتنی زۆر بوو

پێی وتن: من خۆمی لێ دەردەکەم و خۆمی لێ دادەماڵم و لە پالاوتنەکەم دەکشێمەوە!

هەلی سەرکەوتنی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف ﷺ) لە بەخەلیفەبوندا زۆر بوو، زۆرێك لە هاوەلان حەزیان دەکرد ئەو ببێتە خەلیفە، ئەگەر لە پالاوتنەکەی وازی نەهێنایە و سەرپەرشتیاری بەڕێوەبردنی کردەی راوێژ و هەڵبژاردنەکەی نەکردایە، دەکرا لە دوای عومەر ﷺ ئەو بوبایە بە خەلیفە و پشکی لە سەرکەوتنیشدا زۆر بوو، بەلام خوای گەورە خەلیفایەتیەکەی

بۆ عوسمان تەقدیر کردوو.ﷺ

هەندێك لە موسڵمانان دەیانویست ئیبن عەوف ببێتە خەلیفە

لەوانەیە (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)یشﷺ خۆی ئەوەی بزانیایە، چاوەکانیش زۆریان ڕوویان لە ئەو بوو، بەڵام ئەو لە هەر شەشیان دوورتر بوو لێی، هەر لەبەر ئەمە کاتێ کە ڕاوێژی بە هەندێ لە هاوەڵان دەکرد، بە ئاشکرا پێیان دەوت کە خۆی بۆ خەلیفەیەتی باشترە!

(سەعیدی کوڕی زەیدﷺ) پێی وت: ئێمە تۆ بەشیاوی ئەوە دەزانین!

(عبدالرحمن) پێی وت: دەست بۆ یەکێکی تر درێژ بکە!

(سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصﷺ) پێی وت: بەیعەت بەخۆت بدە!

(عبدالرحمن) پێی وت: ئەبو ئیسحاق! من خۆمم لە خەلیفایەتی داماڵی بۆ ئەوەی خەلیفە هەڵبژێرم، ئەگەر ئەوەشم نەکردایە هەر نەمدەویست ببمە خەلیفە!

خەونەکەی ئیبن عەوف و دووربینیەکەی

سەعد پێی وت: لەبەرچی؟

(عبدالرحمنﷺ) پێی وت: من خەوێکم بینی، باخێکی سەوزی پڕ گژوگیام بینی. حوشترێکی گەورە هاتە ناویەوە، حوشتری وا گەورەم نەبینیبوو، حوشترێکە هەروەکو تیر بەباخەکەدا تێپەڕی، تا بڕی، ئاوڕی بۆ شتەکانی ناوی نەدایەوە و هیچی لێ نەخوارد، لەدوای ئەو حوشترێك هاتە ناوی و بەباخەکەدا تێپەڕی و بەشوێنی حوشترە گەورەکەدا ڕۆیی، ئاوڕی بۆ شتەکانی ناوی نەدایەوە و هیچ شتێکی لێ نەبرد، پاشان دوای حوشترەکە حوشترێکی (عەبقەر)[1]یم بینی ڕەشمەکەی ڕادەکێشا، لە باخەکەدا بەلای ڕاست و چەپدا لای دەکردەوە، بەڵام هەر شوێنی ئەوانی پێشوو دەکەوت، هیچ شتێکی هەڵنەگرت، تا دەرچووە دەرەوە، پاشان وشتری چوارەمی هاتە ناو، لەناو باخەکەدا تێر لەوەڕا!!

نەخێر بەخوا نابم بە چوارەم!! کەسێك نیە شوێنی ئەبوبەکر و عومەر بگرێتەوەو خەڵکی لێی ڕازی بن!!

---

١ ـ عەبقەر: گوندێکە لە یەمەن، جل و مافوری نایابی لێ دروست دەکرێ، هەموو شتێکی باش و گەورەی دەدرێتە پاڵ.

کێ شوێنی ئەبوبەکر و عومەر پڕ دەکاتەوە؟

لە ڕاستیدا (عبدالرحمن‌ﷺ) خاوەن بیرتیژییەکی قووڵ بوو، ئەو خەلیفەیە کێیە کە بتوانێ شوێنی ئەبوبەکر و عومەرﷺ پڕکاتەوە،؟ تاوەکو لە ساڵانی دواییدا ڕەزامەندی و پشتگیری خەڵکی بەدەست بێنێ؟

نە (ئیبن عەوف) و نە (عوسمان و نە عەلیﷺ) ئەو بۆشاییە پڕ دەکەنەوە کە عومەر لەدوای خۆی بەجێی هێشت! بەڵام ئەوە ویستی خوایە، پێویستە خەلیفە لە دوای عومەر هەبێ، ئەوەش قەدەری عوسمان بووﷺ!!

بەڕێوەبردنی شورا بە ئیبن عەوف دەسپێردرێ

کاتێ (ئیبن عەوف) لە پاڵاوتنەکەی کشایەوە، پاڵێوراوەکانی تر کارەکەیان دایە دەستی و بەڕێوەبردنی شورایان پێ سپارد و پەیمانیان پێی دا بە سەرەنجامی کردەی شوراکە رازی بن و بەیعەت بە خەلیفەی داهاتوو بدەن و، گوێبیست و گوێڕایەڵی بن، جا هەر کەسێك بێت.

سێ ڕۆژ ڕاوێژکردنی عبدالرحمن

(عبدالرحمنی کوڕی عەوفﷺ) بەیانی ڕۆژی یەکشەممە هەر لەگەڵ کۆتایی پێهاتنی کۆبونەوەی هەر شەش پاڵێوراوەکە لەماڵی (مسوەری کوڕی مەخرەمە)، دەستی کرد بە پەیوەندی پێوەکردن و ڕاوێژکردنەکانی.

ڕاوێژ و پەیوەندی پێوەکردنەکانی سێ ڕۆژی تەواوی خایاند، تا بەیانی ڕۆژی چوارشەممەی چواری موحەڕەم، کە دوا مۆڵەتی کۆتایی پێهاتنی ئەو کارەبوو، بەو پێیەی عومەر بۆی دیاری کردبون!

عبدالرحمن بە (عەلی کوڕی ئەبوطالبﷺ) دەستی پێکرد و پێی وت: ئەگەر بەیعەتت پێ نەدەم، پێم بڵێ، کێ بۆ خلافەت دەپاڵێوی؟

عەلی وتی: (عوسمانی کوڕی عەففان)!

چوو بۆ لای (عوسمانﷺ) و پێی وت: ئەگەر بەیعەتت پێ نەدەم، کێ دەپاڵێوی؟

عوسمان وتی: (عەلی کوڕی ئەبوطالب)!

بە زوبەیریﷺ وت: ئەگەر بەیعەتت پێ نەدەم، پەنجە بۆ کێ درێژ دەکەی کە بکرێ بە خەلیفە؟

زوبەیر وتی: (عوسمانی کوڕی عەففان).

بە سەعدیﷺ وت: من و تۆ نامانەوێ! ئەدی کێم بۆ دیاری دەکەی؟

وتی: عوسمانی کوڕی عەفان.

عبدالرحمن ڕاوێژ بە خەڵکی مەدینە دەکا

دوای ئەوە (ئیبن عەوف) چوو بۆ لای هاوەڵانی تر و ڕاوێژی پێکردن، لە مەدینەدا هەرکەسی پێ بگەیشتایە لە گەورە هاوەڵان و پیاوماقوڵان و ئەمیری سەربازان و ئەوانەی دەهاتن بۆ مەدینە ڕاوێژی پێ دەکردن، ڕاوێژکردنەکانی ئەو ئافرەتانەشی گرتەوە کە لە پەردەدا بون، ئەوانیش ڕای خۆیان دەربڕی، هەروەك ڕاوێژکردن منداڵ و کۆیلەکانی مەدینەشی گرتوە.

کۆتایی هاتنی پاڵاوتنەکە بە عوسمان و عەلی

سەرەنجامی ڕاوێژکردنەکەی (عبدالرحمنی کوڕی عەوفﷺ) ئەوەی بەدەرخست کە زۆرینەی موسڵمانان پەنجە بۆ عوسمان ڕادەکێشن و هەندێکیشیان ئاماژەیان بۆ (عەلی کوڕی ئەبوطالب) دەکردﷺ.

بەم شێوەیە پاڵاوتنەکە بە عوسمان و عەلیﷺ کۆتایی پێ هات، لە کاتێکدا پاڵێوراوەکانی تر، سەعد و زوبەیر و طەڵحەﷺ لە پاڵاوتنەکە پاشەکشەیان کرد یا لە کردەی پاڵاوتنەکە کشانەوە.

سێ ڕۆژ بەسەر (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)دا تێپەڕی، چەند چاوتروکانێکی کەم نەبێ هیچ نەخەوتبوو، هیچ پشوی نەدابوو، چونکە لە پەیوەندیکردن و ڕاوێژکردنەکانیدا ڕۆژی بە شەوەوە گرێ دەدا!

ئیبن عەوف شەوی چوارشەممە لە ماڵی میسوەردا

لە نیوەشەوی چوارشەممەدا، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) چوو بۆ ماڵی خوشکەزاکەی" (میسوەری کوڕی مەخرەمە) و دای لە دەرگا، سەیر دەکا میسوەر خەوتوە، کاتێ کە میسوەر وەخەبەر هات پێی وت: ئەبینم نوستوی! بەخوا لەم سێ ڕۆژەدا ئەوەندە نەنوستوم.

بانگکردنی عەلی و عوسمان بۆ ماڵیمیسوەر .

پاشان بە (میسوەر)ی وت: بڕۆ عەلی و عوسمانم بۆ بانگ کە.

میسوەر پێی وت: خاڵۆ! بە کامیان دەست پێ بکەم؟

ئیبن عەوف وتی: بە ئارەزووی خۆت!

عەلی و عوسمان گفتوگۆ لەگەڵ میسوەری کوڕی مەخرەمە دەکەن

(میسوەر) دەڵێ: خاڵۆم هاتە ژورەوە، پاشان چووم لە (عەلی)یەوە دەستم پێکرد، حەزی من لەگەڵ ئەودا بوو، پێم وت: بچۆ بۆ لای خاڵم.

عەلی وتی: ئایا لەگەڵ مندا بۆ لای کەسی تری ناردووی؟

وتم: بەڵێ، بۆ لای (عوسمان)یشی ناردووم؟

وتی: فەرمانی پێت نەکرد لە کاممانەوە دەست پێ بکەی؟

وتم: کاتێ بۆ ئەوە پرسیارم لێی کرد، وتی بە هەر کەسێکیان کە خۆت دەتەوێ، حەزی من لەگەڵ تۆدا بوو، بۆیە بە تۆ دەستم پێکرد!

میسوەر دەڵێ: عەلی ڕۆیشت بۆ لای خاڵۆم، پاشان چووم عوسمانی بۆ بانگ کەم، کاتێ دام لە دەرگاکەی، بینیم نوێژی ویتر دەکا–ئەمەش کەمێك پێش نوێژی بەیانی بوو، پێم وت: بچۆ بۆ لای خاڵۆم.

عوسمانﷺ پێی وتم: ئایا جگە لە من بۆ لای کەسێکی تری ناردووی؟

وتم: بەڵێ، بۆ لای (عەلی)ش ناردوومی؟

وتی: فەرمانی پێت نەکرد بە کاممان دەست پێبکەی؟

وتم: کاتێ پرسیاری ئەوەم لێکرد، وتی بە هەرکامیان خۆت دەتەوێ، منیش لە (عەلی)یەوە دەستم پێکرد، عەلی ڕۆیشت بۆ لای خاڵۆم.

پێش بەیانی عەلی و عوسمان لەبەردەم ئیبن عەوف دان

میسوەر دەڵێ: من و عوسمان هاتین و گەیشتین بە عەلی، هەرسێکمان چووین بۆلای خاڵم، بینیمان بەپێوەیە و نوێژ دەکا، پێش ئەوەی بانگی بەیانی بدا، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، ڕووی کردە عەلی و عوسمان و پێی وتن: سێ ڕۆژە پرسیار لە خەڵکی دەکەم و ڕاوێژیان پێ دەکەم، لەئێوە زیاتر کەسیان ناوێ!

مەرجی ئیبن عەوف و ڕەزامەندی عوسمان

پاشان ڕووی کردە عەلی و پێی گوت: عەلی! ئایا لەسەر کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ و کاری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێ دەدەی؟

عەلیﷺ وتی: نەخێر، بەڵام هەرچی هەوڵ و توانام هەیە لەو کارەدا بەکاری دەهێنم!

پاشان ڕووی کردە عوسمانﷺ و پێی گوت:

ئایا لەسەر کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ و کاری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پی دەدەی؟

عوسمانﷺ گوتی: بەڵێ، بەیعەتت پێدەدەم!!

ئا لێرەدا تای تەرازووی عوسمان بەسەر تای تەرازووی (عەلی)دا قورستر بوو‌رضي الله عنهما.

کاتی بەیانی هاتبوو، عبدالرحمن پێی گوتن: هەستن بۆ مزگەوت.

بەیانی ڕۆژی چوارشەممە موسڵمانان لە مزگەوت چاوەڕێ بون

موسڵمانان لە مزگەوتدا لە کاتی نوێژی بەیانیدا بون، چاوەڕێی هەوڵ و پەیوەندیکردن و ڕاوێژەکانی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)یان دەکرد، بە تایبەت کە ئەو سێ ڕۆژەی عومەر دەستنیشانی کردبوو کۆتایی پێهات، وا چاوەڕێی بەیانی ڕۆژی چوارشەممە دەکەن.

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف‌رضي الله عنه) ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی و مێزەرە تایبەتیەکەی کردە سەر، کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ لە ژیاندا بۆی بەستبوو، شمشێرەکەی بەست و پاشان چووە مزگەوتەوە.

قامەتی نوێژی بەیانی کرا، (صوهەیبی ڕۆمی‌رضي الله عنه) پێشنوێژی بۆ کردن، مزگەوت لە نوێژکەران جمەی دەهات، چاوەڕێی سەرەنجامیان دەکرد و خۆیان بۆ بەیعەت پێدانی خەلیفەی نوێ ئامادە کردبوو!

وتاری ئیبن عەوف لە دوای نوێژدا

پاش ئەوەی نوێژ تەواوبوو، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)‌رضي الله عنه چوە سەر دوانگە، وەستانێکی درێژ وەستا، لەخوا پاڕایەوە بە پاڕانەوەیەکی پڕ لە ترس(خشوع)، کە خەڵکی شتی وایان نەبیستبوو، خەڵکی چاویان تێی بڕیبوو، چاودێری قسەکانیان دەکرد، پاشان گوتی:

خەڵکینە! خەڵکی کە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان پێیان خۆشە زانیبێتیان ئەمیرەکەیان کێیە، منیش بە نهێنی و ئاشکرا دەربارەی پێشەواکەتان پرسیارتانم لێ کردووە، هیچ کەسێکتان بەم دوو پیاوە" عەلی یا عوسمان نەگۆڕیوەتەوە!

قسەی ئیبن عەوف بۆ عەلی

پاشان (ئیبن عەوف) بانگی عەلی کرد، عەلی لەلای دوانگەکە وەستا.

ئیبن عەوف‌رضي الله عنه دەستی گرت و پێی گوت: ئایە لەسەر کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی‌ﷺ و کار و کردەی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێ دەدەی؟

عەلی‌رضي الله عنه وتی: نە بەخوا، بەڵام بەیعەتتان پێ دەدەم کە بەپێی توانا و تاقەتم کار لەسەر ئەوە بکەم.

(عبدالرحمن) دەستی عەلی بەردا.

پاشان بانگی عوسمانی کرد، عوسمانﷺ لە دواوەی مزگەوتەکەدا بوو، چونکە (ئیبن عەوف) عەلی پێشخست و خێراش بانگی کرد، وای گومان برد کە خەلافەت بۆ عەلی دەبێ.

عوسمانﷺ گوتویەتی: کاتێ قامەتی نوێژی بەیانی کرا، من شەرمم کرد و کەوتمە دواوەی سزگەوتەکە، چونکە دەمبینی (ئیبن عەوف) بە پەلەیە بۆ لای عەلی.

عوسمان لەسەر کردەی دوو هاوەڵەکە رازی دەبێت

کاتێ (ئیبن عەوف) عوسمانی بانگ کرد، لەدوای مزگەوتەکەوە هات و لەلای دوانگەکەوە وەستا، (ئیبن عەوف) دەستی گرت و پێی گوت: ئایا لەسەر کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ و کار و کردەی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەی؟

عوسمانﷺ گوتی: بەڵێ بەخوا، لەسەر ئەوە بەیعەتت پێ دەدەم!!

(عبدالرحمنی کوڕی عەوفﷺ) سەری بەرزکردەوە بۆ بنمیچی مزگەوتەکە و دەستی هەر بەدەستی عوسمانەوە بوو، گوتی:

خوایە گیان! ئەوەی لە گەردنمدا بوو وا خستمە گەردنی عوسمانەوە!!

بەیعەت دان بە عوسمان بۆ خەلیفایەتی

پاشان (ئیبن عەوف) بە عوسمانی وت: وا من بەیعەتت پێ دەدەم!

کاتێ بەیعەتی پێدا، خەڵکی هەستان و بەیعەتیان پێدا، قەرەباڵغیان لەسەری کرد، تا لەلای دوانگەکەدا دایانپۆشی!

لە پێشەوەی ئەوانەی بەیعەتیان پێدا (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) و (عەلی) و (سەعد) و (زوبەیر) و (طەڵحە) و (سەعیدی کوڕی زەید) بونﷺ.

(ئیبن عەوف)یش دەیروانیە ئەو لێشاوەی موسڵمانان کە بۆ بەیعەتدان بە عوسمانﷺ دەهاتنە پێشەوەو ئەم ئایەتەی دەخوێند:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾: ئەو کەسانەی پەیمان لەگەڵ تۆ دەبەستن، با بزانن پەیمان لەگەڵ خودا دەبەستن، دەستی خودا لەسەر دەستی ئەوان دایە. سا هەرکەسێ پەیمانی بەجێ نەهێنێ،

هەرخۆی لە پەیمان شکێنی زەرەر دەکا، هەرکەسێکیش ئەو پەیمانەی-کە لەگەڵ خودا بەستویەتی- بەجێ بێنێ، لەدواڕۆژدا پاداشتی گەورەی دەداتێ..﴾الفتح/١٠.

خەلیفایەتی عوسمان لە چوارشەممەی ٢٤/١/٤ی کۆچیدا بوو

لەگەڵ خۆرکەوتنی ڕۆژی چوارشەممەی مانگی موحەڕەمی ساڵی بیست و چواری کۆچی، ئەهلی حەل و عەقدی موسڵمانان وەك خەلیفەیەکی نوێ بەیعەتیان بە (عوسمانی کوڕی عەفانؓ) دابوو، بەمەش عوسمان بوو بە سێیەم خەلیفەی ڕاشدین.

پاش ئەوەی بەیعەت پێدانی تەواو بوو، نوێژی عەسری کرد، پاشان سەرکەوتە سەر دوانگەی پێغەمبەری خواﷺ و وتاری خەلافەتی بۆ موسڵمانان دا، لەو وتانەی لە وتارەکەیدا هاتبو:

وتاری عوسمان

ئێوە لە خانو و ماڵی کاتی و کۆچکردندان، هەندێ لە تەمەنتان ماوە، دەی چەندی لە تواناتاندایە تا ئەجەلتان نەهاتوە دەستپێشخەری کردەوەی چاك بکەن، چونکە سەرلەبەیانی بێت یان سەر لەئێوارە مەرگ یەخەتان پێ‌دەگرێ، بەراستی دنیاش بە غرور و لەخۆبایی‌بونەوە پێچراوە، نابێ هەرگیز ژینی دنیا فریوتان بدا و، با شەیتان بە بە بەخشندەیی خودا فریوتان نەدا.

پەند لە ڕابردوو وەربگرن، دوای ئەوەش هەوڵ بدەن و غافڵ و بێ‌ئاگا مەبن، چونکە خوا لە کردەوەکانتان بێ‌ئاگا نابێ کوان ئەو دنیاویستانەی کە بۆ دنیا هەوڵی زۆریان داو ئاوەدانیان کردەوەو ماوەیەکی زۆر تیایاندا ڕایان بوارد؟ ئایا فرێی نەدان؟ وەك چۆن خوا دنیای فڕێداوە، ئێوەش فڕێی بدەن و هەوڵ بۆ دواڕۆژ بدەن.

ئەوەتا خوای گەورە نمونەی دنیای هێناوە کە دەفەرموێ:

﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنْ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِرًا(٤٥) الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلاً:

نەزیلەیەکیان لە ژینی سەر دنیا بۆ بێنەوە" وەك ئاوێکە لە ئاسمانەوە

دامـان بەزانـد، هـەموو تـەرزە ڕوەکێکـی تێکـەڵ و پێکـەڵی بەرهـەم هێنـا، سـەرەنجامیش بـوو بـە پـوش و بـا پـەرش و بـڵاوی دەکـات. خـودا بەسـەر هەموو شتان توانای هەیە. ماڵ و منداڵ زەنبەری ژینی دنیان و ئەو کارە چاکانەشـی کـەوا دەمێننـەوە، پاداشـەکەیان لـەلای پـەروەردگار هێـژاترە و بێترس جێگەی هومێدن.﴾الکهف/٤٥-٤٦.

نوسراوی عوسمان بۆ والیەکان

عوسمـان﷛ خەلافەتەکـەی بـە نـاردنی چـەند نوسـراوێك بـۆ والیـەکانی سەر ناوچە و هەرێم و وڵاتەکان دەست پێکرد، نوسراوەکەش هەمەلایەنە و گشتی بوو بۆ هەموویان، ئەوەی لەو نوسراوانەدا پێی وتبون:

((لەراسـتیدا خـوای گـەورە فـەرمانی داوە بـە پێـشەوایان شـوان و چاودێریکار بن، نەك باج وەرگر، پێشینی ئەم ئوممەتەش شوان ئاسا بون نـەك بـاج وەرگـر، نزیکـە پێشەوایان ببنـە باج وەرگـر (واتـە تـەنها لـە بیری کۆکردنـەوەی ماڵـدا بن —وەرگێڕ—)، نـەك شـوان ئاسـا، ئەگـەر وایـان لێهات ئەمانەت و شەرم و وەفا لە دەست دەدرێ.

ئاگـادار بـن باشـترین ڕێوشـوێن ئەوەیـە بڕواننـە کاروبـاری موسـڵمانان، ماڵەکـەیان پێببەخـشن، بـەپێی ئـەوەی لەسـەریانە لێیـان بـسەنن، پاشـان سەیری کاروباری ئەهلی (ذیمە) بکەن، مافەکانیان پێ بدەن، بەپێی ئـەوەی لەسەریانە لێیان بسەنن، پاشان بڕواننـە دوژمنـە شـەڕکەرەکانتان، لەگـەڵیان بجەنگن، بەوەفا و بە بەڵێن بەسەریاندا سەرکەون.))[1]

خەلافەتی (عوسمانی کوڕی عەففان﷛) دوانزە ساڵ جگە لە چەند ڕۆژێ بـەردەوام بـوو، لـە سـەرەتای سـاڵی ٢٤ی کۆچـی تـا کۆتـایی سـاڵی ٣٥ی کۆچی.

وتەی زوهری لەسەر خەلافەتی عوسمان

ئیمامی زوهری گوتویەتی: عوسمان﷛ دوانزە ساڵ ئەمیری بڕوادارانـی گرتەدەسـت، یەکـەم شـەش سـاڵی هـیچ کەسـێ نـەنگی لێ نـەگرت، لـەلای قـوڕەیش لـە (عومـەری کـوڕی خـەتتاب﷛)یش خۆشەویستر بوو، چونکە

---

١ ـ بۆ بابـەتی جێنـشین بـونی عوسمـان و بەیعـەت پێدانی وەك خەلیفـە بـە شێوەیەکی سەرەکی پشتمان بەستوە بە (تأریخ الطبري) ٤: ٢٣٠-٢٤٥ .

عومەر لەسەریان توند و تیژ بوو، بەڵام عوسمانﷺ نەرم و نیان بوو بۆیان و بەسەریانی دەکردەوە، پاشان دوای ئەوە فیتنە روویدا!!

سەرەتای فیتنە لە حەوتەمین ساڵی خەلیفایەتیەکەیدا دەستی پێکرد

لە ساڵی حەوتەمی ویلایەتی عوسماندا ﷺ سەرەتای فیتنە دەستی پێکرد، کە ساڵی ٣٠ی کۆچی‌یە، کاروبارەکان گەورەبون، جیاوازییەکان بەرفراوان بون، دوژمنانی ئیسلامیش لە ڕێکخستنە ناوخۆییەکاندا لە بەصرە و کوفە و میصر چالاك بون، کاریان کردە سەر هەرچی و پەرچی و نەفام و گێژ و وێژە موسڵمانەکان.

لە میصر و کوفە و بەصرەدا سوپایان لێ بەرپاکردن، بەردەوام بون لە هەڵگیرساندنی ناکۆکی و بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە و پڕوپاگەندە، تا کاریان گەیاندە گەمارۆدانی (عوسمانی کوڕی عەففانﷺ) لە مەدینە و لە کۆتایی ساڵی دوانزەی خەلافەتەکەیدا، پاشان هەستان بە ناشیرینترین و دزێوترین تاوانێك لە مێژووی ئیسلامیدا، ئەویش کوشتنی ئەو خەلیفە ڕاشدیە و دەرچوونی ڕۆحی بوو، بەمەش فیتنە لەنێوان موسڵماناندا ڕەگی داکوتا و جیاوازیە سیاسی و پاشان مەزهەبی و ئاینیەکانی نێوانیان قووڵ بویەوە، لەپاش تیرۆکردنی عوسمانیشﷺ هەموویان لەسەر ئیمامێك یەك دڵ و یەك ڕا نەبون، تا ڕۆژی قیامەتیش لەسەر ئەو شتە کۆنابنەوە!!

فیتنەکەش شەش ساڵ بوو

مێژوونووسە موسڵمانەکان ڕوداوەکانی نیوەی دووەمی ویلایەتی عوسمانﷺ (٣٠-٣٥ك) بە فیتنە ناودەنێن کە سەری کێشا بۆ شەهیدکردنی عوسمانﷺ.

مێژوونووسە موسڵمانەکان هەواڵەکانی ئەو فیتنەیەیان نوسیوە، لەگەڵ ئەو فیتنانەش کە بەدوایدا هاتن، وەك جەنگی (جەمەل)ی نێوان عەلی و نێوان طەڵحە و زوبەیرﷺ لە بەصرە و، جەنگی (صوفەین)ی نێوان عەلی و موعاویەﷺ، پاشان شەهیدبونی عەلی لەدوای دەرچوونی خەواریج لەفەرمانی ئەودا.

مێژوویەك بۆ ڕوداوەکانی فیتنەکە

هەموو ئەو هەواڵ و گێڕانەوانەیان بە درێژی نوسیوە، گێڕانەوە دووبارە و جیاواز و دژیەکەکانیان هێناوە، پڕیان کردووە لە ڕچە(سند)ی

دروست و قسەی پڕوپوچ و ڕەتکراوەو درۆ، کتێبەکانیان بەم تێکەڵیە سەیرەی ڕاست و دروست و درۆ و دەلەسە و ڕەوا و ناڕەوایانە ئاخنیوە، هەر مێژوونووسێك بۆ خۆی ئەم مێژوویەی نوسیوە، وێنەی (ئیبن سەعد) لە (الطبقات الكبرى) و (سەیفی کوڕی عومەیر) لە (الجمل)دا و (خەلیفەی کوڕی خەیاط) لە (الطبقات الكبرى) و (نەصری کوڕی موزاحیم) لە (الصفين) و (موحەممەدی کوڕی عومەیری واقدی) و (موحەممەدی کوڕی ئیسحاق) و (بلاذری).

گرنگترین ئەو پێشینانەی مێژووی فیتنەیان نوسیوە

لەو مێژوونوسانەی زۆرترین ڕووداوەکانی فیتنەی بە گێڕانەوە ڕچەدار(مسند)ەکانیەوە تۆمار کردبێ، پێشەوای مێژوونوسان و ڕاڤەکاران (موحەممەدی کوڕی جەریری طەبری)یە لە کتێبەکەی (تأريخ الأمم والملوك)ە، لە دوای ئەویش مێژوونووسە موسڵمانەکان لەویان وەرگرتوە، وێنەی (ئیبن ئەثیر) لە کتێبی (کامل) و (ئیبن کەثیر) لە کتێبی (البداية والنهاية) و (ئیبن جەوزی) لە کتێبی (المنتظم) و (ذەهەبی) لە (تأريخ الإسلام) و (ئیبن خەلدون) لە مێژووەکەیدا.

هەندێ لە مێژوونووسان بەتایبەتی کتێبی تایبەتیان لەسەر ڕوداوەکانی فیتنە نوسیوە، وێنەی (ئیبن عەرەبی مالیکی) لە کتێبی (العواصم والقواصم)ەکەیدا کە (محب الدين الخطيب) تەحقیقی کردووە و، (قازی موحەممەدی ئەشعەری مالیکی) لە کتێبەکەی (التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان)دا.

کتێبە هاوچەرخەکان سەبارەت بە فیتنە

هاوچەرخەکانیش زۆر لەسەر ئەم ڕوداوانە دواون، هەیانە ڕقاوی و تۆمەتبارە و کارتێکراوە بە دوژمنان وێنەی (طه حوسێن) لە کتێبی (الفتنة الكبرى)دا.

عەرموش هەواڵەکانی سەیفەدینی کوڕی عومەر لەسەر فیتنە کۆردەکاتەوە

هەشیانە هەوڵی داوە بە ویژدان بێ، بەلام بەو گێڕانەوە نادروستانەی لە کتێبە مێژووییەکانی پێشودا هەن کاریگەر بون، بۆیە لەسەر هەندێ لە هاوەڵان بەشێوەیەکی نەشیاو قسەیان کردوە، وێنەی مامۆستا (سەعیدی ئەفغانی) لە کتێبەکەی (عائشة والسياسة).

هی واشیان هەیە پوختەی هەندێ وتەی پێشینانی کۆکردۆتەوە، وێنەی مامۆستا (ئەحمەد راتب عەرموش) لە کتێبی (الفتنة ووقعة الجمل)ەکەیدا، کە لە (تأريخ الطبري)و گێڕانەوەکانی مێژوونوس (سەیفی کوڕی عومەری ضەبی تەمیمی)ەوە دەریهێناوە کە سەبارەت بە فیتنەی کوشتنی عوسمانﷺ و پاشان جەنگی (جەمەل)ە.

مامۆستا (عەرموش) لە وەرگرتنەکەیدا ورد و ئەمین بووە، کاتێ ویستویەتی هەواڵەکانی (سەیفی کوڕی عومەر) سەبارەت بەو روداوانە دەربهێنێ و بەدەستپاکیەوە تۆماریان بکا، کتێبەکەشی لە باشترینی ئەو جۆرە کتێبانەیە.

پێداهەڵدانی کتێبەکەی عورجون دەربارەی عوسمان

هەشیانە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەو کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ مەسەلەی فیتنە و ئاژاوەگێڕی لەسەر عوسمانﷺ و لەو بارەیەوە هەواڵەکانی کۆکردوەتەوەو دەلالەتەکانی دەرهێناوە، کە ئەویش مامۆستا (موحەممەد صادقی عورجون)ـە رەحمەتی خوای لێبێ، لە کتێبەکەیدا (عثمان بن عفان: الخليفة المفترى عليه).

لەو بڕوایەدام کتێب و دانراوەکەی مامۆستا (عورجون) سەبارەت بە عوسمانﷺ باشترین و چاکترین و قووڵترین و وردترین کتێبێ بێ کە لەسەر ئەو خەلیفە بوهتان بۆکراوە نوسرابێ کە بە ستەم لێکراوی کوژرا!

هەموو موسڵمانێکی بە ویژدان ئامۆژگاری دەکەم، هەر کەسێکیش کە دەیەوێ بەراستی لە مەسەلەی فیتنەکە بگا، با روو بکاتە کتێبەکەی (عورجون) و سود لە تەحقیق و بەویژدانیەکەی ببینێ.

ڕێکخستنی روداوەکانی فیتنە بەکورتی

لەم (تروسکە مێژوویی)یەدا بەوەندە واز دەهێنم کە باسێکی هەندێ هەواڵی راست و دروست بکەم کە پێشەوای مێژونوسان (الطبري) لە (سەیفی کوڕی عومەری ضەبی) و جگە لەویش لە هەواڵخوانە راستگۆکانەوە وەریگرتووە، بەپێی پلەبەندیەکی زەمەنی و بەوپەڕی کورت و پوختیەوە دەیهێنم، بەدواداچوونی روداوەکان دەکەم، هەر لە سەرەتای ئاژاوەگێڕی بۆسەر عوسمانﷺ لە ساڵی حەوتەمی خەلافەتەکەی، ساڵی (٣٠)ی کۆچی، تا کار گەیشتە شەهیدبونی لە کۆتایی ساڵی (٣٥)دا.

گەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژووییەکان

**ڕوداوەکان بەکورتی باس دەکەم، بە ئامانجی پێشکەش کردنی وێنەیەکی کورت و پوخت، بۆ خوێنەری موسڵمان، کە دەیەوێ بەدوای هەقدا بگەڕێ و بەراستی ڕوداوەکانی سەردەمی عوسمانﷺ و یاخیبون لێی ئاشنا بێ.**

**بەڵام ئەوەی دەیەوێ بە بەرفراوانی لەم قۆناغە ترسناکەدا توێژینەوە ئەنجام دا، ئەوەی دەیەوێ ئارامگربێ لە تەحقیق و وردەکاری و دەرهێنانی ڕاستیەکان لە نێو گێڕانەوە کەڵەکەبووە مێژووییە دژ بەیەکەکانەوە، دەبێ ڕوو بکاتە کەرەستە خاوەکان لە مێژووەکانی (طەبەری) و (ذەهەبی) و (ئیبن جەوزی) و (ئیبن عەساکر) و (ئیبن خەلدون) و (ئیبن کەثیر)!!**

**ڕوداوەکانی فیتنە لە ساڵی (٣٠) کۆچی دەستی پێکرد، کە ساڵی حەوتەمی خەلافەتی عوسمان بووﷺ، سەرەتای ڕوداوەکانیش لە شاری (کوفە)دا ڕوویدا، کە لەسەرەتاکانی مێژووی موسڵماناندا مەڵبەندی ئاژاوەگێڕی و فیتنە بوو!!**

والیەکانی کوفە لە سەرەتای سەردەمی عوسماندا

**کاتێ عوسمانﷺ خەلافەتی وەرگرت، (موغیرەی کوڕی شوعبە)ﷺ والی کوفە بوو، عوسمانیش هاوەڵی پایەبەرز (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)یﷺ لەجێی (موغیرەی کوڕی شوعبە) داناﷺ، (سەعد)یش ساڵ و هەندێك والی کوفە بوو.**

**پاشان عوسمان لە ساڵی ٢٥ی کۆچی گۆڕی و لەجێی ئەو (وەلیدی کوڕی عوقبە)ی دەستنیشان کرد، (وەلید) هاوەڵێکی پایەبەرز و موجاهیدێکی ڕاستگۆ بوو، والیەتی بۆ (ئەبوبەکر) و (عومەر) و (عوسمان) کردبووﷺ.**

وەلیدی کوڕی عوقبە و پێنج ساڵ

**(وەلیدی کوڕی عوقبەﷺ)نزیکەی پێنج ساڵ والی کوفە بوو، لەو پێنج ساڵەدا لە دڵی موسڵمانان خۆشەویست بوو، لەگەڵیان نەرم و نیان بوو، گورج و گۆڵ بوو بێ ئەوەی لاواز بێ، دەرگای لەسەر دانەدەخستن، پێشوازی لێ دەکردن و گرفتەکانی بۆ چارەسەر دەکردن![1]**

---

١ ـــ تأريخ الطبري ٤: ٢٧١.

لەو ماوەیەدا فیتنە لە کوفە دەستی پێکرد، بە چەند پەیوەندیەکی نهێنی لەنێوان کین لەدڵ و پیسەکان و ئەوانەی لە فەرمانی ئیمام دەرچووبون، هەروەها بونی هەندێ لەو لاوانەی کە بەکاری یاساغ و ئەنجام دانی حەرامکراوەکان هەستابون!

سێ دزەکەی کوفە

لە شەوێك لە شەوەکانی ساڵی (٣٠)ی کۆچی کۆمەڵێك لاوی دزی کوفە هەڵیان کوتایە سەر ماڵی (ئیبن حەیسومانی خوزاعی)، کە لەناویاندا (مورەیعی کوڕی ئەبو مورەیعی ئەسەدی) و (زوهەیری کوڕی جوندوبی ئەزدی) و (شوبەیلی کوڕی ئوبەی ئەزدی) هەبون.. (ئیبن حەیسومانی خوزاعی) بەرگری لێکردن، بەڵام کوشتیان!!

(ئەبو شورەیحی خوزاعی) دراوسێی (ئیبن حەیسومان) بوو، گوێی لە بگرەوبەردەی ئەو دزە بێڕەوشتانە بوو کاتێك کە لەگەڵ (ئیبن حەیسومان) دەدوان، لەکاتی کوشتنەکەشیدا بینیبونی، (ئەبوشورەیح) و کوڕەکەی لەلای والی (وەلیدی کوڕی عوقبە) ئەوەی بینیبویان و بیستبویان شایەدیان لەسەر دا.

وەلید حوکمی چەتەیی و کوشتن لەسەریان پیادە دەکات و باوکانیشیان رقیان لێ هەڵدەگرن

ئەو دزە بێڕەوشتانە دەستگیر کران، دەربارەی ئەوان (وەلید) کاغەزێکی بۆ (عوسمانﷺ) نووسی، (عوسمان)یش فەرمانی دا بیانکوژن، (وەلید)یش لە دەرگای کۆشکەکەیدا ئەوانی کوشت.

(عەمری کوڕی عاصی تەمیمی)ی شاعیر ستایشی پتەوی و متمانە بەخۆبونی عوسمان و وەلید دەکا لە کوشتنی ئەو دزە بێڕەوشتانەدا:

لا تَأكُلُوا أَبداً جِيرانَكُم سَرَفاً   أَهْلُ الزَّعارَةِ في ملكِ ابنِ عفَّانِ
إنَّ ابنَ عفَّانَ الَّذي جَرَّبْتُمُ   فَطَمَ اللُّصوصَ بِمُحْكَمِ القُرآنِ
مازالَ يَعْمَلُ بالكِتابِ مُهَيْمِناً   في كُلِّ عُنْقٍ مِنْهُم وَبَنانِ[1]

کاتێ (وەلیدی کوڕی عوقبە) حوکمی خوای بەسەر دزەکاندا پیادە کرد و کوشتیانی، باوك و خزمانیان رقیان لێی هەڵگرت و لە روی هۆزایەتیەوە

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤:٢٧٢.

پشتگیریان کردن، لەبەر ئەوە لە هەلێکی گونجاو دەگەڕان تا فێڵ لە وەلید بکەن و پیلانێکی بۆ داڕێژن.

وەلید لەگەڵ ئەبو زوبەیدی میوانیدا

لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەتتابداﷺ) (وەلیدی کوڕی عوقبە) والی جەزیرە بوو، -ئەو زەویەیە کە دەکەوێتە نێوان دیجلە و فوراتەوە لە باکوری عێراق-، لە جەزیرەشدا هەندێك لە عەرەبە گاورەکانی هۆزی (تَغلِب) نیشتەجێ بون، هەر لەسەر دەستی ئەودا هەندێ لە گاورەکانی ئەو هۆزە موسڵمان بون، لەوانەی کە موسڵمان بون یەکێك لە سەرکردەکانی ئەو هۆزە بوو کە بە (ئەبو زوبەید) دەناسرا، لەنێوان (ئەبو زوبەید) و (وەلید)دا برایی و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی دروست بوبوو.

کاتێکیش (عوسمانﷺ) وەلیدی لە ویلایەتی جەزیرەوە گواستەوە بۆ ویلایەتی کوفە، (ئەبو زوبەید) بۆ سەردانی (وەلید) دەهاتە کوفە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان (ئەبو زوبەید) بە سەردانی هاتبوو بۆ لای (وەلید) و ئەو سێ قینلە دڵەی کە وەلید کوڕەکانی کوشتبون: (ئەبو موەریعی ئەسەدی) و (ئەبو زوهەیری ئەزدی) و (ئەبو شوبەیلی ئەزدی) پێیان زانیبوو.

دوابڕاوەکان وەلید بە عەرەق خواردنەوە تاوانبار دەکەن

ئەم سێ پیاوە بە هەندێ لە پیاوماقوڵانی کوفەیان وتبوو: والیەکەتان (وەلیدی کوڕی عوقبە) لە ماڵی خۆیان و لەگەڵ ئەبو زوبەیدی برادەریدا عەرەق دەخواتەوە!!

هەندێ لەو پیاوماقوڵانەی کوفە لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا هاتن بۆ ماڵی (وەلید)، (وەلید) لەگەڵ (ئەبو زوبەید) دانیشتبوو، کاتێ وەلید هەستی پێیان کرد شتێك کە لە پشتیەوە دانرابوو لەژێر تەختەبەندەکەیدا شاردیەوە، هەندێکیان وایان گومان برد ئەوەی وەلید شاردیەوە عارەق بوو.

ئاشکرابونی کارەکەیان لەبەردەم پیاوماقوڵانی کوفە

یەکێك لەو سێ کەسە هەڵی کوتایە ئەوەی لەژێر تەختەبەندەکەدا بوو، بۆ ئەوەی بە ئامادەبوانی پیشان بدات، کاتێ بینی وا سینیەکە و چەند دەنکە ترێیەکی لەسەرە، وەلید لەگەڵ (ئەبو زوبەید)دا خەریکی خواردنی ترێ بون، کاتێ کە بە کتوپڕی ئەو میوانانەی تووش هات، لە شەرماندا

شاردیەوە، چونکە چەند دەنکەترێیەکی کەمی لەسەر مابوو! قین لە دڵەکان پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاوکردەوە کە عارەقی لێ شاردونەتەوە!!

لەوکاتەدا پیاوماقوڵانی کوفە دەستیان کرد بە قسە پێوتن و جنێودان بەو سێ قین لەدڵە و پۆزشیان بۆ وەلید هێنایەوە و پێیان وت: ئەمانە کەسانێکن خوا خەشمی خۆی لێ گرتون، ئەو حوکمە خواییەی بەسەر رۆڵەکانیاندا پیادەت کردبوو ئازاری داون، لەبەر ئەوە پڕوپاگەندەیان دژ بەتۆ بڵاوکردۆتەوە!!!

وەلید لە کارەکە بێدەنگ بوو، ئارامی گرت و داوای پاداشتی لەخوا کرد، ئەم کارەی بۆ (عوسمانﷺ)باس نەکرد، بە دڵفراوانی خۆی و نەرم و نیانی و لێبوردەیی خۆی بەخشینی![1]

قسەکانیان لای ئیبن مەسعود سەبارەت بە وەلید

رق و قینی ئەو هیچ و پوچانە لەسەر (وەلید) زیادی کرد، یەکێکیان – کە (جوندوبی ئەزدی ئەبو زوهەیر) بوو– لەگەڵ دەستەیەکی تری قین لەدڵدا چوون بۆ لای (عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ) و پێیان وت: والیەکەمان (وەلید) لەماڵەوە عارەق دەخواتەوە!

(ئیبن مەسعود) وەڵامی دانەوە: هەرکەسێ شتێکمان لێ بشارێتەوە، ئێمە شوێن عەورەتی ناکەوین و پەردەی نهێنیەکەی نادڕێنین!!

کاتێ (وەلید) وەڵامەکەی (ئیبن مەسعود)ی بۆ ئەو قین لەدڵانە بیستەوە، بەسەرزەنشتەوە پێی وت: بۆچی بەو شێوەیە وەڵامی ئەو هیچ و پوچانەت دایەوە؟ من چیم شاردۆتەوە، ئەمە وەڵامێکە بۆ کەسێکی تۆمەتبار و جێی گومان و، من عارەقخۆر نیم... لەنێوان (وەلید) و (ئیبن مەسعود)دا وتوێژ و گفتوگەیەك لەسەر ئەو بارە ئەنجام درا.[2]

بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە کوفە دەربارەی سەرخۆشی وەلید

درۆزنەکان بەردەوام بون لەسەر بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و فێڵ و پیلانەکانیان گوایە وەلید عارەق دەخوا، بەردەوامیش کەسانی تاوانکار و سەرپێچیکاریان لەدەوری خۆیان کۆدەکردەوە، ئەوانەی (وەلید) حەد یان

---

١ ـ تأريخ الطبري: ٤: ٢٧٣-٢٧٤.

٢ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٤-٢٧٥.

سزا یا بەهۆی سەرپێچی کردنی خۆیانەوە تەمێی کردبون!

ڕۆژێـك ساحیرێکیان هێنایە بەردەمی (وەلیدی کوڕی عوقبە)، (وەلیـد) دەربارەی سزا و حەدی ساحیر لە (ئیبن مەسعود)ی پرسی، (ئیبن مەسعود) وتی: چوزانیت کە ساحیرە؟

بە ساحیرەکەیان وت: سیحرەکەت چیە؟

وتی: دەتوانم بچمە دەمی ئەم گوێدرێژەوەو لە پاشیەوە دەرچم!!

(ئیبن مەسعود) بە (وەلید)ی وت: بیکوژە.

ورووژاندنی ئاژاوە و گێرەشێوێنی لەدژیدا

هەندێ لە خەڵکی لە بەردەمی ماڵی (وەلیـد)دا کۆببونـەوە، یـەکێك لـەو هیچوپوچانەی تێدابوو کە (جوندوبی ئەزدی) بوو.

(جوندوب) ئەمـەی بە هـەلێکی گونجاو زانـی بۆ ئاژاوەو گێرەشـێوێنی، دەسـتدرێژی کـردە سـەر مـافی (وەلیـد)و بەشمـشێر هـەڵی کوتایـە سـەر ساحیرەکە و کوشتی.

(وەلیـد) و (ئـیبن مەسـعود) کـۆك بـون لەسـەر بەنـدکردنی (جونـدوبی ئـەزدی)، چـونکە کـارێکی ئـەنجام داوە کـە مـافی ئـەو نیـە و سـاحیرەکەی کوشتوە، جێبەجێکردنی حەدیش لـە دەسـەڵاتی خـەڵکی نیـە، بەڵکو مـافی پێشەوا یان جێگرەکەیەتی.

کاتێ وەلید دەربارەی (جوندوبی ئەزدی) نوسراوێکی بـۆ (عوسمـان رضي الله عنه) نوسـی، فـەرمانی پێـدا کـە تـەمێی بکـا و پاشـان بـەرەڵای بکـات، قەدەغـەی خـەڵکیش بکـات لـە کـارکردن بـە گومـان و جێبـەجێکردنی حـەدەکان بـەبێ مۆڵەتی دەسەڵاتدار..

بەمـەش (جونـدوب) و کۆمەڵەکـەی هێنـدەی تـر ڕق و فێڵیـان بـۆ وەلیـد زیاتر بوو!![1]

داواکردنیان لە عوسمان بۆ لادانی وەلید

هەنـدێ لـەو لەڕێدەرچـوانەی کوفـە کـە قـین ئەسـتور بـون بەرامبـەر بـە وەلیـد، بـەرەو مەدینـە بـۆ لای (عوسمـان رضي الله عنه)بـەڕێ کـەوتن، کـە (جونـدوبی ئەزدی)شیان لەگەڵدا بوو، داوای ئەوەیان لێکرد کە (وەلیـد)یان بۆ لـەکار

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٥.

**لادا، لەبەر ئەوەی خەڵکی خۆشیان ناوێ و ستەم لە بندەستانی دەکا!**

**(عوسمانﷺ) پەسەندی نەکردن و پێیانی وت: ئێوە کار بە گومانێك دەکەن کە ئیسلام نەهی لێکردووە و بەبێ مۆڵەتیش لە کوفە دەردەچن!![1]**

**کاتێ کە گەڕانەوە بۆ کوفە رق ئەستوورییان بەرامبەر (وەلید) و خەلیفەش زیادی کرد.**

کۆمەڵە لەڕێ دەرچوە دوابراوەکان لە کوفەدا

**هەموو قین لەدڵەکان لە دەوریان کۆبونەوە، لە شاردا هیچ هیچپوچ و رقاوی و حەد لێدراو و سزادراو و، تەمێکراو و سەرپێچیکارێ نەما لە دەوریان کۆنەبێتەوە، کۆمەڵە چەتەیەکی لەڕێدەرچووی پوچیان دروست کرد و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی درۆ و پڕوپاگەندە دژ بە (وەلید) و (عوسمانﷺ)!**

**ئەمانە هەنگاوێکی پیسی شەیتانیان نا، کاتێ کە توانیان مۆر(خەتم)ی وەلیدی کوڕی عوقبە بە ڕێگەیەکی نەشیاو بدزن-کە طەبەری بەدرێژی باسی کردووە[2]-، کۆمەڵێکیان چوون بۆ لای عوسمانﷺ و مۆرەکەی (وەلید)یشیان پێبوو، بۆ ئەوەی شاهێدی عەرەق خواردنی لەسەر بدەن.**

**کاتێ (وەلید) زانی مۆرەکەی نەماوە و ئەوانەش چوون بۆ مەدینە، زانی دەیانەوێ زیانێك بدەن، چوو بۆ مەدینە، بەڵام ئەوان پێشتر گەیشتنە لای عوسمانﷺ!**

شایەتی درۆ لای عوسمان لەسەر سەرخۆشی وەلید

**کۆمەڵەکە چوونە لای عوسمانﷺ و دوو کەس لە پێشیانەوە بون (ئەبو موەریعی ئەسەدی) و (ئەبو زەینەبی ئەزدی)، ئەوانەی کە وەلید کوڕە دزەکانیانی کوشتبوو، شاهێدیان لەسەر وەلید دا کە عەرەق دەخواتەوە.**

**پێی وتن: چیتان بینیوە؟**

بەرگری کردنی وەلید لەخۆی و قسەی عوسمان

**شاهێدی درۆیان دا و وتیان: چوین بۆ لای وەلید، سەرخۆش بوو، بینیمان عەرەقی هەڵدەهێنایەوەو عەرەقەکەمان لە ریشی دەگوشی!!!**

**بەمەش ئەو دوو شاهێدە درۆزنە خواردنەوەی عەرەقیان بەسەر وەلیددا**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٥.

٢ ـ سەیری تأريخ الطبري ٤: ٢٧٥-٢٧٧ بکە.

سەلماند، چونکە حەدی عەرەق بە دوو شاهێد دەچەسپێ.

کاتێ وەلید هات بۆ لای عوسمانﷺ، سوێندی بۆ خوارد کە عەرەقی نەخواردۆتەوە، ئەو دوو شاهێدە درۆزنن و دوو دزی هیچوپوچن!

عوسمانﷺ پێی وت: ئێمە بەو ئەنجامە کاردەکەین کە پێی دەگەین، حەدیش بە شاهێدی دانی دوو شاهێد جێبەجێ دەکەین، جێی شایەتی درۆزن و ستەمکاری درۆزن ئاگرە، خواش تۆڵەی لێ دەستێنێ و ستەملێکراویش خوا تۆڵەی بۆ دەکاتەوە و پاداشتی چاکەی دەداتەوە.. کەواتە براکەم – وەلید برای شیری عوسمان بوو–، ئارام بگرە و هەردەبێ حەدت لەسەر جێبەجێ بکرێ!!

حەد دەرکردن لە وەلیدی بێ تاوان و لەکارلادانی

بە شاهێدی دوو شاهێدی درۆزن، (عوسمانﷺ) فەرمانی دا بە دەرکردنی حەدی عەرەقخۆر لە (وەلید)ی ستەملێکراو!

دوایی وای بینی کە بەرژەوەندی لەوەدایە لە کوفە لەکاری بخات، ئەوەبوو لە کاری خست، پاش والیەتیەك کە پێنج ساڵ بەردەوام بوو!

والی نوێ سەعیدی کوڕی عاص

لەجێی ئەو (سەعیدی کوڕی عاص)ی کردە والی کوفە، بەم جۆرە (سەعیدی کوڕی عاص) لە ساڵی (٣٠)ی کۆچی بوە والی کوفە.[١]

هیچوپوچ و رق ئەستور و درۆزنەکان، پاش شاهێدیەکی درۆ لەسەر وەلید، گەڕانەوە کوفە بۆ ئەوەی نەخشەی فێڵ و پیلانی تر دژی والی تازە (سەعید) بکێشن.!!

وتاری سەعید دەربارەی فیتنە

سەعیدﷺ گەیشتە مەڵبەندی فیتنە (کوفە)و سەرکەوتە سەر دوانگە، پاش ئەوەی سوپاس و ستایشی خوای کرد، وتی:

(بەخوای بۆ لای ئێوە نێردراوم، پێشم ناخۆشە، بەڵام کاتێ عوسمانﷺ فەرمانی پێکردم، هیچ بوارێکم نەما بۆ جێبەجێنەکردنی، ئاگاداربن، فیتنە لەنێوتاندا سەری بەرزکردوەتەوە، سوێند بەخوا دەکێشم بەسەریدا هەتا سەرکوتی دەکەم، یا سەردەکەوێ بە سەرمدا، ئەمڕۆش من سەرکردە و

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٥-٢٧٨.

گەورەی خۆمم)!![1]

(سەعیدی کوڕی عاصؓ) ئاگاداری بارودۆخی خەڵکی کوفە بوو، بە بیروبۆچوونی خەڵکی ئاشنا بوو، تیایاندا هەستی بە قوڵی فیتنە دەکرد، ئاشنابوو بە تێوەخزانی کۆمەڵێ لە لەڕێدەرچوان و هیچوپوچ و رق ئەستور و دوژمنامی ئەم ئایینە لە پیلان و فێڵ و فیتنەدا، لەگەڵ زاڵبونی هەرچی و پەرچی و ئاژاوەچی و دەشتەکیەکان بەسەر راوبۆچونی خەڵکدا.

نوسراوی سەعید بۆ عوسمان دەربارەی بارودۆخی کوفە

سەعید نامەیەکی بۆ (عوسمانؓ)نوسی و هەواڵی بارودۆخی نالەباری کوفەی پێڕاگەیاند، لەو نامەیەدا هاتبوو:

لە ڕاستیدا کاروباری خەڵکی کوفە شڵەژاوە، خاوەن ڕێز و پێشینە و لەپێشەکان لەژێرەوەن، ئەوەی لەم وڵاتەدا زاڵە ئەوانەن کە بەدوایيدا هاتوون، لەگەڵ ئەو دەشتەکیانەی دراونەتە پاڵی، هەتا تیایدا تەماشای خاوەن ڕێز و دنیادیدە ناکرێت..!!

(عوسمانیشؓ)بە نامەیەك وەڵامی دایەوە، کە تیایدا داوای ڕێکخستنی بارودۆخی خەڵکەکەی کردوە، لەسەر بناغەی پێشینە و جیهادکردن پۆلینیان بکات و کەسانی زانا و ڕاستگۆ و جیهادکار بەسەر ئەوانی تردا پێش بخات.

وتاری عوسمان و سەعید دەربارەی چاکسازی بارودۆخی کوفە

لەو نامەیەدا هاتووە:

خاوەن پێشینە و لەپێشەکان پایەدار کە، ئەوانەی لەسەر دەستیان ئەو وڵاتە رزگار کراوە، ئەو دەشتەکیانەی لەدوای رزگارکردنی ئەو وڵاتە هاتونەتە ئەوێ لەدوای ئەو موجاهیدە پێشینانەوە دایان بنێ، مەگەر ئەو پێشینانە لە جیهاد و حەقدا کەمتەرخەم بووبێتن و بەو کارە هەڵنەستابێتن و ئەوانەی دوای ئەوان پێی هەستابێتن! پلەو پایەی هەر مرۆڤێکیان بپارێزە و بە شێوەیەکی ڕەوا و دادگەرانە بە هەموویان ببەخشە، بەهۆی شارەزابون لە حاڵ و باری خەڵکی دادگەری لەنێوانیان دێتەدی!!

(سەعید)یش لەسەر ڕێنمونیەکانی عوسمانؓ کاری کرد،

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٩.

جیهادکارانی بانگ کرد، ئەوانەی بەشداری قادسیە و هی تریان کردبوو، وێنەی (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی)، و پێی وتن:

ئێوە رووی ئەو خەڵکانەن کە لە پشتتانەوەن، ڕووش گەیەنەر و هەواڵدەری لاشەیە، دەی سەبارەت بە پێداویستیەکانی ئەوانەی تر هەواڵمان بدەنێ و پیاوچاك و دڵسۆز و باشەکانی نێوانیانم پێ بڵێن!![1]

سەعید ئەهلی ڕاوێژ لە پیاوچاکانی کوفە پێك دەهێنێت

(سەعید) هاوشێوەیەکی کۆڕی ڕاوێژی لای خۆی پێکهێنا، لە ئەهلی حەل و عەقد لە خەڵکی کوفە، کە تیایدا هاوەڵان و موجاهیدان و زانا و فەقیهەکان و دیندار و بەتەقواکان و قورئانخوێنەکان و خاوەن ڕێزەکانی تێدا کۆکردبویەوە، ئا ئەمانە بە دەوری (سەعید)دا بون و بەشداری کۆڕ و ڕاوێژکاریەکانیان دەکرد!

بەڵام هەنگاوەکانی (سەعید) بەدڵی هیچوپوچ و ڕق ئەستور و هەرچی و پەرچیە نەفامەکان نەبوو، لەنێوان خەڵکی گشتی دەستیان کردەوە بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و درۆ و قسەی بێبناغە دژ بە (سەعید)، بە کەسێکی هیچیان لەقەڵەم دابوو، هەندێ لە سادە و ساکارەکانیش بە درۆکانیان باوەڕیان کردبوو و، بۆ لای خۆیان بەکێشیان کردبون!

عوسمان هەواڵی ئەو کارانەی لە کوفە ئەنجام دراوە بە ئەهلی ڕاوێژ دەدات

(سەعیدی کوڕی عاص) لە کارەکانی خۆی (عوسمان ﷺ)ی ئاگادارکردەوە، (عوسمان)یش ئەهلی حەل و عەقدی مەدینەی کۆکردەوەو هەواڵی بارودۆخی کوفە و ئیجرائاتەکانی (سەعیدی کوڕی عاص)ی بۆ روبەڕوبونەوەیانی پێڕاگەیاندن و هەروەك هەواڵی هیچ و پوچە ڕق ئەستورەکان و هەستانیان بە بڵاوکردنەوەو پڕوپاگەندە و درۆشی پێ گەیاندن.

ئەوانیش بە (عوسمان)یان گوت: ئەوەی کردوتە پێکاوتە، هیچ خزمەتگوزارییەك بە فیتنەچیەکان مەدە، پێش خەڵکیان مەخە، هیچ شتێکیان پێ مەدە کە شایستەی نین، کاتێ کەسێکی ناشایستە کاروباری گرتە دەست، جێبەجێی ناکا، بەڵکو خراپیشی دەکا!!

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٩.

(عوسمان‌رضي الله عنه) پێی وتن: ئەی خەڵکی مەدینە، خەڵکی ڕووەو فیتنە بزواون، بۆ ڕووبەڕووبونەوەیان خۆ ئامادەکەن، دەست بە حەقەوە بگرن، لەمەولاش هەواڵتان لەسەری پێدەدەم و یەکە بەیەکەشتان بۆ دەگێڕمەوە![1]

به چاکسازی زیان به ئارەزوبازەکان کەوت

هەرچی و پەرچی و دەشتەکیە زاخاودراوەکان، بەهۆی پێشخستنی خاوەن پێشینە و جیهاد و دونیادیدە و زانست و تەقواکان لە کوڕ و سەرکردایەتی و ڕاوێژکاریدا ئازارێکی زۆریان چەشت، جا دەستیان کرد بە نەنگی گرتن لە والیەکان لەبەر پێشخستنی ئەوانە بەسەر ئەماندا و ڕاوێژ پێکردنیان بەبێ ئەمان و، بە جیاخوازی و ڕەقی و دوورخستنەوەیانیان لە قەڵەم دا.

ڕق ئەستور و هیچوپوچەکان ئەم بارەیان قۆستەوە و ڕق و کینەی خەلیفە و والیەکانیان لە دڵدا چاندن و، کارەکانی (سەعیدی کوڕی عاص)ی والییان ڕەتکردەوەو یاخی بون و لەنێو خەڵکیدا پڕوپاگەندەیان دژ بەو بڵاودەکردەوە!

خەڵك پڕوپاگەندەکەیان ڕەت دەکردەوە

تێکڕای خەڵکی کوفەش قسەی ئەم هیچوپوچە لەڕێدەرچوانەیان وەرنەگرت، بۆیە ئەم ڕق ئەستورانە کپ بونەوە، تا وای لێهات گومانەکانیان بەدەر نەدەخست و دەیانشاردەوە، چونکە زۆربەی خەڵکی باوەڕیان پێ نەدەکردن، بەڵام بە نهێنی دەیانگەیاند بە دەشتەکی و ئاژاوەگێڕەکان کە پشتگیرییان دەکردن، یا ئەوانەی کە سزا و تەمێکرابون.[2]

جولەکە دوابڕاوەکان خراپەکاری دەخەنە نێوان موسڵمانانەوە

دوژمنانی دوابڕاوی ئیسلام لە جولەکە و گاور و ئاگرپەرستەکان لە پیلاندا بون دژ بە ئیسلام و موسڵمانان و پڕوپاگەندەی درۆینەیان دژ بە خەلیفە و والیەکان بڵاو دەکردەوە، ئەو هەڵانەی کە هەندێکیان لێ بەدەر دەکەوت لەدژیان بەکاردەهێنا بۆ وروژاندنی تێکڕای خەڵکی، زۆرێکیش لە درۆودەلەسە و ساختەکارییان دەخستە سەری، لەمەشدا مەبەستیان

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٧٩-٢٨٠.

٢ ـ سەیری تأريخ الطبري ٤: ٢٨١ بکە.

بڵاوکردنـەوەی ئـاژاوەو قووڵکردنـەوەی نـاکۆکی نێـوان موسـڵمانان بـوو، ئەمـەش بـۆ جۆشـدانی رق و تورەییـان بەرانبـەر ئـەو ئیـسلامەی زاڵ بـوو بەسـەر ئایینـە پوچـەکانیاندا و روخانـدنی ئـەو سیـستەمە فەرمانڕەواییـە ئیسلامیەی کە دەوڵەتەکانیانی تێکشکاند و سوپاکانیانی لەناو برد!

ڕێکخراوێکی نێهنی بۆ فرت و فێڵ پێك دەهێنن

ئەمانـە بـۆ جێبـەجێکردنی ئامانجـەکانیان، هیـچوپوچ و سـادە و گێـژ و وێژەکانیان وەگەڕ خستبوو، کەسانی رقاوی لەوانەی خەلیفە یان یەکێك لە والیـەکانی تـەمێی کردبـون یـا حـەدیان لێـدەرکربوو، یـان سەرزەنـشت کرابون، لە دەوریان کۆببونەوە، ئەم دوژمنانە ڕێکخراوێکی نهێنـی پیـسیان ڕێکخست، ئەندامەکانیشیان لەوانە بون کە گوێیـان بـۆ دەگـرتن و لـە شـارە گەورە و هەرێمـە جۆربەجۆرەکانیـشدا پاشـکۆ و شـوێنکەوتەیان هـەبوو، تـا تـۆڕێکی پەیوەنـدی نهێنیـان لـەنێوان خۆیاندا پێکهێنـا! گـرنگترین لقەکانی ئـەو ڕێکخـراوە پیـسەش لـە کوفـە و بەصـرە و میـصردا بـون، هەنـدێ ڕەگەزیشیان لە مەدینەی منەوەرە و شامدا هەبوو!!

جولەکەی یەمەنی عبدالله بن سبأ، سەرکردەی ئەو دەستەیە بوو

سـەرکردەی ئـەم ڕێکخـراوە نهێنیـە دوژمنکـارە، جولەکەیـەك بـوو لـە جولەکـەکانی یەمـەن و بانگەشـەی ئیـسلامبونی خـۆی لـە خەلافـەتی عوسماندا راگەیاندبوو، وای هەڵدەبەستا کە بوەتـە موسڵمان!! بـەردەوام لـە وڵاتـە ئیـسلامیەکاندا دەبزوا، شـوێنکەوتە و سـەربازەکانی رێـك دەخـست و کۆمەڵ و ڕێکخستنەکەی لێیان پێك دەهێنا!!

ئەو جولەکەیەش (عبداللەی کـوڕی وەهـەبی کـوڕی سـەبەء)ی ناسـراو بە (ئیبن سەوداء) بوو، چونکە دایکی رەشپێست بوو، شوێنکەوتەکانیـشی بە (سـەبەئیەکان) دەناسـرێن و رۆڵـی یەکـەمیان بـوو لـە دەرچوون لـە فـەرمانی عەلی و پاشان کوشتنی.

سەرەتای کاری سەبەء

ئیمام (طەبەری) بە رچە(سـند)یەك کـە خـۆی هێناویـەتی سـەبارەت بـەو وتویەتی:

(عبـداللەی کـوڕی سـەبەء) جولەکەیـەکی خـەڵکی (صـەنعا) بـوو، دایکـی رەش پێست بوو، لـە سـەردەمی عوسمانـدا موسـڵمان بـوو، پاشان لە وڵاتـە

**ئیسلامیەکاندا دەگەڕا و لە هەوڵی گومڕاکردنیاندا بوو، لە حیجازەوە دەستی پێکرد، پاشان بەصرە و لەپاش ئەوەش کوفە و پاشانیش شام، ئەوەی دەیویست لەلای خەڵکی شام دەستی نەکەوت، لە شام وەدەریان نا، تا ڕۆیشت بۆ میصر!**

**(ئیبن سەبەء) چووە میصر و تیایدا مایەوە، کاری لە هەندێك لە خەڵکەکەی کرد، بەردەوام کوفر و گومڕاییەکانی بڵاو دەکردەوە.**

ئیبن سەبەء وای بڵاو دەکردەوە کە موحەممەد دەگەڕێتەوە و ئیمامەتی بۆ عەلی دانراوە

**پێی دەوتن: سەرم سوڕدەمێنێ لەوەی کە دەوترێ عیسا لە ئاخیر زەماندا دەگەڕێتەوە، بەڵام دەڵێ موحەممەد لە ئاخیرزەماندا ناگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خوای گەورە فەرمویەتی:**

﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ: **ئەوەی کە قورئانی کردە ئەرکی سەرشانی تۆ، سەرەنجام دەتباتەوە ئەو شوێنەی بەڵێنی پێدای.**﴾القصص/٨٥.

**لە ڕاستیدا موحەممەد لەپێشترە بۆ گەڕانەوە، وەك لە عیسا، چونکە لەو باشترە!**

**لێرەوە بنەمای (گەڕانەوە= الرجعة)ی بۆ دانان و ئەوانیش پەسەندیان کرد و قسەیان لێی دەکرد.**

**پاشان هەنگاوێکی تری نا، ئەویش وروژاندنی خەڵکی بوو دژ بە خەلیفە، پێی وتن: هەزار پێغەمبەر هەبون، هەر پێغەمبەرێکیش (وەصی)یەکی هەبووە، (عەلی کوڕی ئەبوطالب) وەصی موحەممەدە، بەو پێیەی موحەممەد دوا پێغەمبەرە، هەروا (عەلی)ش دوا (وصی)یەکە!**

**دوای ئەوە پێی وتن: کێ ستەمکارترە لەوەی وەسیەتی پێغەمبەری خوایﷺ بەجێ نەهێناوە لە جێنشین کردنی (عەلی) لەپاش خۆی و باز بدا بەسەر (وصی)یەکەیدا کە عەلیە و لەجێگەی ئەو موسڵمانان کەسی تر دابنێن!**

ئیبن سەبەو ڕێنمونیەکانی خۆی بۆ شوێنکەوتەکانی دەنێرێ

**لەدوای ئەوەش پێی وتن: لە ڕاستیدا عوسمانرضي الله عنه بە ناڕەوا خەلافەتی گرتووەتە دەست، ئەمە لە ڕاستیدا هی (وصی)یە، (عەلی کوڕی ئەبوطالب)،**

هەر دەبێ (عوسمان) بۆ (عەلی) جێی بهێڵێ.

(ئیبن سەبەء) شوێنکەوتە تاوانبارەکانی لە ڕێکخراوە نهێنییە پیسەکەیدا ڕاسپارد کە لە ولاتانی موسڵماندا بلاوببونەوە، پێی وتن: ڕاپەڕن بۆ ئەو کارە، ببزوێن، دەست بکەن بە تانەدان لە ئەمیر و والیەکانتان، ئەوانەی خەلیفە هاوکارییان دەکا، وا دەرخەن کە فەرمان بەچاکە و بەربەستی لە خراپە دەکەن، بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ لای خۆتان ڕاکێشن، بانگیان کەن بۆ ئەم کارە!!

(عبدالله‌ی کوڕی سەبەء) بانگخوازەکانی خۆی بە ولاتانی موسڵماندا پەرش و بلاو کرد، لە بەصرە و کوفە و مەدینە و شوێنی تر، خۆیشی لە میصردا نیشتەجێ بوو، نوسراوی بۆ شوێنکەوتەکانی لە ولاتاندا دەنوسی کە مێشکیانی تێکدابوو و بۆخۆی کەمەندکێشی کردبون، ئەوانیش بۆیان دەنوسی.

چالاکی شوێنکەوتەکانی لە خراپەکاریدا

بەهۆی داواکردنی ئەمە شوێنکەوتەکانی لە ولاتاندا کەوتنە جووڵە، بە نهێنی بە لایەنگرەکانیان وتبوو کە ئێمە چی دەکەین وچۆن دەمانەوێ لە فەرمانی والیەکان و خەلیفە دەرچین و کاردەکەین بۆ لەکار لادانی عوسمانﷺ لە خەلافەت!

وەها خۆیان دەردەخست کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەکەن، بۆ ئەوەی کار لە خەڵکی بکەن و ڕایانکێشن و بیانخەڵەتێنن!

شێوازی سەبەئیەکان لە فیتنەدا

شوێنکەوتەکانی (ئیبن سەبەء) درۆ و بوختانیان لەسەر نەنگی ئەمیر و والیەکانیان دادەتاشی و لە نوسراودا بلاویان دەکردەوەو هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان بۆ شارەکان دەنارد، وای لێهات خەڵکی هەر شارێك نوسراویان بەم درۆودەلەسانە پڕ دەکردەوەو دەیاننارد بۆ شارەکانی تر، خەڵکی هەرشارێکیش ئەم نوسراوە ساختانەیان بۆ خەڵکی لای خۆیان دەخوێندەوە.!

خەڵکیش بەهۆی ئەوانەوە نەنگی و هەڵەی والی ئەو ولاتەیان دەبیست و دەیانوت: ئێمە بێ وەیین لەوەی موسڵمانانی ئەو ولاتە تووشی هاتوون،

ئەوەی دەیانبیست باوەڕیان پێی دەکرد!

بەم شێوەیە (سەبەئیەکان) لە زەویدا خراپەکارییان کرد و بارودۆخی موسڵمانانیان تێک دا و یەک قسەییان لەت و پەت کرد و برایەتی و یەکڕیزیانیان لەق کرا، خەڵکیان دژ بە والی و سەرکردەکان وروژاند و درۆ و بوختانیان دەربارەی خەلیفە عوسمانڕضي الله عنه ڕێکخستبوو.

ئەوان بەم تاوانە ڕێکخراو و نەخشەکێشراوە زیرەکانەیە، ئەوەی دەیانویست ئاشکرایان نەدەکرد، ئەوەشی بە نهێنی ئەنجامیان دەدا رایان نەدەگەیاند، مەبەستیان بوو عوسمانڕضي الله عنه لەکار بخەن و عەزلی بکەن و دەست بگرن بەسەر سیستەمی ئیسلامیدا بۆ جێبەجێکردنی مەبەستە شەیتانیەکانی (عبداللەی کوڕی سەبەء) و جولەکە و گاور و ئاگرپەرستە هاوکارەکانی!![1]

کاتێ (عبداللەی کوڕی سەبەء) ئیسلام بونی خۆی ئاشکرا کرد، ڕوەو شام ڕۆیی، بۆ ئەوەی هەندێ لە خەڵکەکەی تێك بدا و کاریگەرییان لەسەر دروست بکا، بەڵام لەم ئامانجە شەیتانیەیدا لەوێ سەرکەوتوو نەبوو!

ئیبن سەبەو لە شام سەر لە ئەبوزەر دەشێوێنێ

ئیمام (طەبەری) بە ڕچە(سند)ی خۆی دەیگێڕێتەوە و وتویەتی:

(کاتێ (ئیبن سەوداء-ئیبن سەبەء-) چووە شام، بە (ئەبوزەڕی غیفاریڕضي الله عنه) گەیشت، (ئیبن سەبەء) بە (ئەبوزەر)ی وت: ئایا سەیرت لەو وتەیەی موعاویە نایەت کە دەربارەی ماڵ و سامانی موسڵمانان دەڵێ سامان سامانی خوایە! ئاگادار بە هەموو شتێ هی خوایە، بەڵام موعاویە مەبەستی ئەوەیە ئەم سامانە نەدا بە موسڵمانان و ناوی موسڵمانانی لێ بسڕێتەوە!

(ئەبوزەرڕضي الله عنه) بە نیازپاکی و دڵسافی و دەرون بێگەردیەوە بە قسەکانی (ئیبن سەبەء) کاریگەر بوو، وا گومانی برد موعاویە لەم قسەیەیدا بەهەڵەدا چووە.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٠-٣٤١ بە دەستکاری داڕشتنەکەی.

لەنێوان ئەبوزەر و موعاویە

(ئـەبـوزەر) چـوو بـۆ لای موعاویـەﷺ، ئینکـاری لێکـرد و پێـی وت: موعاویە! چی وات لێدەکات ناوی سامانی موسڵمانان بنێی سامانی خوا؟

موعاویـەش پێـی وت: ئـەبـوزەر! ڕەحمـەتی خـوات لێبـێ، ئـەی ئێمـە بەندەی خوا نین و سامانیش هـی ئەو نیە، دروستکراو و فەرماندانیشیان هەر لە ئەوەوە نیە؟

ئەبوزەر وتی: مەڵێ ئەم سامانە سامانی خوایە.

موعاویە پێـی وت: ناڵێم ئـەم سامانە هـی خـوا نیە، بـەڵام دەڵێم: ئـەوە سامانی موسڵمانانە!!

بـەم شـێوەیە موعاویـەﷺ کارەکـەی کـورت کـردەوەو وەڵامگـۆی ئەبوزەرﷺ بوو، لەگـەڵ ئـەوەی موعاویـە لـە قسەکەیدا هەڵـە نەبوو، بەڵکو ئـەوە فـرت و فێڵـەکانی (ئـیبن سـەبەء) بـوو کـاری کردبـووە سـەر ئـەبـوزەر بەهۆی نیازپاکی و دڵسافیەکەیەوە، بەڵام جیاوازییەکانی نێوان موعاویـە و ئەبوزەر لە هاووێنەی ئەم مەسـەلانەدا توندتر بـوو، تـا وای لـە عوسمانﷺ کـرد کـە کاغـەزێك بـۆ ئـەبـوزەر بنوسـێ بـۆ ئـەوەی بـە سـەربەرزی و ڕێزلێگیراویەوە بۆ مەدینە بگەڕێتەوە، ئەبوزەر ترسا لە مەدینەدا هەندێ بە هەڵەی تێبگەن و بۆ مەبەست و نیازەشەیتانیەکانی ئیستغلالی بکەن، پێـی خـۆش بـوو لـە (ڕەبـذە)ی دەوری مەدینـەدا نیـشتەجێ بـێ و لـەم فیتنـە کەنارگیر بێ، تا ئەوەبوو پێش هاتنی ڕووداو و بڵاوبونەوەی فیتنە لەساڵی ٣٢ی کۆچی لەشامدا کۆچی دوایی کرد!!

ئەبودەرداو و عوبادەی کوڕی صامیت جولەکەیەتی ئیبن سەبەو ئاشکرا دەکەن

(ئیبن سەوداء) لە شامدا دەچێتە لای (ئـەبو دەرداءﷺ)یش، بـە هـەمان شێوەی (ئەبوزەر) قسەی لەگەڵ دەکات و دەیەوێت تێکـی دا و هـانی بدات لەسـەر موعاویـە، بـەڵام (ئـەبو دەرداء) بـە هۆشـیاری و بەرچاوڕۆشـنی و ئیمانەوە گوێبیستی قسەکەی دەبێ و بۆنی جولەکەیەتی و شەیتانی بونی لێ دەکا و پێی دەڵێ: تۆ کێی؟ بەخوا (ئیبن سەوداء) تۆ هەر جولەکەی!!

هەروەها (ئیبن سەبەء) دەچێت بۆ لای (عوبادەی کوڕی صامیتﷺ) و هـەمان وتوێـژی (ئـیبن دەرداء)ی لەگـەڵ دەکـا، (عوبـادە)ش پیـسی و

جولەکەیەتیەکەی بەدەردەخا و دەیداتە پێش خۆی و لەگەڵ پاسەوانێکا دەیبا بۆ لای موعاویە و، پێی دەڵێ: موعاویە! ئەم جووە بگرە و وازی لێنەهێنی، ئەمە (ئەبوذەر)ی لێ وروژاندبوی!!!

(موعاویەش‌ﷺ)دەربارەی ئەم کارە بۆ (عوسمانﷺ) دەنوسێ، (عوسمان) پێی دەڵێ: لە ڕاستیدا فیتنە لوت و چاوی دەرکردوە و سەری قوت کردووەتەوە، تەنها ئەوەی ماوە هەڵچێ و شۆڕش بکا! برینەکان مەکولێنەوەو ئەوەندەی دەتوانی خەڵکی و خۆت لە بارودۆخەکە بپارێزە![1]

ئیبن سەبەء لە بەصرە لە ساڵی ٣٠ك

لە ساڵی (٣٠)ی کۆچیدا (عبداللەی کوڕی سەبەء) لە شامەوە دەچێتە بەصرە، بۆ ئەوەی شوێنکەوتە لەدین دەرچوەکان و ڕق ئەستور و هەرچی و پەرچیە کەللەپوچەکان ڕێك بخات، (والی بەصرە (عبداللەی کوڕی عامری کوڕی کرێز) بوو، پیاوێکی بە حەزم و دادگەر و پیاوچاك بوو.

کاتێ (ئیبن سەبەء) دەگاتە بەصرە، لە ماڵی پیاوێکی پیس و خراپی بەصرە دادەبەزێ، کە دزێکی بکوژ بوە، کە ئەویش (حەکیمی کوڕی جەبەلە) بوو!!

ئیمامی (طەبەری) وتویەتی: هەواڵ گەیشتە بە (عبداللەی کوڕی عامر) کە پیاوێکی نەناسراو لەلای (حەکیمی کوڕی جەبەلە) دابەزیوە و لە ماڵی ئەوانە.

ئیبن سەبەء لەلای حەکیمی کوڕی جەبەلەی دزی بەصرە

(حەکیمی کوڕی جەبەلە) پیاوێکی دز بوو، کاتێکیش سوپای جیهاد دەگەڕایەوە بۆ بەصرە، ئەو لە سوپاکە جێ دەما و لەسەر زەوی و زاری فارسدا خراپەکاری دەکرد و هەڵی دەکوتایە سەر زەوی و زارەکانی (ئەهلی ذیممە) و دەستدرێژی دەکردە سەر زەوی و زاری موسڵمانان و بە ئارەزووی خۆی شتی لێ دەبرد!! جا ئەهلی ذیممە و موسڵمانان سکاڵایان بردە لای (عوسمانﷺ) ، (عوسمان)یش بۆ (عبداللەی کوڕی عامر)ی نوسی و پێی وت: (حەکیمی کوڕی جەبەلە) لە بەصرەدا بەند بکە و نەهێڵی بچێتە دەرەوە تا هەست دەکەی ژیر بووە.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٢٨٣-٢٨٤.

(عبدالله)ش لە ماڵی خۆیدا بەندی کردبوو، نەشی دەتوانی لە بەصرە دەربچێ.

لەکاتێکدا (ئیبن جەبەلە)ی دز لەماڵی خۆیدا لەژێر نیشتەجێکردنی بەزۆر(الإقامة الجبرية)دا بوو، (عبداللهی کوڕی سەبەء)ی جولەکە هاتە ماڵی و، بێڕەوشتی و لەڕێ دەچوویی و رق و تۆمەتباری ئەوەی بە هەل زانی و بۆ بەرژەوەندی خۆی وەگەڕی خست، لێرەوە (ئیبن جەبەلە) لە بەصرە بووە پیاوی (ئیبن سەبەء)!

ئیبن جەبەلە، گەورەی سەبەئیەکانی بەصرە

(ئیبن جەبەلە)، هاوڕێنەکانی خۆی لە لەڕێلادەر و هیچوپوچەکانی بە (ئیبن سەبەء) دەناساند، (ئیبن سەبەء)یش بیروبۆچونەکانی تێدا دەچاندن و بۆ رێکخراوە نهێنیەکەی وەگەڕی دەخستن.

کاتێ (عبداللهی کوڕی عامر) بە (ئیبن سەبەء)ی زانی، بانگی کرد و پێی وت: تۆ کێی؟

(ئیبن سەبەء) وتی: من پیاوێکی خاوەن کیتابم، حەزم کردووە لە ئیسلام و موسڵمان بووم، حەزیشم بە دراوسێیەتیت کردوەو لەلات نیشتەجێ بووم!!

دەرکردنی ئیبن سەبەء لە بەصرە پاشان لە کوفە

(عبدالله) وتی: ئەدی ئەو قسانەت چیە کە پێم دەگاتەوە؟ دەرچۆ لەلام!!

(ئیبن عامر) لە بەصرە دەری دەکا، (ئیبن سەبەء)یش بەصرە بەجێ دەهێڵێ، پاش ئەوەی کۆمەڵێك کەس و شوێنکەوتەی خۆی تیادا بەجێ دێڵێ و لقێکی کۆمەڵە سەبەئیە جولەکەییەکەی تیادا دادەمەزرێنێ.!

(ئیبن سەبەء) دەچێتە کوفە و کەسانێکی لەڕێدەرچووی تیادا پەیدا دەکا، کە ئامادەن بۆ پێشوازیکردنی، ئەویش ئەمان بۆ کۆمەڵە و حیزبەکەی وەگەڕ دەخا.

پێگەی ئیبن سەبەء لە میصر

کاتێکیش (سەعیدی کوڕی عاص ﷺ)پێی دەزانێ لە کوفە دەری دەکا و، ڕوو دەکاتە میصر و تیایا نیشتەجێ دەبێ و جێپێی خۆی خۆش دەکا و تۆو دەچێنێ و بەری دێنێ، تا سەرەنجام سەر لە خەڵکێك تێك دەدا و کەسانێکی هەرچی و پەرچی و مێشك پووچ و داخ لەدڵ و دوابڕاو و

تاوانکار و یاخیبوو بەلای خۆیدا رادەکێشێ!

ئەوەی جێگەی داخە لەنێوان ئەوانەشدا دوو کوڕی هاوەڵانی تێدابوو کە ئەوانیش:

(موحەممەدی کوڕی ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبە) کە بەخێوکراوی عوسمان بووەو کوڕی ژنەکەی بووە.

(موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق) کە (عائشە)ی خوشکی لێی توڕە بووەو ناوی دەبا بە (مذمَّم) واتە سەرزەنشت کراو، نەك (محمَّد) واتە سوپاسکراو!!

(ئیبن سەبەء) پەیوەندیە نهێنیەکانی لە پێگەی خۆیەوە کە میصر بوو لەگەڵ شوێنکەوتەکانی لە مەدینە و بەصرە و کوفە رێك دەخست و، پیاوەکانی لەنێوان ئەم وڵاتانەدا دەبزواند!![1]

شەش ساڵ هەوڵی سەبەئیەکان

هەوڵ و تێکۆشانی (ئیبن سەبەء) و هاوەڵەکانی نزیکەی شەش ساڵی خایاند، کاتێ کە لە ساڵی (٣٠)دا دەستیان کرد بە کارە شەیتانیەکانیان و لە کۆتاییەکانی ساڵی (٣٥)دا توانیان لە کوشتنی خەلیفە عوسماندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن، بە درێژایی سەردەمی (عەلی ﷺ)یش خراپەکاریەکانیان بەردەوام بوو!

سەبەئیەکان لە کوفەوە لە ساڵی ٣٣ك دەست پێدەکەن

سەبەئیەکان بڕیاری ئەوەیان دابوو لە کوفەوە-وڵاتی فیتنە و پیلانەکان- دەست پێبکەن، بۆ ئەو مەبەستەش ساڵی (٣٣)یان دیاری کردبوو وەك کاتێکی دیاریکراو بۆ جووڵە و ئاژاوەگێڕی، لەو کاتەشدا والی کوفە(سەعیدی کوڕی عاص) بوو.

لە یەکێك لە رۆژەکانی ساڵی (٣٣)دا، (سەعیدی کوڕی عاص) لە کۆڕی گشتیدا دانیشتبوو، هەموو تێکڕای خەڵکیش لە دەوری بون، لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆ و مشتومڕیان بوو، لەوکاتەدا هەندێ لەو لەڕێدەرچووە سەبەئیانە دزەیان کردە کۆڕەکەیانەوە، کاریان کرد بۆ تێکدانی کۆڕەکە و هەڵگیرساندنی ئاگری فیتنە.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٢٦-٣٢٧.

سەبەئیەکان لە کۆڕی(سەعیدی کوڕی عاص)دا خراپەکاری دەکەن

**لە کۆڕەکەدا وتوێژ و گفتوگۆیەك کەوتە نێوان (سەعیدی کوڕی عاص) و یەکێك لە ئامادەبوانەوە، کە (خونەیسی کوڕی خوبەیشی ئەسەدی) بوو، لەسەر کارێك جیاواز بون، لەو کاتەشدا حەوت لەو لەڕێدەرچووە ئاژاوەگێڕانە دانیشتبون، لەوانە: (جوندوبی ئەزدی) کە لەپێشدا کوڕە دزەکەی کوژرابوو، (ئەشتەری نەخەعی) و (ئیبن کەواء) و (صەعصەعەی کوڕی صوحان)..**

**ئاژاوەچیەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە، لەکۆڕەکەدا هەستان بە لێدانی (خونەیسی ئەسەدی)، کاتێکیش باوکی هەستا بۆ یارمەتیدانی و ڕزگارکردنی، لەویشیان دا.!**

**(سەعید) هەوڵی دا نەهێڵێ لێیان بدەن، بەڵام هەر وازیان نەهێنا، ئەوەندەیان لە خۆی و کوڕەکەی دا تا بەهۆی توندی لێدانەکانەوە لە هۆش خۆیان چون، (بەنی ئەسەد)یش هاتن بۆ تۆڵەکردنەوەی ڕۆڵەکانیان، نزیك بوو جەنگ لەنێوان هەردوو لا هەڵگیرسێ، بەڵام (سەعید) توانی کاروبارەکە چارەسەر بکا![1]**

**کاتێك عوسمانﷺ بە ڕوداوەکەی زانی، داوای لە (سەعید) کرد بە دانایانە بارودۆخەکە چارەسەر بکات و ئەوەندەی دەتوانێ بەری فیتنە تەسك بکاتەوە.**

خەڵکی کوفە داوای سزادانی سەبەئیەکان دەکەن

**لەڕێدەرچووە ئاژاوەگێڕەکان چوونەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و پەخشکردنی چەندەها دەم هەڵبەست و درۆکردن دژ بە (سەعید) و (عوسمانﷺ) و خەڵکی کوفە و پیاوماقوڵەکانی!**

**خەڵکی کوفە لێیان بێزار بون، بۆیە داوایان لە (سەعید) کرد سزایان بدا!**

**سەعید وتی: لە ڕاستیدا عوسمان قەدەغەی ئەوەی لێکردوم، ئەگەر ئەوەتان دەوێ خۆتان ئاگاداری بکەن.!**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣١٧-٣١٨.

عوسمان لەسەر داوای خەڵکی کوفە، سەبەئیەکان دەردەکات

پیاوماقوڵ و پیاوچاکەکانی خەڵکی کوفە سەبارەت بەو چەند کەسە نوسـراوێکیان بـۆ (عوسمـان)ﷺ نوسـی، داوای دەرکـردن و دەربەدەرکردنیان کردبوو، چونکە خراپەکاری و کاری تێکدەرانەی تیادا ئەنجام دەدەن!!

(عوسمان)ﷺ فەرمانی کرد بە والیەکەی (سەعیدی کوڕی عاص) کە لە کوفـە دەریـان بکـا، کـە زیـاد لـە دە کـەس بـون، هـەر بـە فـەرمانی (عوسمان)یشﷺ ناردنی بۆ لای (موعاویەﷺ) لەشام!

سەبارەت بەمانەش (عوسمانﷺ) نوسراوێکی بۆ (موعاویەﷺ )نوسی، کە پێی وتبوو: خەڵکی کوفە چەند ئاژاوەگێڕێك بۆ لات دەردەکەن، تۆش بیانترسێنە و سوکیان بکە، تەمبێیان بکە و لەسەریان ڕاوەستە، ئەگەر زانیت ژێر بون ئەوا پەسەندیان بکە.

لەوانـەی بـۆ شـام دەربـەدەر کـران: (ئەشـتەری نەخـەعی) و (جونـدوبی ئـەزدی) و (صەعـصەعەی کـوڕی صـوحان) و (کومـەیلی کـوڕی زیـاد) و (عومەیری کوڕی ضابئ) و (ئیبن کەواء) بوو.

سەبەئیە دەرکراوەکان لای موعاویە

ئەمانـە چـەند ڕۆژێـك لای (موعاویـەﷺ) مانـەوە، لەنێوان (موعاویـە) و ئەوانـدا مـشتومڕ و گفتوگۆیـەکی تونـد کـرا، قسەی ڕەقیـان بـە (موعاویـە) دەوت، ڕاست نەبونەوە، لەوەی کردبویان پاشگەز نەبونـەوە، چۆن پاشگەز دەبنـەوە کاتێـك ئـەوان کەسـانێکی هیـچوپوچی ڕق ئەسـتور و ئەنـدامی کۆمەڵەکەی (عبداللەی کوڕی سەبەء)ی جولەکە بن؟![1]

سەبارەت بەمانـە (موعاویەﷺ) نوسـراوێکی بـۆ (عوسمـانﷺ) نوسـی، (عوسمان) مۆڵـەتی دا کە وازیان لێ بێنـێ بـۆ کوێ دەیانـەوێ بچن، چونکە ژمارەکەیان کەمە و مەترسیان لێ ناکرێ.

موعاویە چۆن باسی ئەوان بۆ عوسمان دەکات

لەو قسانەی (موعاویەﷺ) سەبارەت بەمانە لە نامەکەیدا بـۆ (عوسمـان) نوسیبوی:

کەسـانێك هاتوونـە بـۆ لام، نـە ژێرییـان هەیـە نـە دیـن، ئیـسلام شـانی

---

١ ـ بۆ ئەم گفتوگۆیانە سەیری تأريخ الطبري ٤: ٣١٩-٣٢٠ بکە.

قورس کردوون، دادگەری بێزاری کردون، مەبەستیان خوا نیە و بە بەڵگەشەوە قسە ناکەن، هەموو هەوڵێکیان فیتنە و بردنی ماڵی (ذمی)یەکانە، خواش تووشیان دەکا و تاقیان دەکاتەوە، پاشانیش سوك و ریسوایان دەکا.

لەو کەسانەش نین بە کەس کاریگەر بن، مەگەر لەگەڵ کەسانی تردا کۆبن، بە (سەعیدی کوڕی عاص) بڵێ وازیان لێ بێنێ، ئەمانە تەنها ئاژاوەگێڕن، نە زیانیان دەبێ و نە کاریگەریشیان هەیە!!

موعاویە پێش ئەوەی سەبەئیەکان ئازاد بکات ئامۆژگارییان دەکات

(موعاویە) پێش ئەوەی بەریان بدا، کۆیکردنەوە، قسەی لەگەڵ کردن و ئامۆژگاری کردن، پێیانی وت: وا مۆڵەتم دان، بۆ کوێ دەچن بچن، خوای گەورە بەهۆی ئێوەو سود بەکەس ناگەیەنێ و زیانیشی لێ نادا، ئێوە پیاوی سوود و زیان نین، تەنها پیاوی ئاژاوەگێڕن.

ئەگەر دەتانەوێ رزگاربن ئەوا پابەندی کۆمەڵەکەتان بن، ئەوەی بەشی خەڵکی کردوە ئێوەش دەگرێتەوە، بەهۆی ئەوەی پێتان بەخشراوە خۆتان بە گەورە مەزانن، چونکە خۆ بەگەورە زانی تووشی مرۆڤی چاك نابێ!

لە راستیدا خوای گەورە خاوەنی دەسەڵات و تۆڵەسەندنەوەکانە، ئەوەی فێڵ بکا خوای گەورە لەناوی دەبا، خۆ لە شتێ مەدەن خۆتان باش دەزانن کە ئەوە نین وەك خۆتان دەردەخەن، خوای گەورەش وازتان لێ ناهێنێ تا تاقیتان نەکاتەوەو نهێنیەکانتان بۆ خەڵکی دەرنەخات، خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿الم(١)أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ: ئاخۆ مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوە، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێ و توشی هیچ ئەزمونێ نابن؟!﴾العنكبوت/١-٢.

کاتێ پیلانگێڕەکان لە دیمەشق دەرچوون وتیان: واز لە عێراق و شام بێنن، نەشگەڕێنەوە بۆ کوفە، تا خەڵکی پێتان خۆش نەبن لەوەی بەسەرتان هاتوە، بەڵکو بچن بۆ جەزیرە-کە دەکەوێتە نێوان دیجلەو فوراتەوە-.

**والی جەزیرە و حومص (عبدالرحمنی کوڕی خالید کوڕی وەلیدﷺ) بوو، کاتێ هەواڵیانی بیست، ناردی بە شوێنیاندا، زۆر بەتوندی قسەی لەگەڵ کردن و، پێی وتن:**

سەبەئیەکان لەلای عبدالرحمنی کوڕی خالید لە جەزیرەدا

**ئەی ئامرازی شەیتان، نە بەخێربێن و نە سەرچاوەمان بێن! شەیتان بە سەرشۆڕی و دەست بەتاڵیەوە گەڕاوەتەوە، کەچی ئێوە بۆ ناهەقی چالاکانە کاردەکەن!**

**خوای گەورە زیانم لێ بدات لەگەر تەمێتان نەدەم و سوکتان نەکەم، ئەی کەسانێ کە کەس نازانێ ئێوە چین" عەرەبن یا عەجەمن، ئەوەی بە (سەعید) و (موعاویە)تان وتوە بە منی نەڵێن! من کوڕی (خالیدی کوڕی وەلید)م، من کوڕی ئەو کەسەم کە ڕۆژگار قاڵی کردۆتەوە و هەڵگەڕاوەکانی سەرکوت کردوە، سوێند بەخوا ریسواتان دەکەم.**

ئیبن خالید بە ئەوپەڕی توندوتیژی و حەزمەوە رەفتاریان لەگەڵدا دەکات

**(عبدالرحمنی کوڕی خالید) مانگێك لای خۆی هێشتنیەوە، بەوپەڕی توندوتیژی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن، بە وێنەی (سەعید) و (موعاویەﷺ )نەرم و نیانی لەگەڵ نەنواندن، هەرکاتێ بڕۆیشتایە لەگەڵی دەچوون و ئەگەر سوار ببوایە لەگەڵی سوار دەبون و ئەگەر غەزای بکردایە ئەوانیش دەیانکرد، هەر بۆنەیەك بهاتایە پێشەوە ئەوانی تێدا زەبون دەکرد.**

**هەر کاتێکیش روبەڕووی سەرکردەکەیان (صەعصەعەی کوڕی صوحان) دەبویەوە، پێی دەوت: (ابن الخطیئة: کوڕی خراپە)! ئایا دەزانی هەر کەسێك چاکە باشی نەکات خراپە چاکی دەکات! هەر کەسەش نەرم و نیانی دادی نەدات، توندوتیژی چارەسەری دەکات!**

**هەروەها پێی دەوتن: بۆچی وەڵامم نادەنەوە، هەروەك لە کوفەدا وەڵامی (سەعید)تان دەدایەوە و لە شامیشدا وەڵامی (موعاویە)تان دەدایەوە؟**

**بۆچی وەك ئەوان لەگەڵم نادوێن؟؟**

**شێوازەکەی (عبدالرحمنی کوڕی خالید) لەگەڵیان سوودی هەبوو، توندوتیژی و رەقیەکەی لاڵی کردن و تۆبە و پەشیمانیان دەربڕی.**

**پێیان وت: داوای تۆبە و لێخۆشبون لەخوای گەورە دەکەین، وازمان لێ بێنە خوا لە پشتت بێ و لێمان ببورە، خوا لێت ببورێ!**

ئەشتەری نەخەعی لەلای عوسمان تەوبەی سەبەئیەکان رادەگەیەنێ

**هەموویان لای (عبدالرحمن) لە جەزیرە هێڵرانەوە، (عبدالرحمن) یەکێك لە سەرکردەکانیانی نارد بۆ لای (عوسمانﷺ) کە (ئەشتەری نەخەعی) بوو" بۆ ئەوەی هەواڵی تەوبەو چاکبون و گەڕانەوەیان لە ئاژاوەگێڕی پێ رابگەیەنێ.**

**(عوسمانﷺ )بە (ئەشتەر)ی وت: تۆ و ئەوانەی لەگەڵتان، لە کوێ دادەنیشن دانیشن، من وا لێتان بوورام.**

**ئەشتەر وتی: دەمانەوێ لەلای (عبدالرحمنی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید) بمێنینەوە... باسی چاکە و حەزمی (عبدالرحمن)ی بۆ کرد.**

**ماوەیەك لەلای (عبدالرحمن) لە جەزیرە مانەوە، تەوبە و دامەزراوی و چاکبونی خۆیانیان پیشان دەدا!![1]**

سەبەئیەکانی کوفە بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبن

**ئاژاوەگێڕەکانی کوفە بۆ ماوەیەك بێدەنگ بون، ئەمەش لە مانگەکانی ساڵی (٣٣)دا بوو، پاش ئەوەی سەرانی فیتنە بۆ لای (موعاویە) لەشام دەربەدەر کران، پاشانیش بۆ لای (عبدالرحمنی کوڕی خالید).**

**هەر بۆیە ئاژاوەچیەکانی کوفە رایان وابوو کە بەرژەوەندی وا دەخوازێ بۆ ماوەیەك بێدەنگ بن!!**

**بەڵام سەبەئیەکانی بەصرە بە سەرکردایەتی (حەکیمی کوڕی جەبەلە) فرت و فێڵیان لە خاوەن فەزڵەکانی بەصرە دەکرد و پیلان و درۆیان بۆ هەڵدەبەستان.**

سەبەئیەکانی بەصرە بوختان بۆ ئەشەجی عەبدولقەیس هەڵدەبەستن

**لە چاکترین و بەتەقواترین کەسەکانی خەڵکی بەصرە (ئەشەجی عەبدولقەیس) بوو، کە ناوی (عامری کوڕی عەبدولقەیس) بوو و، گەورە و دەم سپی هۆزەکەی بوو، بە وەفد سەردانی پێغەمبەری خوایﷺ کردووە و لێیەوە فێر بووە، پێغەمبەری خواشﷺ بەم فەرمودەیە ستایشی کردوە: (تۆ دوو رەوشت تێدایە، خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێ: لەسەرخۆیی و نەرم و نیانی)!**

---

١ ـ تأریخ الطبري ٤: ٣٢١-٣٢٢.

(عـامری کـوڕی عەبدولقـەیس) لـە سـەرکردەکانی جیهـادی قادسـیە و شـوێنی تـر بـوو، لـە بەصـرە دادەنیـشت، خـاوەن بەشـێکی گـەورە لـە چاکەکاری و تەقوا بوو!

لەڕێدەرچووەکان درۆیان بۆ هەڵبەست و بە شتی ناڕەوا تۆمەتباریان کرد!! (عوسمان)یش ناردی بۆ لای (موعاویە) لەشامﷺ، کاتێ (موعاویە) لەگەڵی دوا و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد، بەڕێزی و پاکی و ڕاستگۆیی ئەو و، درۆ و دەم هەڵبەستی لەڕێ دەرچوانی بۆ دەرکەوت.

ئەوەشی لەپشتەوەی درۆهەڵبەستەکەی (عامری کوڕی قەیس)ەوە بوو، (حومرانی کوڕی ئەبان) بوو، کە پیاوێکی یاخی و بێدین بوو، کە لەماوەی عیددەدا ئافرەتێکی مارە کردبوو! کە (عوسمانﷺ) بەمەی زانیبوو لێکی جیاکردنـەوە و، بـەهۆی ئـەم تاوانـەوە لێی‌دا و سـزای دا و بـۆ بەصـرە دەربەدەری کرد، لەوێش لەگەڵ سەرکردەی سەبەئیەکانی ئەوێ (حەکیمی کوڕی جەبەلە)ی دز بەیەك گەیشتن![1]

ئیبن سەبەء سالی ٣٤ بۆ جولانەوە دیاری دەکات

لـە سـاڵی (٣٤)دا، سـاڵی یانزەهـەم لـە خەلافـەتی (عوسمـان)داﷺ، (عبـداللەی کـوڕی سـەبەء)ی جولەکـە نەخشەکەی تۆکمـە کـرد، پیلانـەکانی داڕشـت، لەگـەڵ کۆمەڵـە سـەبەئیەکەیدا دەرچـوونیان بەسـەر خەلیفـە و والیەکانی ڕێك خست.

(ئیبن سەبەء) لە پێگەی پیلانەکانیەوە لە میصر، پەیوەندی کرد بە شەیتانەکانی کۆمەڵەکەی لە بەصرە و کوفە و مەدینە، لەگەڵیاندا لەسەر درێـژەی پیلانـەکانی ڕێـك کـەوت، نوسـین و نامەگۆڕینـەوەی لەگـەڵیان بەردەوام بوو!

لەوانـەی نوسـین و نامەگۆڕینـەوەی لەگـەڵ هـەبون، سەبەئیەکانی کوفە بـوو، کـە زیـاد لـە دە کەسـیان بـۆ شـام و پاشـتر بـۆ جـەزیرە بـۆ لای (عبـدالرحمنی کـوڕی خالیـدی کـوڕی وەلیـد) دەربـەدەر کرابـون، لـەپاش

---

[1] ـ سەیری درێـژەی دەم هەڵبەستەکانی (حیمرانـی کـوڕی ئـەبان) و سـەبەئیەکان دژ بـە (عامری کوڕی عەبدولقەیس) لە مێژووی طبریدا بکە: ٤: ٣٢٧-٣٢٨.

دەربەدەرکردنی ئەو لەڕێدەرچوانە سەرکردەی سەبەئیە قین لە دڵەکانی کوفە (یەزیدی کوڕی قەیس) بوو.

ئیبن سەبەو سەبەئیەکانی کوفە دەجوڵێنێ

لەساڵی (٣٤)دا کوفە لە پیاوماقوڵ و ناسراوەکانی چۆڵ ببو، چونکە بەرەو جیهاد چووبون، تەنها دەشتەکی و ئاژاوەگێڕەکان مابونەوە، کە ئەمانەش سەبەئی و لەڕێلادەرەکان کاریان تێکردبون و بە بیروبۆچونی پیس بارگاویان کردبون و دژ بە والیەکەی (عوسمان) لەسەر کوفە "(سەعیدی کوڕی عاص ﷺ)، ورووژاندبونیان و هانیان دابون.

بارودۆخی خەڵکی کوفە کاتیجوڵانەوەی سەبەئیەکان

(طەبەری) لەسەر بارودۆخی کوفە لەساڵی (٣٤)دا وتویەتی: (سەعیدی کوڕی عاص) لە ساڵی یانزەی ئەمارەتی عوسماندا بە وەفدێك چوو بۆ لای (عوسمان ﷺ).

(سەعید) پێش دەرچوونی (ئەشعەثی کوڕی قەیس)ی ناردبوو بۆ (ئازەربیجان) و (سەعیدی کوڕی قەیس)یش بۆ (ڕەی) و (نوسەیری عوجلی) بۆ (هەمەذان) و (سائیبی کوڕی ئەقرەع) بۆ (ئەصبەهان) و (مالیکی کوڕی حەبیب) بۆ (ماه) و (حەکیمی کوڕی سەلامە) بۆ (موصڵ) و (جەیریی کوڕی عبدالله) بۆ (قرقیسیا) و (سەلمانی کوڕی ڕەبیعە) بۆ (الباب) و (عوتەیبەی کوڕی نەهاس) بۆ (حەلوان) ناردبوو.

لەسەر کاروباری جەنگیش (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) دانا، جێگرەکەیشی پاش دەرچوونی (عەمری کوڕی حورەیث) بوو.

بەم شێوەیە کوفە لە پیاوماقوڵ و ناسراوەکانی چۆڵ ببو، تەنها لاسار و ئاژاوەگێڕەکانی تێدا مابوو.[١]

دەرچوونی یەزیدی کوڕی قەیس بەسەرکردایەتی سەبەئیەکانی کوفە

ئا لەم بارەودۆخەدا سەرکردەی سەبەئیەکانی کوفە (یەزیدی کوڕی قەیس) دوای ڕێکەوتن لەگەڵ شەیتانەکەی میصر (ئیبن سەبەء) هاتە دەرەوەو لەگەڵیشیدا ئەو سەبەئیانەی بەنهێنی هاتبونە ڕێکخراوی (ئیبن سەبەء)ەوەو ئەو ئاژاوەگێڕانەی پێیان کاریگەر ببون بەشدارییان کرد.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣٠-٣٣١.

**(طەبەری) سەبارەت بە یەکەم لەڕێ دەرچوونی ئاشکرای سەبەئیەکان لە ساڵی (٣٤)دا وتویەتی:**

قەعقاعی کوڕی عەمر جولانەوەی یەکەم لەناو دەبات

**(یەزیدی کوڕی قەیس) بە مەبەستی لەکارخستنی (عوسمانﷺ) کەوتە ڕێ، چووە مزگەوتەوەو تیایدا دانیشت، لە مزگەوتدا سەبەئیەکانی لێ کۆببوەوە، ئەوانەی (ئیبن سەوداء) لە میصرەوە نوسراوی بۆ دەناردن، جا کاتێ لەڕێدەرچووەکان لە مزگەوتدا کۆبونەوە، (قەعقاعی کوڕی عەمر)ی ئەمیری جەنگ بەکاروبارەکەیانی زانی، قۆڵ بەستی کردن و (یەزیدی کوڕی قەیس)ی سەرکردەیانی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردنی.**

**کاتێ (یەزید) توندوتیژی و وریایی و زیرەکی (قەعقاع)ی بینی، ئامانجەکەیانی لەلا ئاشکرا نەکرد و نەخشەی دەرچوون دژ بە (عوسمان) و لەکارلابردنی (عوسمان)ی پێ نەوت، وای بۆ بەدەرخست ئەوەی کە ئەو و کۆمەڵەکەی مەبەستیانە لەکارخستنی (سەعیدی کوڕی عاص)ی والی و داواکردنی والیەکی ترە لەجێگاکەی ئەودا.**

**ئەمەش کارێکی ئاسانە و خەڵکی پێش ئەمانیش داوایان کردووەو وەڵامی داواکاریەکەشیان درایەوە.**

**هەر بۆیە (قەعقاع) بە بیستنی قسەکانی (یەزید)، هەموویانی بەرەڵا کرد.**

**پاشان بە (یەزید)ی وت: بۆ ئەم مەبەستە لەمزگەوتدا دامەنیشە و خەڵکیشت لەدەور کۆنەبێتەوە، لەماڵی خۆت دانیشە، ئەوەی دەتەوێ لە خەلیفەی داواکە و بۆت جێبەجێ دەکات![1]**

**ئەمیری جەنگ (قەعقاعی کوڕی عەمر) نەیدەزانی ڕێکخستنی نهێنیی پیس هەیە و ئەمانەش تەنها چەند ڕەگەزێکن تیایدا و ئامانجی سەرەکیشیان لەکارخستنی خەلیفەیە!**

**ئەگەر ئەمەی لێ بزانینایە، لێپرسینەوەیەکی تر و سزایەکی زۆر توندی دەدان!!**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣١.

(یەزیدی کوڕی قەیس) لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشت و بۆ دەرچوون و ئاژاوە و شۆڕش ناچار بوو دەستکاری نەخشەکەی بکات.

یەزیدی کوڕی قەیس نامە بۆ سەبەئیە دەربەدەر کراوەکانی لای ئیبن خالید دەنوسێ

ئەم سەبەئیە (یەزیدی کوڕی قەیس) پیاوێکی بەکرێگرت و چەند درهەم و هێسترێکی پێدا و فەرمانی پێکرد بەخێرایی و نهێنیەوە بچێ بۆ لای سەبەئیەکانی خەڵکی کوفە کە (عوسمان) بۆ شام و پاشان بۆ جەزیرە دەربەدەری کردبون و پاشان لە لای (عبدالرحمنی کوڕی خالید) نیشتەجێ ببون و پەشیمانی و پاشگەزبونەوەیان بەدەرخستبوو، تەنانەت سەرکردەکەیان (ئەشتەری نەخەعی) کە (مالکی کوڕی حارثی نەخەعی)یە، چوو بۆ لای (عوسمان)و پەشیمانی خۆی و کۆمەڵەکەی بۆ دەرخستبوو!

دووەم جولانەوەی سەبەئیەکان لە کوفە

(یەزید) لە نوسراوەکەیدا بە برا شەیتانەکانی وتبوو: کاتێ ئەم نوسراوەم پێتان گەیشت، لەدەستتان دایمەنێن، تا دەگەنەوە لام، ئێمە نامەگۆڕینەوەمان لەگەڵ براکانی میصرماندا کردووە-کە سەبەئیەکانی ئەوێیە- و لەسەر دەرچوون لەگەڵیان ڕێکەوتوین!

کاتێ (ئەشتەر) نامەی (یەزید)ی خوێندەوە، یەکسەر بەرەو کوفە دەرچوو و بە برا لەڕێدەرچووەکانی گەیشتەوە، (عبدالرحمنی کوڕی خالید)یش بەدوایاندا گەڕا، بەڵام نەیبینینەوە، دەستەیەك بەدوایاندا دەنێرێ، بەڵام پێیان نەگەیشتن.

جارێکی تریش (یەزیدی کوڕی قەیس) پەیوەندی کردەوە بە کۆمەڵەکەیەوە، ئەوانیش جارێکیتر پەیوەندییان کرد بە هەرچی و پەرچی و ئاژاوەگێڕەکانی کوفە و لە مزگەوت کۆبونەوە، (ئەشتەری نەخەعی) لە مزگەوتدا هات بۆ لایان، دەستی کرد بە هاندان و هەڵچواندنیان و پاڵنانیان بۆ شۆڕش و دەرچون!

لەو قسانەی پێیانی وتبوو:

من لەلای خەلیفە (عوسمان)ەوە هاتووم بۆ لاتان، والیەکەتانم لەلای ئەو بەجێهێشت، (عوسمان) و (سەعید) لەسەر کەمکردنەوەی

پێبەخشینەکانتان و دابەزاندنی سامانەکانتان لە دووسەد درهەمەوە بۆ سەد درهەم کۆك و ڕێك بون.

ئەشتەری نەخەعی درۆ بەدەم عوسمانەوە دەکا

(ئەشتەر) لە قسەکەیدا درۆی کرد، (عوسمان) و (سەعید)ﷺ قسەیان لەوە نەکردبوو، بەڵام ئەمە شێوازی سەبەئیەکان بوو بۆ بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە و دەمهەڵبەستی تا خەڵکی ڕەشۆکی پێ بوروژێنن.

ئەشتەر بەم قسانەی لە مزگەوتدا سوکایەتی بە خەڵکی کرد، کاری کردە سەر هەرچی و پەرچی و ئاژاوەچیەکان و وروژاندنی و، لە مزگەوتەکەدا هەراو هوریایەکی زۆر کەوتەوە.

ژیر و ناسراو و پیاوماقوڵ و پیاوچاك و خواناسە موسڵمانەکانی وەك (ئەبو موسای ئەشعەری) و (عبداللە ی کوڕی مەسعود) و ( قەعقاعی کوڕی عەمرﷺ) کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵی، بەڵام (یەزیدی کوڕی قەیس) گوێی لێنەگرتن و وەڵامی نەدانەوە!

سەبەئیەکان ئاژاوەچیەکانی کوفە دەوروژێنن

(یەزیدی کوڕی قەیس) لەناو ئەو هەموو ئاژاوەچی و هەرچی‌و پەرچییانەی ناو مزگەوت و دەرەوەیدا هاواری کرد و وتی: من دەچمە دەرەوە بۆ ڕێگەکانی مەدینە، تا ڕێ نەدەم بە سەعیدی کوڕی عاص بێتە کوفەوە، ئەو کەسەی دەیەوێ لەگەڵم دەرچێ بۆ نەهێڵانی هاتنە ناوەوەی سەعید و داواکردنی والیەك لە جێگاکەی، با بێت لەگەڵمدا!!

سەبەئی و هەرچی و پەرچیەکان وەڵامی هاوارکردنەکەیان دایەوە و نزیکەی هەزارکەس لەگەڵی دەرچوون!![1]

کاتێ سەبەئی و ئاژاوەگێڕەکان بۆ فیتنە و شۆڕش کردن چونە دەرەوە، لە مزگەوتەکەدا موسڵمانە ناسراو و پیاوماقوڵ و لەسەرخۆکان مانەوە.

جێگری والی (عەمری کوڕی حورەیث) چووە سەر دوانگە و داوای برایەتی و یەکێتی موسڵمانان و ڕێگری ناکۆکی و جیاوازی و ئاژاوەگێڕی و لەڕێدەرچوونی لێکردن، داواشی لێکردن کە گوێ لە لەڕێدەرچوان و یاخیبوان نەگرن!

---

١ ـ تاریخ الطبري ٤: ٣٣١.

قەعقاعی کوڕی عەمر کوشتنی سەرکردە سەبەئیەکان بەباش دەزانێ

(قەعقاعی کوڕی عەمر) پێی وت: تۆ ناتوانی ڕوبەڕووی ئەمانە ببیتەوە، چونکە لافاو ڕەت ناکرێتەوەو ڕوباری فوراتیش کەس ڕێڕەوەکەی پێناگۆڕێ، ئەم ئاژاوەچی و فیتنەگێڕانەش تەنها بە لەمل دان و کوشتنیان بەشمشێر لەناو دەبرێن!!

ئەمەش فیتنە و خوێنڕشتنی لێ دەکەوێتەوەو ئەمانەش نرخی یاخیبون و لەڕێدەرچوونەکەیان دەدەنەوە، کەواتە ئارام بگرە و وازیان لێ بێنە تا والی دێت!

(عەمری کوڕی حورەیث) وتی: ئارام دەگرم هەتا والی دێت.. جا ڕۆیشتەوە ماڵی خۆی!

یەزیدی کوڕی قەیس لەگەڵ هەزار ئاژاوەچی بۆ (جەرعە) دەرچون

(یەزیدی کوڕی قەیس) کە (ئەشتەر) و هەزار کەسی تر لە لەڕێدەرچووەکانی لەگەڵدابوو، بۆ ڕێگەیەکی شار دەرچووبون کە بە (جەرعە) ناودەبرێت!

کاتێ لە (جەرعە) مۆڵیان دابوو، (سەعیدی کوڕی عاص)یان لێ بەدەر کەوت، کە لەلای (عوسمان)ەوە دەگەڕایەوە، پێیان وت: بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوی، پێویستمان بەتۆ نیە، ناهێڵین بێیتە ناو کوفەوە، بە (عوسمان)یش بڵێ ئێمە والیمان ناوێ، دەمانەوێ (ئەبوموسای ئەشعەری) لەجێی تۆ بکا بە والی!!

سەبەئیەکان ڕێ لە هاتنە ناوەوەی سەعیدی کوڕی عاص دەگرن بۆ ناو کوفە

(سەعید رضي الله عنه) پێی وتن: بۆچی بە هەزار کەسەوە دەرچوون و ئەم قسەیەم پێ دەڵێن؟ هەر ئەوەندەتان بەس بوو بە پیاوێکدا داواکاریەکەتان بگەیەنن بە ئەمیری بڕواداران و لە ڕێگەشدا یەك کەس بوەستایەو ئەوەی پێم ڕاگەیاندایە، ئایا هەزار کەسی خاوەن عەقڵ بۆ یەك کەس دەردەچێ؟[1]

(سەعیدی کوڕی عاص رضي الله عنه) ڕای وابوو حیکمەت لەوەدایە ڕوبەڕوویان نەبێتەوەو ئاگری فیتنە دانەگیرسێنێ، بەڵکو هەوڵی دامرکان و کپ کردنەوەی بدا، یا بەلای کەمەوە هەڵگیرسانی دوا بخا، ئەمەش هەمان ڕای (ئەبو موسای ئەشعەری) و (عەمری کوڕی حورەیث) و (قەعقاعی کوڕی عەمر) رضي الله عنهم بوو لە کوفەدا.

---

١ ـ تاريخ الطبري ٤: ٣٣٢.

سەعیدی کوڕی عاص هەواڵی یەکەم یاخیبونی سەبەئیەکان بە عوسمان دەدا

(سەعیدی کوڕی عاص) گەڕایەوە بۆ لای عوسمان و هەواڵی ئەو خەڵکە لەڕێدەرچووەی پێ ڕاگەیاند، (عوسمان) پێی وت: چیان دەویست؟ ئایا دەستیان لە گوێڕایەڵی کێشاوەتەوە؟ ئایا لە فەرمانی خەلیفە دەرچون و گوێڕایەڵی نەکردنیان بۆی ڕاگەیاندوە؟

(سەعید) پێی وت: نەخێر، وای دەردەخەن کە نایانەوێ والیان بم، والیەکی تریان لەجێم دەوێ!

عوسمان پێی وت: کێیان دەوێ بە والی؟

سەعید وتی: (ئەبوموسای ئەشعەری)یان دەوێ.

عوسمان، ئەبوموسای ئەشعەری بە والی کوفە دادەمەزرێنێ

عوسمان وتی: وا (ئەبو موسا)مان دەمەزراند و جێگیرمان کرد بە والی لەسەریان، سوێند بەخوا بیانو بۆ کەس ناهێڵینەوەو بەڵگەشیان پێ ناهێڵین، بەو شێوەیەی کە پێویستە ئارام دەگرین لەسەریان، تا مەبەستی ڕاستەقینەیان بزانین.!!

(عوسمان) نوسراوێکی بۆ (ئەبو موسای ئەشعەری) نووسی بە دامەزراندنی بە والی لەسەر کوفە.[1]

پێش گەیشتنی نوسراوی (عوسمان) بە دامەزراندنی (ئەبوموسا) بە والی، لە مزگەوتی کوفەدا چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا لە هەوڵی ڕێکخستنی کاروبارەکان و هێورکردنەوەی خەڵکی گشتی دا بون، بەڵام نەیانتوانی بە ئەنجامی بگەیەنن، چونکە سەبەئیە ڕق ئەستورەکان بەسەر هەرچی و پەرچی و ئاژاوەچیەکاندا زاڵ ببون و وروژاندبویان، هەر بۆیە گوێبیستی هیچ دەنگێکی عەقڵ یا ژیربێژی نەدەبون.

گفتوگۆیەك لەنێوان ئەبومەسعود و حوذەیفە دەربارەی یاخیبون و هەڵگەڕانەوە

لەکاتی یاخیبون و هەڵچوون و فیتنەکەی ناو مزگەوتی کوفەدا دوو هاوەڵی پێغەمبەری‌خوا لە مزگەوتدا بون، کە ئەوانیش (حوذەیفەی کوڕی یەمان) و (ئەبو مەسعودی عوقبەی کوڕی عەمری ئەنصاری بەدری )بون.

(ئەبومەسعود) زۆر تورەبوو بە یاخیبون و شۆڕشی هەرچی

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣٢.

وپەرچییەکان و دەرچونیان بۆ (جەرەعە) و لەکارخستنی (سەعید)ی والی و گوێڕایەڵ نەبونیان بۆی، کە ئەوە یەکەم جارە ڕوودەدات، بەڵام (حوذەیفە) دووربین تر بوو و، لەگەڵ ڕوداوەکاندا بەشێوەیەکی بابەتی و بیرکردنەوەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد.

(ئەبومەسعود) بە (حوذەیفە)ی وت: ئەمانە لە (جەرەعە) بە سەلامەتی ناگەڕێنەوە، خەلیفە سوپایەك بۆ ئەدەب دانیان دەنێرێ و خوێنێکی زۆری تێدا دەڕێژێ.

(حوذەیفە)ش وەڵامی دایەوەو پێی وت: سوێند بەخوا دەگەڕێنەوە بۆ کوفە و هیچ پێکدادان و جەنگێکیش روو نادات و هیچ خوێنێکیش لەوێ ناڕژێ.

ڕای حوذەیفەی کوڕی یەمان لە جولانەوەی سەبەئیەکان

ئەوەی دەربارەی ئەم فیتنەیە دەیزانم، هەر ئەوەیە کە لە پێغەمبەری خواوەﷺ فێربووم کاتێك کە لە ژیاندا مابوو، پێش ئەوەی وەفات بکا هەر ئەو هەواڵی ئەم فیتنانەی پێ ڕاگەیاندین.

پێغەمبەری خواﷺ پێی ڕاگەیاندین، پیاو هەیە بەیانی کە ڕۆژ دەکاتەوە ئیسلامە، کە ئێوارە دادێ هیچ شتێکی لە ئیسلام لەگەڵدا نەماوە، پاشان لەگەڵ موسڵمانان دەجەنگێ، پاشگەز دەبێتەوە(مرتد) و دڵی هەڵدەگەڕێتەوە و لە ڕۆژی دواتردا خوا دەیکوژێ.

ئەمە لەمەولا دەبێ!![1]

لە ڕاستیدا (حوذەیفەی کوڕی یەمانرضي الله عنه )پسپۆڕ بوو لە زانستی فیتنەدا، بەپێی بیستن و زانیاریەکانی لە پێغەمبەری خواوەﷺ هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەبەئیەکانی کوفە و جگە لەوانیشدا دەکرد، ئەو فەرمودانەی لەو بارەیەوە لەبەری کردبون هێنایەوە یادی خۆی، لێرەوە حەقیقەتی ڕوداوەکانی دەوروبەری تێدەگەیشت، بە دووری نەدەبینی و سەریشی لێی سوڕ نەدەما، ئەوەندەشی پێی دەکرا هەوڵی چاکسازی دەدا!!

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣٥.

گفتوگۆی ئەبوموسا لەگەڵ سەبەئیەکان پێش دامەزراندنی بە والی

بەڵام (ئەبو موساﷺ) لە هەوڵی هێورکردنەوەی بارودۆخەکەدابوو، قەدەغەی خەڵکی دەکرد لە یاخیبون و پێی وتن: خەڵکینە! بۆ ئەم جۆرە سەرپێچیانە دەرمەچن، ئەم جۆرە یاخیبونە ئەنجام مەدەن، پابەند بن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایان بن، خۆ بپارێزن لە پەلەکردن و ئارام بگرن.

لەکاتی یاخیبون و لەڕێدەرچوونەکەدا هیچ ئەمیرێك لە کوفەدا نەبوو، سەبەئیەکان هاتن بۆ لای (ئەبوموساﷺ) و پێیان وت: پێشکەوە پێشنوێژیمان بۆ بکە!

پێی وتن: بەو مەرجە نوێژتان بۆ دەکەم کە فەرمانبەر و گوێڕایەڵی (عوسمان) بن!

وتیان: باشە، ئێمە گوێبیست و گوێڕایەڵی (عوسمان)ین.

لەوەدا ڕاستگۆ نەبون، بەڵکو ئامانجە ڕاستەقینەکانیان لە خەڵکیتر دەشاردەوە.

(ئەبوموساﷺ) نوێژی بە خەڵك دەکرد تا ئەوکاتەی نوسراوی (عوسمانیﷺ ) بۆ هات کە ببێ بە والی کوفە.

کاتێك کاروبارەکان لە کوفەدا تا ماوەیەك هێوربونەوە، لەساڵی (٣٤)دا (حوذەیفەی کوڕی یەمان) گەڕایەوە بۆ (ئازەربیجان) و (الباب)، لەوێ سەرکردایەتی سوپاکانی جیهادی دەکرد، کاربەدەست و والیەکانیش گەڕانەوە سەر کارەکانیان لەناوچەکانی فارسدا.!

نوسراوی عوسمان بۆ ئەوانەی لەکوفە دەرچووبون

(عوسمانی کوڕی عەفانﷺ )نوسراوێکی بۆ ئەوانە نووسی کە لە کوفەدا دەرچووبون، حیکمەتی بەدەمەوەچوونی داواکەیان و لەکارخستنی سەعید و دامەزراندنی (ئەبوموسا)یان لە جێگەیدا بۆ ڕون دەکاتەوە، ئەو نامەیە چەندەها دەلالەتی گرنگ لەخۆ دەگرێ و ڕێگاچارەی (عوسمان)یشﷺ ڕوون دەکاتەوە لە ڕووبەڕووبونەوەی فیتنەدا و هەوڵدانی بۆ دواخستنی کلپەسەندنی بەپێی توانا، لەگەڵ ئەوپەڕی دڵنیابونی لەوەی کە هەر دەبێت بێت و بێتواناشە لە ڕووبەڕووبونەوەیدا،

ئەمەشی لە پێغەمبەری خواوەﷺ زانیوە.

(عوسمانؓ )لە نامەكەیدا گوتویەتی:

((دوای سوپاس و ستایش:

ئەوەی هەڵتانبژاردووە كردوومانە بە ئەمیرتان، (سەعید)مان بۆ لابردن، سوێند بەخوا عەیب و نەنگی خۆم دەخەمە بەردەستتان، هەموو ئارامم بۆتان دەخەمە گەڕ، بەهەموو توانام هەوڵی چاكردنەوەتان دەدەم، هەرچیتان پێ‌خۆشە لەوانەی سەرپێچی خوای تێدا نیە داوام لێ بكەن، پێتانی دەبەخشم، چیتان لا ناخۆشە داوا بكەن لێتان ببورم، بێجگە لەوانەی خوای داوای كردووە، لێتان دەبورم و لەسەرتانی لادەبەم، لە هەموو ئەو شتانەدا دادەبەزمە سەر ئەوەی كە پێتان خۆشە، ئەمەش تاكو هیچ بەڵگە و بیانویەكتان لەسەرم نەمێنێ))!!

خوای گەورە لە ئەمیری بڕواداران (عوسمان) ڕازی بێت، چەند صاڵح و سینگ فراوان بووە، سەبەئی و لەڕێ‌دەرچووە ڕق ئەستورەكان چەندە ستەمیان لێی كردوەو درۆ و بوختانیان بەدەمەوە كردوە!!

عوسمان لەگەڵ گرنگترین والیەكانی كۆدەبێتەوەو راوێژیان پێ‌دەكا

دوای ئەوەی بارودۆخ لە بەصرە و كوفە بۆ ماوەیەك هێور بویەوە، (عوسمان)ؓ گرنگترین والی وڵاتەكانی بانگهێشت كرد بۆ ئەوەی راوێژیان پێ بكا، لەوانەی ئامادەبون (موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان) و (عبداللّەی كوڕی عامر) و (عبداللّەی كوڕی سەعد) و (سەعیدی كوڕی عاص) و (عەمری كوڕی عاصؓ).

كاتێ لەگەڵیان كۆبوەوە پێی وتن: هەر مرۆڤە و وەزیر و ئامۆژگاریكەری خۆی هەیە، ئێوەش وەزیر و ئامۆژگاریكەری منن، بینیتان خەڵك چییان كرد، داواشیان لێ‌كردم هەندێ لە كاربەدەستەكانم لەكار بخەم، ئەوەی پێیان خۆشە بۆیان ئەنجام دەم، ڕای خۆتان بخەنە كار و ئامازەم پێ بدەن.

ئامازەكەی عبداللە ی كوڕی عامر

(عبداللّەی كوڕی عامرؓ )والی بەصرە وتی: ئەوان بۆیە وا دەكەن چونكە بە جیهادەوە سەرقاڵ نین، دەستیان خاڵی یە بۆ پڕوپاگەندە و

فیتنەو ئاژاوەچیەتی، کاتیانی پێ پڕ دەکەنەوە و خۆیانی پێوە سەرقاڵ دەکەن.

ئەی ئەمیری بڕواداران، من رام وایە فەرمانیان پێ بدەی بە جیهادکردنی دوژمنان، پێیان سەرقاڵ نابی، لە غەزاکاندا بیانهێڵەوە و لە کەلێن و قوولەکاندا بیانهێڵیەوە، لەوکاتەدا هەریەکەیان تەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە، بیرکردنەی تەنها لەلای وڵاخ و چەك و شەڕکردن و لابردنی ئەسپێی فەروەکەیەتی.

پاش ئەوەی (عوسمانﷺ) قسەکەی (ئیبن عامر)ی بیست، رووی کردە (سەعیدی کوڕی عاصﷺ) و پێی وت: ئەی تۆ رات چیە؟

ئاماژەکەی سەعیدی کوڕی عاص

(سەعید) پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، نەخۆشیەکە بنبڕ بکە، ئەوەی لێی دەترسێی بیپچڕێنە، بە ڕای من بکە دەیپێکی.

پێی وت: رای تۆ چیە؟

(سەعید) وتی: هەموو قەومێك سەرکردەی خۆی هەیە، گەر سەرکردەکانیان نەمان پەرتەوازە دەبن، من رام وایە سەرکردەی ئەم لەڕێدەرچووە ئاژاوەگێڕانە بکوژرێن، کاتێ کە سەرکردەکانیان کوژران پەرتەوازە دەبن و لەسەر کارێك کۆنابنەوە!!

قسەی عوسمان لەسەر رایەکەی سەعید

(عوسمانﷺ) لەسەر رایەکەی (سەعید) دوا و وتی:

لە ڕاستیدا ئەمە رایەکی پەسەندە، ئەگەر ئەوەی تێدا نەبوایە!!

واتە: ئەمە رایەکی پێکراوەو راستە و یەکلاکەرەوە و سەرکوتکەری فیتنەیە، بەڵام مەترسیەکەی بریتیە لە کوشتنی خەڵکێکی بە رووکار موسڵمان، چۆن دەبێ خەلیفە موسڵمانانی بن دەستەکەی خۆی بکوژێ؟

ئایا وەڵامی (عوسمانﷺ) بۆ (سەعیدی کوڕی عاص) نزیك نیە لە وەڵامی پێغەمبەر موحەممەدﷺ، کاتێ (عومەر)ﷺ ئاماژەی پێدا بە کوشتنی سەرکردەی دووڕووەکان (عبداللەی کوڕی ئوبەی) کاتێك لە جەنگی (بەنی موصطەلەق)دا موسڵمانانی ناکۆك و پەرتەوازە کرد؟

(عومەرﷺ) پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا! لێمگەڕێ با لە گەردنی دەم!

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: خەڵکی دەڵێن موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ!!

(عوسمان)یشرضي الله عنه وەك ئەوەی بڵێ: خەڵکی دەڵێن خەلیفە عوسمان موسڵمانانی بن دەستی خۆی دەکوژێ!!

ئامازەکەی موعاویە و ئیبن ئەبو سەرح

پاشان (عوسمانرضي الله عنه) پرسیاری رای (موعاویەرضي الله عنه)ی کرد، (موعاویە)ش ئامـاژەی پێـدا کـە کاربەدەسـتەکانی بگەڕێنێتـەوە ولاتـی خۆیـان و، کاروبارەکان بە گورجوگۆڵی ڕێکوپێك بکەن، پێی وت: من خەڵکی شامت بۆ زامن دەکەم.

(عبداللەی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح) وتی: لە راستیدا خەڵك تەماحکارن، لەو ماڵەیان پێببەخشە، دڵەکانیان بۆت سۆزدار دەبێت!!

قسەیەکی سەیر لەلایەن عەمری کوڕی عاصەوە

(عەمری کوڕی عاصرضي الله عنه) قسەیەکی سەیری بە (عوسمان) وت: من وادەبینم تۆ شتێك بە خەڵکی دەکەی پێیان ناخۆشە، سوربە لەسەر ئەوەی کە راستی بکەیتەوە، ئەگەر هەر نایکەی سوربە کە خۆت لەکار بخەی، ئەگەر هەر نایکەی ئەوا عەزمت جەزم کە و بەرەو پێشەوە بڕۆ!!!

(عوسمانرضي الله عنه)لە قسەکەی (عەمری کوڕی عاص) سەری سوڕما، نەیزانی (عەمر) لە قسەکەیدا بە جدی نیە، پاڵنەرەکەشی لێزانی و زۆرزانیەتی، تا پەیامێك بگەیەنێتە کەسانێکی تر!

هەر بۆیە هەرکە کۆبونەوەکە تەواو بوو، خەڵکەکە بلاوەیان لێکرد، (عەمری کوڕی عاص) هات بۆ لای (عوسمان) و پێی وت:

عەمر مەبەستەکەی لەو قسەیە بۆ عوسمان ڕون دەکاتەوە

ئەی ئەمیری بڕواداران، تۆ زۆر لەوە گەورەتری لەلام، بەڵام زانیم هەندێ لە دەرگاوە قسەو ئاماژەکانمان دەبیستن، ئەم قسانەشمان بە خەڵکی دەگا، پێم خۆشبوو ئەم قسەیەی من بۆ تۆ بەوان بگات، تا متمانەم پێبکەن، وا بزانن من دژ بەتۆم، لەو کاتەدا هەندێ لە فرتوفێڵەکانیان دەزانم، ئەو کاتە یا خێرێکت بۆ دەستەبەر دەکەم یا زیانێکت لێ لادەدەم!![1]

ڕەزای خوات لێبێ (عەمری کوڕی عاص)، چەندە دووربین و لێزان و

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣٣-٣٣٥.

زۆرزان بووی!!

(عوسمان) کاربەدەست و والیەکانی گێڕایەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان، ئەمەش لەساڵی (٣٤)دا بوو، هەریەکەش ئەوەی گونجاو بوو لە ئامادەپێکراوەکان کاریان لەسەری کرد!

پەیوەندییەکانی ونیبن سەبەء لەگەڵ سەبەئیەکانی کوفە و بەصرە

بەڵام سەبەئیەکان بەردەوام بون لەسەر بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دۆرو دەلەسە، لەنێوان خۆیاندا نوسراو و نامەیانە دەگۆڕییەوە، بنکەی هێزیشیان سێ شوێن بوو:

میصر، کە پێگەی (عبداللەی کوڕی سەبەء) بوو.

کوفە، کە سەرکردەکەیان (یەزیدی کوڕی قەیس) و (ئەشتەری نەخەعی) بوو.

بەصرە، سەرکردەکەیان دزی پیاوکوژ (حەکیمی کوڕی جەبەلە) بوو.

سکاڵاکان گەیشتنە لای (عوسمان)، ئەویش ڕاوێژکار و ئەهلی حەل و عەقدی مەدینەی کۆکردەوەو پێی وتن: ئێوە هاوبەشی منن، شاهێدی بڕواداران، دەی ئامارژەم پێبدەن.

ڕاوێژکارەکانی عوسمان ئاماژە بە ناردنی لیژنەی پشکنین دەدەن

پێیان وت: ئاماژەت دەدەینێ کە پیاوانێك لە مەدینەدا بنێریت بۆ وڵاتان، لەوانەی متمانەت پێیان هەیە، بۆ ئەوەی بزانن حەقیقەت و ڕاستی ئەوەی لە والی و ئەمیرەکانی دەگێڕنەوە چەندە و، دڵنیابن لە ڕاستی ئەو قسانەی لەنێو خەڵکیدا بڵاودەکرێتەوەو دەگێردرێتەوە!

ڕاوێژکارەکانی (عوسمان) کە لە گەورە هاوەڵان بون، ویستیان (عوسمان) تەنها بە ڕاپۆرتی والی و ئەمیرەکان واز نەهێنێ، بەڵکو لەو وڵاتانەدا پەیوەندی بە خەڵکی و جەماوەرەوە بکات، بۆ ئەمەش چەند پیاوێکی دەستپاك بنێرێ بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوەو وردبونەوە.

(عوسمان) ئەم ڕایە جوانەی پەسەند کرد و کۆمەڵە پیاوێکی جێ‌متمانەی بۆ وڵات و ناوچە و بنکە جیاجیاکان نارد، لە وڵاتی عەرەب و میصر و شام و عێراق و فارس! تا هەواڵی بۆ کۆکەنەوەو ئاگاداری کاروباری خەڵکی بن.

پشکنەرەکانی عوسمان لە ولاتان

**ئەوانەی بۆ ئەرکی ئەم پشکنینەی ناردن:**

**(موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری)ی رضي الله عنه ڕوەو کوفە نارد!**

**(ئوسامەی کوڕی زەیدی رضي الله عنه)ڕووەو بەصرە نارد.**

**(عەمماری کوڕی یاسری رضي الله عنه)بەرەو میصر نارد.**

**(عبداللەی کوڕی عومەری رضي الله عنه) بەرەو شام نارد.[1]**

ڕاپۆرتی ئیجابی پشکنەرەکان دەربارەی ولاتەکان

**کاتێک نێردراوە ڕەسمیەکان، بەئەرکی پشکنینەکەیان هەستان، گەڕانەوە بۆ لای (عوسمان)، جگە لە (عەممار)رضي الله عنه نەبێ، ڕاپۆرتەکانیان پێشکەشی (عوسمان) و ڕاوێژکارەکانی کرد.**

**وتیان: لەو شتانەی بینیمان هیچمان نەبینی کە بەدڵمان نەبێ، موسڵمانە ناودارەکانی ئەو ولاتانەش لە هیچ شتێکی نارازی نەبون، والیەکانیش لەگەڵ بن دەستەکانیاندا دادگەرن و ئەرکەکانیان بۆ ڕادەپەڕێنن و سەرپەرشتیان دەکەن، ولاتانی موسڵمان لە خەیر و خۆشیدایە.**

**ئەو ئەنجامانەی کە هاوەڵە نێردراوە ڕاستگۆکان پێی گەیشتن سەرجەم ئەو پڕوپاگەندە و هەڵبەستراو و درۆیانەی سەبەئیەکانی بەدرۆ دەخستەوە کە بەردەوام لە دانان و هەڵبەستن و دروستکردنیدا بون دەربارەی ستەم و تاوان و گوناهی والیەکان و پشتگوێخستنی بن دەستەکانیان و، وایان هەڵدەبەست کە ئەمانە لەنێو ولاتانی موسڵماندا بلاو بوەتەوە!!!**

دواکەوتنی عەمماری کوڕی یاسر لە میصر

**هەموو نێردراوەکان گەڕانەوە جگە لە (عەمماری کوڕی یاسر)رضي الله عنه نەبێ، عوسمان و ڕاوێژکاران چاوەڕێیان کرد، وا گومانیان برد کوژرابێ!!**

کاریگەربونی عەممار بە پڕوپاگەندەی سەبەئیەکان لە میصر

**پاش ماوەیەک نوسراوێکی (عبداللەی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح)ی والی میصر بە (عوسمان) گەیشت، تیایدا هەواڵی پێدەدا کە کۆمەڵێک ئاژاوەچی و لەڕێدەرچوو (عەمماری کوڕی یاسر)یان کەمەندکێش کردووەو کاریان تێکردووە!!**

**لەوانە (عبداللەی کوڕی سەبەء-ابن السوداء-) و (خالیدی کوڕی**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤١.

**مەلجەم) و ( سەودانی کوڕی حیمران) و (کەنانەی کوڕی بیشر)!![1]**

**(عوسمان) و راوێژکارەکانی بەم کارەی (عەمماری کوڕی یاسر) و کاریگەربونی بە قسەی ئەو لەڕێدەرچوانەو کەمەندکێشکردنی لەلایەن ئەوانەوە ئازاری زۆریان چەشت.**

هۆی تورەبونی عەممار لە عوسمان

**لە راستیدا (عەممار) لە (عوسمان)ﷺ تورە ببوو، بەهۆی بەسەرهاتێکەوە کە بەسەر (عەممار)دا روویدا، (عوسمان) تەمێی کردبوو، بەڵام (عەممار) لەبیری نەچوبویەوە، هەرچەندە (عوسمان) لەبیری کردبوو، هەر بۆیە (عەممار) جێی متمانەی ئەوبوو، بۆ کارێکی وا گرنگ و گەورە ناردی بۆ میصر، بەڵام سەبەئیەکان کاریان تێی کرد، شاراوەکانی دەرونیان وروژاند، دۆخەکە زاڵ بوو بەسەریدا و قسەکانیان کاریگەری لەسەری هەبوو.**

**هۆکاری لێدانی (عەممار) لەلایەن (عوسمان)ەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناکۆکیەی لەنێوان (عەماری کوڕی یاسر) و (عەباسی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب)دا روویدا، (عەممار) هەڵیکوتابویە سەر (عەباس) و شەڕی لەگەڵ کردبوو و لێی دابوو، پاشان دەستیان کردبوو بە تۆمەتبارکردنی یەکتری، (عەباس) عەمماری تۆمەتبارکرد و (عەمار)یش عەباسی تۆمەتبار کردبوو.**

**(عوسمان)یش حەدی تۆمەتبارکردن(قذف)ی بەسەریاندا پیادە کردبوو و، لە هەردوکیانی دابوو، مەسەلەکەشی لەبیر چووبوو، لەگەڵ ئەوەشدا (عەممار)ی وەك وەفدێکی تایبەتی خۆی بۆ میصر نارد.**

**سەبەئیەکان ئەم روداوەیان قۆستەوەو وەبیری (عەممار)یان هێنایەوە، بەلای خۆیاندا رایانکێشابوو، خوای گەورە لێی خۆش بێت.**

**(عوسمان)ﷺ نێردراوێکی بۆ لای (عبداللەی کوڕی سەعد) نارد و داوای لێکرد کە (عەمار) بەرێزەوە بهێننەوە بۆ مەدینە، ئەوانیش رێزیان لێی گرت و هێنایانەوە بۆ مەدینە.**

---

١ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤١.

عوسمان سەرزەنشتی عەممار لەسەر کردەوەکەی دەکا

**کاتێك (عەممار)ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای (عوسمان)، لەسەر ئەوەی لێی ڕوویدابوو سەرزەنشتی کرد و، پێی وت:**

**(ئەبو یەقظان)! دوای ئەوەی (کوڕی ئەبولەهەب) تۆمەتی بۆت هەڵبەست، تۆش تۆمەتبارت کرد، منیش حەدم لە هەردوکتان دەرکرد، ئایا لەوە لێم توڕەبووی کە مافی تۆم لەو وەرگرتەوەو مافی ئەویشم لەتۆ وەرگرتەوە!**

ئاراستەکردنی هەڵوێستی عەممار و عوسمان

**پاشان (عوسمان)ﷺ وتی: خوایەگیان!وا من هەرچی ستەمکردنێك هەیە لەنێوان خۆم و نەتەوەکەمدا بەخشیم، پەروەردگارم، وا من خۆم لەتۆ نزیك دەکەمەوە بە جێبەجێکردنی حدودەکان لەسەر هەمووکەسێ و گوێشی نادەمێ!.. (عەممار) بڕۆ دەرەوە![1]**

ئاراستەکردنی هەڵوێستی عەممار و عوسمان

**ئایا (عوسمان)ﷺ لەسەر لێدان و تەمێکردنی یەکێك لە ئەندامانی ئوممەتەکەی سەرزەنشت دەکرێ، با هاوەڵێکی پایەبەرزی وەك (عەمماری کوڕی یاسر) بێﷺ؟ ئایا (عومەری کوڕی خەتتاب)ﷺ بە قامچی لە چەندەها هاوەڵی پایەبەرزی نەدا وەك تەمێ و ئەدەب دانی، وەکو (عەمری کوڕی عاص) و (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) و (موعاویە) و (ئوبەی کوڕی کەعب)ﷺ؟**

**ئایا گەرەکمانە (عەممار) و جگە لەویش لە هاوەڵە بەڕێزەکان پارێزراو(معصوم) بن لە هەر لەسەرگرتن و گوناهکاریەك؟ لەگەڵ ئەوەی لای ئێمە هیچ کەسێ جگە لەپێغەمبەری خواﷺ بێگوناه و مەعصوم نیە!!**

عەماریش وەکو ئەبوذەر، حەقیقەتی سەبەئیەکانی بۆ دەرنەکەوتبوو

**دەکرێ و دروستیشە (عەممار) و جگە لەویش لە هاوەڵانی تر، هەڵەو گوناه بکەن، مافی ئەمیری بڕوادارانیشە سزای هەڵەکار و تەمێی سەرپێچیکار بدات، ئیتر (عومەر) بێ یان (عوسمان)!!!**

**کاریگەربونی (عەممار)یش بە بانگەشەی سەبەئیەکان، لەوەوە دێ حەقیقەتی ئامانجەکانیانی نەزانیوەو بەدوربینی و ڕایەکی ڕاست و پێکراو**

---

١ ـ سەیری بەسەرهاتی (عوسمان) لەگەڵ (عەممار) بکە لە (العواصم من القواصم)ی (ئیبن عەرەبی) بە تەحقیقی (محب الدين الخطيب) ٦٤-٦٦.

لەگەڵ گومان و دەم هەڵبەستەکانیاندا هەڵسوکەوتی نەکردووە، بەڵکو گومانی بەخۆیان و قسەکانیان باش بووە..

لەپێش ئەمیشدا (ئەبوذەری غیفاری)ش رضي الله عنه بە قسەکانی (عبداللەی کوڕی سەبەء) کارتێکراو بوو، لەو کاتەی کە لە شامدا قسەی لەگەڵ کردبوو، بە دیوی باشە خوێندبویەوە!

دیارە هاوەڵە بەڕێزەکانیش رضي الله عنهم لە بەرچاوڕۆشنی و بیرتیژی و ئاسۆفراوانی و فیراسەتدا جیاوازن و وەك یەك نین، ئەمەش عەیبداریان ناکات و لە پلەوپایەشیان کەم ناکاتەوە، جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان هەڵوێستی هەریەك لە (ئەبوذەری غیفاری) و (عەمماری کوڕی یاسر) لە ئاست بانگەشەی (ئیبن سەبەء)ی جولەکە و، هەڵوێستی (ئەبودەرداء) و (عوبادەی کوڕی صامیت) رضي الله عنهم لەگەڵ هەمان ئەو جولەکەیەدا جیاوازی زۆر هەیە!! کە توانیان جولەکەیەتیەکەی ئاشکرا بکەن، خوا لە هەموو هاوەڵان ڕازی بێ!!

کۆبونەوەی عوسمان لەگەڵ والیەکانی، دوای حەجی ساڵی -٣٤-

پاش ئەوەی عوسمان ڕاستی بارودۆخی شار و وڵاتانی زانی، داوای لە والیەکانی کرد، پاش وەرزی حەجکردن لەساڵی (٣٤)دا لەگەڵی کۆببنەوە.

لەوانەی هاتن (موعاویە)ی ئەمیری شام و (عبداللەی کوڕی عامر)ی ئەمیری بەصرە و (عبداللەی کوڕی سەعد) ئەمیری میصر و کەسانی تریش بون.

(عوسمان) ڕاوێژی بەو والیانە کرد کە هاتبون بۆ لای و لەگەڵ ئەوانەشدا (عەمری کوڕی عاص)ی والی پێشوی میصرو (سەعیدی کوڕی عاص)ی والی پێشوی کوفەشی بەشداری پێکرد.

کاتێ لەگەڵیان کۆبویەوە، پێی وتن: ئەی بێبەڵا بن، ئەو هەموو سکاڵایە چیە سەبارەت بەئێوە بڵاودەکرێتەوە؟ ئەو هەموو دەنگوباسانە دژتان دەبیسرێ؟ من ترسم هەیە قسەکانیان سەبارەت بەئێوە ڕاست بێت!!

پێیان وت: ئایا دەستەیەك پیاوت نەنارد لەلایەن خۆتانەوە تا لە وڵاتاندا لێکۆڵینەوە بکەن؟ ئایا بە خەڵکی نەگەیشتن و پرسیاریان لێ

نەکردن؟ بۆ ئەوەی ئێمە دەست بخەینە کاروباریانەوە؟

ئایا پێیان نەگەیاندی کە خەڵکی لە خێرو خۆشی‌دایە و خەڵکیش سکالاًیان دژ بە ئێمە پێشکەش نەکردووە؟؟

پاشان پێیان وت: لە ڕاستیدا ئاژاوەچیەکان ڕاستگۆ و چاکەکار نین و قسەکانیانیش بناغەی نیە و تەنها دەنگۆ(إشاعة) و پڕوپاگەندەیە کە لەوانەوە و لەسەر درۆ و دەلەسە دانراوە و دروست نیە لێیان وەربگیرێت![1]

(عوسمان) پێی وتن: ئامارژەم پێ بدەن.

سەعیدی کوڕی عاص ئامارژە بە کوشتنی سەرکردەکانی سەبەئیەکان دەکات

(سەعیدی کوڕی عاص) وتی-چەند قسەیەکی جوان بوو-: ئەم سکالاً و دەنگوباس و دەم هەڵبەستانە هەڵبەستراون و خەڵکانێك لەنهێنی دا دروستی دەکەن و دەیهۆننەوەو پاشانیش لەنێو خەڵکی دا بڵاوی دەکەنەوە، کەسانێکی هەرچی و پەرچی کە خاوەنی تێگەیشتن و مەعریفە نین باوەڕی پێ دەکەن و لە کۆڕەکانیاندا باسی دەکەن و دوای ئەوەش لەنێو خەڵکیدا بڵاودەبنەوە!!

(عوسمان) پێی وت: چارەسەری ئەوە چیە؟

(سەعید) وتی: داواکردنی ئەو کەسانەی سەرانی فیتنە و دروستکەری پڕوپاگەندە و هەڵبەستەری درۆن و، دۆزینەوەیان و پاشان کوشتنیان.

(عبداللهی کوڕی سەعد)یش پێی وت: ئەو مافەی لەسەر خەڵکە لێیان وەرگرە، ئەو مافەشی هەیانە پێیان بدە!

(موعاویە)شﷺ پێی وت: منت کردۆتە سەروکاری شام، خەڵکەکەشی تەنها خێر و خۆشیت بۆ دێنن، ولاًتانی تریش والیەکانی بەباروودۆخیان شارەزاترن!

ڕای موعاویە و ئیبن سەعد و ئیبن عاص

(عوسمانﷺ) بە (عەمری کوڕی عاص)ی گوت: عەمرا! تۆ چۆنی دەبینی؟

عەمر وتی: من وا دەبینم تۆ لەگەڵیان نەرم و نیانی، بەرامبەریان شلگیری، بە بەراورد لەوەی (عومەر) لەگەڵی دەکردن زیاترت پێداون، زۆر

---

١ ـ تأريخ الطبري: ٤: ٣٤٢.

نـەرم و نیـان و سـینگ فراوانـی بەرامبـەریان. رام وایـە پابەنـد بـی بـە ڕێوشـوێنی هـەردوو هاوەڵەکەتـەوە، (ئەبوبـەکر) و (عومـەر)، لـە شـوێنی توندیدا توند بی و لە شوێنی نەرم و نیانیدا نەرم و نیان، پێویستە توندی لەگەڵ ئەوانەدا بەکاربێ کە مەبەستیانە زیان بە خەڵکی بگەیەنن، نەرم و نیانیش لەگەڵ ئەوانەی سوورن لەسەر ئامۆژگاری خەڵکی!!

عوسمان نەخشەکەی لە روبەڕوبونەوەی فیتنە روون دەکاتەوە

پـاش ئـەوەی لـە قـسەکانیان بونـەوە، (عوسمـان)ﷺ، سـەبارەت بـە روونکردنـەوەی نەخـشەکەی لـە روبەڕووبونـەوەی ئـەو فیتنەیـەی کـە هـەر دەبێ بێـت دەسـتی بـە قسەکردن کـرد، سـەرجەم ئەوەشـی دەیکا تـەنها بـۆ دواخستنی روداوەکەیە، نەك بەربەستی کردنی!

لـەو قسانەی کـە وتـی: گوێبیـستی سـەرجەم ئاماژەکانتـان بـووم، هـەر کاروبـارێ دەرگـای خـۆی هەیـە و لێیـەوە دێ، ئـەو فیتنەیـەی کـە لێـی دەترسین تووشـی ئـەم ئوممەتە بێت، هـەر دەبێ بێـت و روودات، ئێمـە لـە هـەوڵی بەربەسـتی کردنـی دایـن بـە نـەرم و نیـانی و، بـە هاتوچـۆ و بەدواداچونەکان.

لەگـەڵ خـەڵکیش نـەرم و نیـان دەبـین، مەگـەر لـە حـەدێ لـە حـەدەکانی خـوادا، هـیچ کەسـیش ناتوانـێ نـەنگی لـەو سـنورانە بگـرێ، یـا ڕێگـری پیادەکردنیانمان لێ بکات.

هـیچ کەسـێ لـە هەقێکـدا بەڵگـەی لەسـەرم نیـە، خـواش دەزانـێ هـیچ کەمتەرخەمیەکم لە پێشکەشکردنی خەیر و خۆشی خەڵکیدا نەکردوە.

سوێند بەخوا بەرداشی فیتنە لە سوڕاندایە، خۆشبەختی بۆ (عوسمـان) ئەگەر بمرێت و نەیبزوێنێ!!

داواکاری عوسمان لە والیەکان

واز لە خەڵکی بێنن، مافەکانیان پـێ بدەن، لێیـان ببـورن و لێیـان خـۆش بن، لەگەڵیان نەرم و نیان بن، بەڵام ئەگەر مافـەکانی خـوا پێشێلکرا، نـەرمی تێدا مەنوێنن!!![1]

(عوسمـان)ﷺ داوای لـە والیـەکانی کـرد کـە بگەڕێنـەوە بـۆ کارەکانیـان،

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٢-٣٤٣.

پاش ئەوەی چۆنیەتی ڕوبەڕوبونەوەی فیتنەی پێ ڕاگەیاندن، کە هەموو بەرچاو ڕۆشنێك دەیزانی بەرەو پێش دێ!

(موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ﷺ پێش ئەوەی ڕوەو شام بڕوا، هات بۆ لای (عوسمان)و پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! لەگەڵما وەرە بۆ شام، پێش ئەوەی ئەو کاروبار و ڕوداوانە هێرش بکەنە سەرت کە لەتوانادا نیە پێشگیریان کەی.

(عوسمانﷺ) وتی: من دراوسێیەتی پێغەمبەری خواﷺ بەهیچ شتێ ناگۆڕمەوە، ئەگەر بڕینی ڕەگی دەماری ملمیشی تێدابێ!

(موعاویەﷺ) پێی وت: کەواتە سوپایەکی خەڵکی (شام)ت بۆ دەنێرم، تا لە مەدینەدا نیشتەجێ بن، بۆ ڕوبەڕووبونەوەی ترسناکیە چاوەڕوانکراوەکان، تا بەرگری لە خۆت و خەڵکی مەدینەش بکەن!

عوسمان دوو پێشنیاری موعایە ڕەت دەکاتەوە

(عوسمان)ﷺ وتی: نەخێر، تا ڕۆژی لە دراوسێکانی پێغەمبەری خوا نەگوشم بۆ سەربازانێك کە نیشتەجێی دەکەم و، تەنگی نەخەمە سەر کۆچکەر و یارمەتی دەرەکان!

(موعاویە)ﷺ پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! سوێند بەخوا تیرۆر دەکرێی یان غەزو دەکرێی!

(عوسمان)ﷺ گوتی: (حسبي الله ونعم الوكيل) خوام بەسە و ئەویش باشترین بریکارە!![1]

داهاتنی ساڵی ٣٥ و سەرکەوتنی سەبەئیەکان لەو ساڵەدا

(موعاویە) ڕۆیشت بۆ شام.

ساڵی (٣٥) هات، ساڵی فیتنەی کوێرانە، لەو ساڵەدا سەبەئیەکان لە کوشتنی خەلیفە (عوسمان)ﷺ سەرکەوتوو بون.

دوای ئەوەی ئەمیرەکان گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان، سەبەئیەکان بیریان لە کاروباری خۆیان کردەوە، ناچار بون نەخشەکەیان بگۆڕن.

نەخشەی پێشویان بۆ دەرچوون لە فەرمانی (عوسمان)ﷺ بریتی بوو لە ڕاگەیاندنی لەڕێدەرچوون لە شار و وڵاتان و بەرپاکردنی ئاژاوە و

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٥.

خراپەکاری و ڕاکێشانی سادە و هەرچی و پەرچیەکان بەلای خۆیاندا.

سەبەئیەکان دوای شکستی ڕۆژی(جەرەعە) نەخشەکەی خۆیان دەگۆڕن

بەڵام ئەم نەخشەیە سەرکەوتوو نەبوو، ئەوەبوو لە کوفە و لە ڕۆژی (جەرەعە)دا و بە سەرکردایەتی (یەزیدی کوڕی قەیس) دەرچوون و ڕێگریان لە گەڕانەوەی (سەعیدی کوڕی عاص) کرد بۆ ناو کوفە.

نەشیانتوانی ئامانجەکەیان جێبەجێ بکەن، ئەوەی توانیان جێبەجێی بکەن تەنها سەرکەوتنیان بوو لە گۆڕینی والیدا، ئەوەبوو (عوسمان)، (ئەبوموسای ئەشعەری)ﷺ بە والی کوفە دامەزراند.

لە میصر و کوفەو بەصرەوە هاتن بۆ لای عوسمان

شەیتانە سەبەئیەکانی هەرسێ وڵاتی میصر و کوفە و بەصرە کۆك بون لەسەر ئەوەی بچن بۆ لای (عوسمان) لە مەدینە و بەئاشکرا ڕووبەڕووی ببنەوەو موجادەلەی لەگەڵدا بکەن و دژایەتی بکەن و لەبەرچاوی موسڵمانان دادگایی بکەن!

سەبەئیەکان لە مەدینە دادگایی عوسمان دەکەن

کۆمەڵێك لەوانە لەو سێ ناوچەیەوە، لەساڵی (٣٥)دا بۆ مەدینە دەرچون تا لەگەڵ (عوسمانﷺ) کۆببنەوە، وایان پیشان دا کە فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپە دەکەن و سوورن لەسەر چاکسازی و دەیانەوێ هەڵەکانی خەلیفە هەڵسەنگێنن و لەسەر کردەوەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکەن!

ڕەخنەکانیان لەسەر (عوسمان) کۆکردبوەوەو گومانیان دژی ئامادە کردبوو، تا لەبەر چاو و بە ئاگای موسڵمانان لەوبارەیەوە پرسیاری لێ بکەن و لێپرسنەوەی لەگەڵدا بکەن، دەیانویست بە شایەتی ئەوان دان بە هەڵەکانیدا بنێ، پاشان هەستن بە بڵاوکردنەوەی لەنێو موسڵمانانی جیهاندا![1]

دوو قورەیشی بە ڕاشکاوی لەگەڵ سەبەئیەکان دەدوێن

کاتێ سەبەئیەکان گەیشتنە مەدینە، (عوسمان) دوو پیاوی لە موسڵمانان نارد بۆ لایان کە (مەخزومی) و (زوهری) بون، پێی وتن: سەیرکەن بزانن چیان دەوێ، بزانن سەرکردەکەیان کێیە.

بەهۆی هەڵەیەك کە لەمانەوە ڕوویدابوو، پێشتر (عوسمان) هەردوکیانی

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٦.

تەمیّ کردبوو، ئەوانیش بەوە رازی ببون و هیچ رقیّکیان لە (عوسمان) نەبوو.

سەبەئیەکان ئەمەیان سەبارەت بەم دوانە دەزانی، دەیانزانی کە (عوسمان) لەپیّشتردا تەمیّی کردبون، تەماحیان هەبوو بەهۆی ئەمەوە بۆلای خۆیان رایانکیّشن.

هەر بۆیە سەبەئیەکان بە ئاشکرا لەگەڵیان دوان، مەبەستەکانی خۆیانیان پیّ ڕاگەیاندن.

پرسیاریان کرد: ئایا لە مەدینە کەستان لەگەڵە؟

وتیان: تەنها سیّ کەسمان لەگەڵە!

پیّیان وتن: دەتانەویّ چی بکەن؟

سەبەئیەکان لەبەردەمیاندا ئامانجەکەیان ئاشکرا دەکەن

وتیان: دەمانەویّ لەگەڵ عوسماندا لەسەر چەند شتیّ کە کردویەتی قسە بکەین، ئەوانەشمان لە دڵی خەڵکی وڵاتاندا چاندوەو بەناویاندا بڵاومان کردۆتەوە، پاشانیش دەگەڕیّینەوە بۆ لایان و، هەواڵیان پیّ دەدەین کە وامان لە (عوسمان) کردووە دان بە هەڵەکانیدا بنیّ و، لەبەرچاومان ئیعترافی کردوە، بەڵام سورە لەسەری و واز ناهیّنیّ و پاشگەز نابیّتەوە.

دەمانەویّ لە وەرزی حەجی داهاتوودا لە وڵاتەکانمان دەرچین و بیّین بۆ مەدینە وەك ئەوەی بۆ حەج هاتبین، پاشان دەوری (عوسمان) بدەین و لەکاری‌خەین، ئەگەر ئامادەی خۆلابردنی نەبوو دەیکوژین!!!

ڕاپۆرتی دوو پیاوەکە لەبەردەم عوسماندا

دوو پیاوەکە گەڕانەوە لای عوسمان و مەبەستی ڕاستەقینەی سەبەئیەکانیان پیّ ڕاگەیاند، لە کۆتاییشدا هەر ئەو مەبەستە!

(عوسمانﷺ) ڕای وابوو ئەوان سوك و کەمترن لەوەی بتوانن ئەمە بکەن، ئەمەش تەنها چەند بیریّکە لە میّشکیاندا، هەر بۆیە کاتیّ هەواڵیانی زانی پیّکەنی و وتی: خوایە ئەمانە سەلامەت کەی، ئەگەر سەلامەتیان نەکەی بەدبەخت و سەرلیّشیّواو دەبن.[1]

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٦.

(عوسمان) ناردی بەدوای ئەو سەبەئیانەی لە میصر و کوفە و بەصرەوە هاتبون، ئەوانیش هاتن بۆ مزگەوت.

بانگدەرێك بانگی کرد: (الصلاة الجامعة).

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بەرەو مزگەوت هاتن، سەبەئیەکان لە دەوری دوانگەکە کۆببونەوە، موسڵمانانیش لە چواردەورەیان بون و (عوسمان)یش لەسەر دوانگە بوو.

عوسمان لە مزگەوتدا ئامانجی سەبەئیەکان ئاشکرا دەکات

لەو کۆمەڵە حەشامەتەدا (عوسمان) دەستی بەقسەکردن کرد، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان هەواڵی سەبەئیەکان و مەبەستە راستەقینەکانیانی بە هاوەڵان راگەیاند، لەوەی کە گومانەکانی لەسەر دوپات بکەنەوە، وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ دەرچون لە فەرمانی و لەکارخستنی یا کوشتنی!

رای هاوەڵان لەسەر کوشتنیان

ئەو دوو پیاوەی لەگەڵ سەبەئیەکان قسەیان کردبوو، شاهێدیان دا لەسەر ئەوەی پێیان راگەیاندبون.

سەرجەم موسڵمانانی نێو مزگەوتەکە وتیان: ئەمیری بڕواداران! بیانکوژە، چونکە دەیانەوێ لە فەرمانی ئەمیری بڕواداران دەرچن و هێزی موسڵمانان پەرتەوازە بکەن!!

بۆچی عوسمان نەیکوشتن؟

عوسمان داوای هاوەڵانی بۆ کوشتنیان پەسەند نەکرد، هەروەك چۆن لەپێشتر بانگەشەی‌تری کوشتنیانی رەت کردەوە، لەبەر ئەوەی – لەڕوکاردا– موسڵمانی بن دەستی خۆی بون و، رازی نەبوو بوترێ: (عوسمان) موسڵمانی سەرپێچیکاری خۆی کوشتوە.

هەر بۆیە (عوسمان) رەتی ئەو داوایەی دایەوە بەوەی وتی: نایانکوژین، بەڵکو لێیان دەبورین و دەیانبەخشین، بە کرد و کۆششی خۆمان تۆڵەیان لێ دەستێنین، هیچ کەسێ لە موسڵمانان ناکوژین، مەگەر بە حەدێك شایستەی کوشتن بێ، یا پاشگەزبوبێتەوەو کوفری بەدەرخستبێ.[١]

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٦.

پاشان (عوسمان)ﷺ دوای لە سەبەئیەکان کرد ئەو گومانانەی هەیانە بیخەنە پێش چاو و، ئەو هەڵە و لەسنور دەرچوون و سەرپێچیانەی ئەو تێی کەتوە بەدەری خەن.

کۆڕی دادگایی ئاشکرا لە مزگەوتی پێغەمبەر

ئەم کۆڕە کۆڕی ڕاشکاوی و ئاشکراکردن بوو کە لە مزگەوتدا و لەبەر چاو و بە ئاگاداری هاوەڵ و موسڵمانان بەڕێوەچوو.

سەبەئیەکان قسەیان دەکرد و ئەو هەڵانەی (عوسمان)ﷺ پێی هەستابوو دەیانخستە پێش چاو، (عوسمان)یش هەڵدەستا بە ڕوون کردنەوە و ئاشکراکردنیان و پێشکەش کردنی ڕووی ڕاستەقینەی کاروبارەکان، موسڵمانە بە ویژدانەکانیش گوێبیستی ئەم ڕاشکاوی و ئاشکراکردن و لێپرسینەوەیە بون!

(عوسمان)ﷺ ڕەخنەکانی ئەوانی دەهێنایەوەو باسی دەکرد و پاشان ڕووی ڕاستەقینەی مەسەلەکەی ڕوون دەکردەوەو بەرگری لە چاکی کارەکانی دەکرد و، هاوەڵانی دانیشتووی مزگەوتەکەی دەکردە شاهێد.

١- وتی: وتویانە: من نوێژم لە سەفەردا کورت نەکردۆتەوەو تەواوم کردوە، لە پێش مندا نە پێغەمبەری خواﷺ و نە ئەبوبەکر و عومەر تەواویان نەکردووە!

بەڵگەی عوسمان بۆ تەواوکردنی نوێژ لە مەککە

لە ڕاستیدا من کاتێ نوێژم بە تەواوی کردوە کە لە مەدینەوە بۆ مەککە سەفەرم کردووە، مەککەش شارێکە کەس و کارمی تێدایە، منیش لەنێو کەسوکارمدا نیشتەجێم و، ڕێبوار نیم، ئایا وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ بەخوا وایە!

بەڵگەی عوسمان لە فراوانکردنی لەوەڕگەی صەدەقە

٢- وتویانە: من لەوەڕگەم پاراستوە و شوێنی موسڵمانانم تەنگ کردووەتەوە، زەویەکی فراوانم تایبەت کردوە بۆ لەوەڕاندنی وشترەکانم!

لە ڕاستیدا لەپێش منیشەوە لەوەڕگە هەبوە، بۆ وشتری سەدەقەو جیهاد، هەریەکە لە پێغەمبەری خواﷺ و ئەبوبەکر و عومەریش لەوەڕگەیان هەبوە، منیش لەبەر زۆربونی وشتری صەدەقە و جیهاد فراوانترم کردووە، ڕێگریش نەبوین مەڕ و ماڵاتی موسڵمانە هەژارەکان لەو لەوەڕگانەدا

بلەوەڕێن، لەوەرگەشم بۆ مەڕ ومالاتی خۆم تایبەت نەکردوە.

کاتێك خەلافەتم گرتە دەست، لە هەموو موسڵمانان زۆرتر وشتر و مەڕم هەبوو، هەموویم بەخشی، ئێستاکە خاوەنی هیچ باڕە و قاڕەیەك نیم، تەنها دوو وشترم هەیە، تایبەتم کردووە بۆ حەج کردنم! ئایا وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ، بەخوا وایە.

بەڵگەی عوسمان بۆ کۆکردنەوەی قورئان

٣- وتویانە: من لەو هەموو (مصحف)انە تەنها نوسخەیەکی قورئانم هێشتووەتەوەو، جگە لەویشم سوتاندوە، خەڵکیشم لەسەر یەك قورئان کۆکردووەتەوە!

لە ڕاستیدا قورئان وتەی خوایە و لەلایەن خواوەیە، کە ئەویش تاك و تەنهایە، کاری منیش تەنها کۆکردنەوەی موسڵمانان بووە لەسەر قورئان، ڕێگریم لێکردوون لەسەر قورئان ناکۆك بن، من لەو کارەمدا شوێنکەوتەی ئەبوبەکر بووم کاتێ کە قورئانی کۆکردەوە! ئەرێ وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ، بەخوا وایە.

بەڵگەی عوسمان لە حکەمی کوڕی عاص د

٤- وتویانە: من (حەکەمی کوڕی عاص)م گەڕاندوەتەوە بۆمەدینە، لەکاتێکدا پێغەمبەری خواﷺ بۆ (طائیف) دەربەدەری کردبوو!

لەڕاستیدا (حەکەمی کوڕی عاص) مەککەییە نەك مەدینەیی، پێغەمبەری خواﷺ لە مەککەوە بۆ (طائیف)ی ناردبوو، دواتریش پێغەمبەرﷺ پاش ئەوەی لێی رازی بوو گەڕاندیەوە بۆ مەککە، ئەو پێغەمبەرﷺ بوو بەرەو (طائیف) ناردی، هەر ئەو بوو هاوردیەوە و گەڕاندیەوە بۆ مەککە!! ئەرێ وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ، بەخوا وایە.

بەڵگەی عوسمان لە دانانی لاوان بە والی

٥- وتویانە: من تازەپێگەیشتوان بەکار دێنم و لاوە کەم تەمەنەکان دەکەمە والی!

من تەنها پیاوە بەڕێز و بە تەمەن و ژیرەکانم کردووە بە والی، ئەم خەڵکەش خۆیان خاوەن کاری خۆیانن، دەی لێیان بپرسن.

کەسانی پێش منیش کەسی وایان کردووە بەسەرپەرشتیار کە لەوانەی

ئێستە کەم تەمەن و تازەپێگەیشتووتر بون، پێغەمبەری خوا ﷺ (ئوسامەی کوڕی زەید)ی کردە سەرپەرشتیار، کە لەوانەی من کردوومە بەسەرپەرشتیار بچوکتر بوو، لەمن خراپتریان بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت. ئەرێ وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ بەخوا وایە! ئەم خەڵکانە نەنگیەك لەخەڵکی دەگرن کە راڤە و روونی ناکەنەوە!

بەڵگەی عوسمان لەوەی بە (ئیبن ئەبو سەرح)ی بەخشی

٦- وتویانە: لەوەی دەستکەوت بووە، بە (عبداللەی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح)م بەخشیوە!

بەڵکو پێنج یەکی پێنج یەکێکم پێ بەخشیوە، کە سەد هەزار بوو، کاتێ کە ئەفریقای رزگار کرد، وەك پاداشتێك بۆ جیهادەکەی.

پێشم وتبو: ئەگەر خوا فەتحی ئەفریقای بۆ کردی، ئەوا پێنج یەکی پێنج یەکێکی دەستکەوتەکە وەك زیادەیەك بۆ تۆ بێ.

لەپێش مندا (ئەبوبەکر) و (عومەر)یش خوایان لێ‌رازی بێت، هەمان شتیان کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا سەربازە موجاهیدەکان پێیان وتم: ئێمە پێمان ناخۆشە پێنج یەکی پێنج یەکێکی پێ بدەی، -کە ئەوان مافی نارازیبون و رەتکردنەوەیان نەبوو- لەگەڵ ئەوەدا ئەو پێنج یەکی پێنج یەکەم لە (ئیبن سەعد) وەرگرتەوەو گەڕاندمەوە بۆ سەربازەکان! بەمەش (ئیبن سەعد) هیچ شتێکی وەرنەگرت! ئەرێ وا نیە؟

هاوەڵان گوتیان: بەڵێ، بەخوا وایە.

بەڵگەی عوسمان لەسەر پێ‌بەخشینی خزمەکانی

٧- وتویانە: من کەس و کارم خۆش دەوێ و پێیان دەبەخشم!

بەلام خۆشەویستیم بۆ کەسوکارم وای لێ نەکردووم لە گەڵیاندا دژ بەوانی تر دەست بە جەور و ستەم بکەم، بەڵکو مافەکانیان پێ‌دەدەم و مافیشیان لێ وەردەگرم.

بەلام مەسەلەی پێ‌بەخشینیان، ئەوا من لەماڵی تایبەتی خۆم پێم بەخشیون، نەك لە ماڵی موسڵمانان، چونکە ماڵی موسڵمانان نە بۆ خۆم و

نە بۆ خەڵکانی تر بەحەلاڵ نابینم.

لە سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ و (ئەبوبەکر) و (عومەر)یشدا لەماڵی ساغی خۆم زۆرم دەبەخشی، لەکاتێکدا ئەوکاتە ڕژد بووم لە ماڵدا و سووربووم لەسەری، ئەی کاتێ کە پیربووم و تەمەنم تەواو بوو، ئەو ماڵەی هەمو دەیدەم بە کەس و کار و خزمانم، ئەبێ لەڕێلاچوەکان ئەوە بڵێن کە وتویانە؟

سوێند بەخوا من لە ماڵ و سامان و زیادەی هیچ وڵاتێك وەرنەگرتووە، ماڵەکانی ئەو وڵاتانەم گەڕاندۆتەوە، تەنها پێنجیەکی دەستکەوتەکانم هێناوەتە مەدینە و موسڵمانانیش سەرپەرشتیاری دابەشکردنی ئەو پێنج یەکەیان کردوەو لە شوێنی خۆیدا دایانناوە!

سوێند بەخوا لەو پێنج یەکە و جگە لەوەش لە فلسێك و بەسەرەوەم وەرنەگرتووە، من تەنها ماڵ و سامانی خۆم دەخۆم و هەر لەوەش دەدەم بە کەس و کارم!

بەڵگەی عوسمان لە زەویە ڕزگارکراوەکان

٨- وتویانە: من زەویە ڕزگارکراوەکانم بەخشیوە بە چەند پیاوێکی دیاریکراو.

ئەو زەویە ڕزگارکراوانەش موجاهیدە کۆچەر و پشتیوانەکان و جگە لەوانیش هاوبەشی ڕزگارکردنیان کردووە، کاتێکیش ئەم زەوییانە بەسەر موجاهیدە ڕزگارکەرەکاندا دابەش کرا، هەبوو تیایدا نیشتەجێ و جێگیر بوو، هەیانبو گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کاری لە مەدینە و، شوێنانی تر لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو خاوەنی ئەو زەویە بوو، هەشیانبوو ئەو زەویانەیان فرۆشت و نرخەکەشی ئێستە لە دەستیاندایە!

بەم شێوەیە (عوسمان)ﷺ گرنگترین ڕەخنەکانی خستە پێش چاو، هەر خۆیشی ڕوونی دەکردنەوەو ڕووی هەقی مەسەلەکەی بەدەر خست.[١]

---

١ ـ بۆ گرنگترینی ئەو ڕەخنانە و ڕوی هەقی ئەو مەسەلەیە سەیری کتێبی (العواصم من القواصم)ی (ئیبن عەرەبی) لەگەڵ پەراوێزەکانی (محب الدین الخطیب)٦١-١١١ و

سەرکردە سەبەئیەکان لە تەنیشتی دوانگەکەوە گوێبیستی قسە و ڕوونکردنەوەکانی عوسمان بون، هەروەك هاوەڵە بەڕێز و ئەوانەی لەگەڵیان بون لە پیاوچاکە موسڵمانەکان گوێبیستی قسەکانیان بون.

موسڵمانان بە قسەو ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنەکانی (عوسمان)ﷺ کاریگەر بون، ئەوەی وتی باوەڕیان پێی کرد و خۆشەویستیان بۆی زیاتر بوو.

قەناعەت نەکردنی سەبەئیەکان بە بەڵگەکانی عوسمان

بەڵام سەبەئیەکان بانگخوازانی فیتنەو پەرتەوازەیی، هیچ بەوە کاریگەر نەبون و، پاشگەز نەبونەوە، چونکە توێژینەوەیان بەدوای هەقدا نەبوو، ئارەزومەندی چاکە نەبون، بەڵکو ئامانجیان فیتنەچیەتی و فرت و فێڵ بوو لە ئیسلام و موسڵمانان.

هاوەڵان و موسڵمانان ئاماژەیان بە (عوسمان)دا بە کوشتنی ئەو سەبەئیانە، بەهۆی دەرکەوتنی درۆ و گزیکاری و رق و کینەیان، بەڵکو سوور بون لەسەر کوشتنیان، تا موسڵمانان لە زیانیان رزگار بکا، وڵاتی موسڵمانانیش جێگیر بێ و زاڵ بێ بەسەر ئەو فیتنانەی ئەمانە و شوێنکەوتەکانیان دەیورووژێنن!

عوسمان رای هاوەڵان لە کوشتنی سەبەئیەکان پەسەند ناکا

بەڵام (عوسمان)ﷺ ڕایەکی تری هەبوو و، شیکردنەوەیەکی جیاوازی هەبوو، پێی باش بوو وازیان لێ بێنێ و رای لەسەر کوشتنیان نەبوو، وەك هەوڵێك لەلایەن ئەوەوە بۆ دواخستنی ڕوودانی فیتنە!!

(عوسمان)ﷺ سەبارەت بەو سەبەئیانەی کە لە میصر و کوفە و بەصرەوە هاتبون، هیچ ئیجرائاتێکی لەدژیان نەگرتە بەر، لەگەڵ ئەوەی دەیزانی چ نەخشەیەکیان هەیە و چیان دەوێ، وازی لێهێنان مەدینە بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان!!

هەنگاوی جێبەجێکاری سەبەئیەکان: داگیرکردنی مەدینە لە وەرزی حەجدا

سەبەئیەکان لەنێوان خۆیاندا ڕێکەوتن کە هەستن بە هەنگاوە کرداریە کۆتاییەکانیان، لە هێرش کردنە سەر (عوسمان) لە مەدینەدا و، زۆر بۆ

---

پێشەکی (ئەحمەد عەرموش) بۆ کتێبی (الفتنة) ١٠-١٤ و (تأريخ الطبري) ٤: ٣٤٦-٣٤٨ بکە.

هێنانی تا لە خەلافەت بێتە خوارێ، ئەگینا دەکوژرێ.

بڕیاریان دا لە وەرزی حەجدا، لە هەرسێ بنکەی میصر و کوفە و بەصرەوە بێن، هەر لەگەڵ حاجیەکاندا وڵاتیان بەجێ بێڵن و، لە وێنەی حاجیەکاندا خۆیان دەرخەن، بۆ خەڵکی وا رابگەیەنن کە ئەوان بۆ حەج دەچن، کاتێکیش گەیشتنە مەدینە، واز لە حاجیەکان بێنن تا بچن بۆ مەککە بۆ بەجێهێنانی ڕێوشوێنی حەج، چۆڵبونی مەدینە لە زۆربەی خەڵکەکەیان–کە سەرقاڵی حەج بون– قۆستەوە و هەستان بە گەمارۆدانی (عوسمان) و ڕێخۆشکردنێك بۆ لەکار لادانی یا کوشتنی![1]

سەبەئیەکان بەم نەخشە شەیتانیە نەخشە دەکێشن، موسڵمانانیش هیچ شتێ لەو نەخشەیەی ئەوان نازانن.

سەرکردە سەبەئیەکانی میصر

لە شەوالی ساڵی (٣٥)دا سەبەئیەکان لە نزیکی مەدینەدا بون!

سەبەئیەکان لە میصرەوە بەچوار دەستە دەرچوون، هەر دەستەیەکیش ئەمیرێکیان هەبوو، ئەو ئەمیرانەش ئەمیرێکیان هەبوو، لەگەڵیانیشدا شەیتانەکەیان (عبداللەی کوڕی وەهەبی کوڕی سەبەء) هەبوو.

ئەمیری ئەو چوار دەستەیە بریتی بون لە:

(عبدالرحمنی کوڕی عەدیسی بەلەوی)، (کینانەی کوڕی بیشری تەجیبی)، (سودانی کوڕی حومرانی سەکونی)، (قەتیرەی کوڕی فولانی سەکونی).

ئەمیری ئەم ئەمیرانەش (غافقی کوڕی حەربی عەککی) بوو.

سەرکردەکانی سەبەئیەکانی کوفەو بەصرە

ژمارەی ئەو چوار دەستەیەش هەزار پیاو بوێ.

سەبەئیەکانی کوفەش بە هەزار پیاوەوە، لەچوار دەستەدا دەرچوون، ئەمیری دەستەکانیان بریتیبون لە:

(زەیدی کوڕی صوحانی عەبدی)، (ئەشتەری نەخەعی)، (زیادی کوڕی نەضری حارثی)، (عبداللەی کوڕی ئەصەم).

ئەمیری سەبەئیەکانی کوفەش (عەمری کوڕی ئەصەم) بوو.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٨.

سەبەئیەکانی بەصرەش بە هەزار پیاوەوە، لە چوار دەستەدا دەرچوون، ئەمیری دەستەکانیش بریتی بون لە:

(حەکیمی کوڕی جەبەلەی عەبدی)، (ذورەیحی کوڕی عەبادی عەبدی)، (بیشری کوڕی شورەیحی قەیسی)، (ئیبن موحەڕیشی کوڕی عەبدولحەنەفی).

ئەمیری سەبەئیەکانی بەصرەش (حورقوصی کوڕی زوهەیری سەعدی) بوو.

بەم شێوەیە پیلانی سەبەئیەکان پێکهات و کۆمەڵی موسڵمانانیش مەبەستی راستەقینەیان نەزانین.

سێ هەزار سەبەئی بەدوای ئیبن سەبەو کەوتون

زیاد لە سێ هەزار لەوانە روەو مەدینە هاتن، لە رووکاردا بە نیازی حەج بون، بەڵام لە راستیدا بۆ زاڵ بون و لەناوبردنی خەلیفە هاتبون.

(عبداللەی کوڕی سەبەء) بەهۆی سەرکەوتنی نەخشە جولەکەییە شەیتانیەکەیەوە، بە خۆ بە زل زانی و شادیەوە لەگەڵ ئەوانەدا رێی دەکرد،!!

سەبەئیەکانی میصر دەیانویست (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ خەلیفە بێ، سەبەئیەکانی کوفەش دەیانویست (زوبەیری کوڕی عەوام)ﷺ خەلیفە بێ، سەبەئیەکانی بەصرەش دەیانویست (طەڵحەی کوڕی عبیداللە)ﷺ خەلیفە بێ.[1]

سەبەئیەکان درۆ بەدەم عەلیو طەلحەو زوبەیرەوە دەکەن

ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزە -عەلی و زوبەیر و طەڵحە-ﷺ، لەگەڵ سەبەئیەکاندا رێك نەکەوتبون، لەگەڵیاندا پیلانیان بۆ (عوسمان)ﷺ دانەنابوو، نوسراویشیان بۆ نەناردبون و ئامانجە راستەقینەکانیان نەدەزانین.

بەڵام سەبەئیەکان درۆیان بەدەم ئەم هاوەڵانەوە دەکرد، وایان لە شوێنکەوتە سادە و ئاژاوەگێڕەکانیان دەگەیاند کە هاوەڵان لەگەڵیاندان و نوسراو و نامەیان لەنێواندایە و ئەوان دەیانبزوێنن.

سەبەئیەکانی میصر بە شوێنکەوتەکانی خۆیان دەوت: (عەلی)یە کە

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٤٨-٣٤٩.

ئێمە دەبزوێنێ و هانمان دەدات.

سەبەئیەکانی کوفەش بە شوێنکەوتەکانیان دەوت: (زوبەیر)ە کە ئێمە دەبزوێنێ و هانمان دەدات.

سەبەئیەکانی بەصرەش بە شوێنکەوتەکانیان دەوت: (طەڵحە)یە ئێمە دەبزوێنێ و هانمان دەدات.

هاوەڵە بەڕێزەکانیش لەو درۆ و هەڵبەستراوە سەبەئیانە بەری بون!!

سەربازگەی سەبەئیەکان لە نزیکی مەدینە لە شەوالی ٣٥ك

سوپای سەبەئیەکان لە دووری سێ شەو لە مەدینەوە مۆڵیان دابوو.

سەبەئیەکانی بەصرە لە (ذا خشب) و سەبەئیەکانی کوفە لە (الاعوص) و سەبەئیەکانی میصر لە (ذا المروة) دابەزیبون.

سەرکردە سەبەئیەکان داوایان لە شوێنکەوتەکانیان کردبوو کە لەسەرخۆ بن و پەلە نەکەن، بەهێواشیش بچنە مەدینەوە، تا خەڵکی مەدینە لێیان بەئاگا نەیەن و، کاروبارەکانیان ئاشکرا نەکەن!

سەرکردە پیلانگێڕەکان دوانیان لەخۆیان نارد بۆ مەدینە تا چاودێری بارەکە بکەن و دەنگوباسی خەڵکی بزانن، ئەوانیش (زیادی کوڕی نەضر) و (عبداللهی کوڕی ئەصەم) بون، لە سەرکردە سەبەئیەکانی کوفە.

دوو سەرکردەی سەبەئیەکان داوای مۆڵەت لە خەڵکی مەدینە دەکەن

هەردوو پیاوەکە چوونە مەدینەوە، چاویان بە هەندێ لە خەڵکەکەی کەوت، چاویان کەوت بە هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ و هەروەها چاویان بە (عەلی) و (طەلحە) و (زوبەیر رضي الله عنهم) کەوت، بەوانەی چاویان پێکەوتبون وتیان: ئێمە لە بەصرە و میصر و کوفەوە هاتووین، ئامانجیشمان حەج کردنە، ئێمە لە دووری سێ ڕۆژەڕێ لە مەدینەوە دابەزیوین، لە مەدینەشدا تەنها دەمانەوێ چاومان بە (عوسمان) بکەوێ، تا سکاڵا لە هەندێ لە والیەکانمانی لەلا بکەین و داوا بکەین بیانگۆڕێت، داوای مۆڵەتیان لە سەرجەم ئەوانە کردبوو تا ڕێ بدەن بە کۆمەڵەکانیان تا بێنە مەدینەوە!

هیچ کەسێ مۆڵەتی نەدان بێنە مەدینەوە، ئەو کۆمەڵانەیان بە فیتنەچی دانا، فیتنەکەشیان هێلکەیەو نزیکە هەڵبهێنرێت، ئەگەر ئەوان دەیانەوێ

**حەج بکەن، ئەی بۆچی ڕووەو مەککە ناچن؟ بۆ دێنە مەدینەوە؟ لەکاتێکدا ئەوان لە مانگی شەوال دان؟**

**ئەمە لەگەڵ ئەوەی خەڵکی مەدینە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەوانیان نەدەزانی.**

**ئەو دوو پیاوە گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان و هەواڵەکانیان پێ ڕاگەیاندن و، ڕایانگەیاند کە خەڵکی مەدینە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەوان نازانن، بەڵام لێیان بە ئاگا و بەگومانن.**

سەبەئیەکان چەند شاندێك دەنێرن بۆ لای عەلی و طەلحە و زوبەیر

**سەرکردەکانی پیلانەکە لە بارودۆخەکەیان کۆڵیەوە، وایان بینی کە لە هەرشارێك لەو سێ شارەوە چەند کەسێك بنێرن بۆ لای ئەو هاوەڵانەی کە وایان لە شوێنکەوتەکانیان گەیاندووە کە لەگەڵیانە.**

**چەند کەسێکی خەڵکی میصر هاتن بۆ لای (عەلی) و چەند کەسێکی بەصرە بۆ لای (طەڵحە) و چەند کەسێکی خەڵکی کوفە بۆ لای (زوبەیر) چوون.**

**دەیانگوت: ئەگەر خەڵکی مەدینە بەیعەت بە هاوەڵەکەی ئێمە بۆ خەلیفەیەتی بدات وازیان لێ دێنین، ئەگەر بەیعەتی هاوەڵەکەی ئێمە بە خەلیفە پەسەند نەکەن ئەوا لێیان نزیك دەبینەوەو کۆمەڵەکەیان پەرتەوازە دەکەین، پاشان هێرش دەکەینە سەریان و بەسەریاندا دەدەین و شەڕیان لەگەڵ دەکەین!**

عەلی نایەوێ بیانبینێ و نەفرەتیان لێ دەکا

**میصریەکانیان هاتنە لای (عەلی)ﷺ، لەکاتێکدا ئەو لەلای (احجار الزیت) مێزەرێکی سوری بەستبوو، دەستەجلێکی یەمەنی لەبەردابوو، شمشێرەکەی بەستبوو، (حەسەن)ی کوڕیشی ناردبوو بۆلای (عوسمان)ﷺ تا لەگەڵیدا بێ.**

**لەگەڵ (عەلی)دا قسەیان کرد و کارەکەیان خستە بەرچاوی و داواشیان لێی کرد ببێتە خەلیفە!**

**(عەلی)ﷺ بەسەریاندا هاواری کرد و دەریکردن، لەو قسانەی کە پێی وتن: هەموو پیاوچاکان دەزانن کە سوپای (ذي خشب) و (ذي المروة) و**

(الأعوص) لەسەر زمانی پێغەمبەری خواﷺ نەفرین لێکراون، بگەڕێنەوە، خوا لەگەڵتان نەبێ و نەشتانپارێزێ!

طلحە و زوبەیر نەفرینیان لێ دەکەن

بەصرەییەکانیان هاتن بۆ لای (طلحەﷺ) ، ئەویش (موحەممەد)ی کوڕی ناردبوو بۆ لای (عوسمان) تا لەگەڵیدا بێ، لەگەڵ ئەویش قسەیان کرد و خەلافەتیان خستە بەرچاوی!

بەسەریاندا هاواری کرد و دەری کردن و، پێی وتن: هەموو پیاوچاکان دەزانن کە سوپای (ذي خشب) و (ذي المروة) و (الاعوص) لەسەر زمانی پێغەمبەری خواﷺ نەفرین لێکراون!

سەبەئیەکان میصر داگیر دەکەن و والی دەردەکەن

کاتێکیش کوفەییەکانیان لەگەڵ (زوبەیر)داﷺ قسەیان کرد، هەمان قسەی (عەلی) و (طەڵحە)ی پێ وتن.[١]

(عبداللەی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح) والی میصر بوو، سەبەئیەکانی ئەوێ شۆڕشیان بەسەردا کرد و ئاژاوەچیەکانیان لێ هاندان، (موحەممەدی کوڕی ئەبو حوذەیفەی کوڕی عوتبە) کە بەخێوکراوی (عوسمان) و کوڕی ژنەکەشی بوو، سەرکردایەتیانی دەکرد، (ئیبن ئەبو سەرح)ی والیان دەرکرد، (موحەممەدی کوڕی ئەبو حوذەیفە) لە میصردا دەستی بەسەر کاروباردا گرت، (ئیبن ئەبو سەرح)یش بەجێی هێشت و بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ.

سەرکردە سەبەئیەکان لەگەڵ عوسماندا گفتوگۆ دەکەن

سەرکردە سەبەئیەکان بە ئامادەبونی هەندێ لە هاوەڵان لەگەڵ (عوسمان)دا کۆبونەوەو مشتومڕیان لەگەڵ یەك کرد و گومانەکانیانی پوچ کردەوەو بەڵگەکانی خۆیشی خستە ڕوو.

عوسمان، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بە والی میصر دادەمەزرێنێ

میصریەکان سکاڵای خۆیان لە (عبداللەی کوڕی سەعد)ی والییان دەربڕی، داوایان لە (عوسمان) کرد بیگۆڕێ، لەجێی ئەو والیەکی تر دامەزرێنێ.

(عوسمان)ﷺ پێی وتن: کێتان دەوێ؟

وتیان: (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق)!

---

١ ـ تأريخ الطبري: ٤: ٣٤٩-٣٥٠.

(عوسمان)ﷺ، (عبدالله‌ی کوڕی سەعد)ی لەمیصر لەکار خست و لەجێگەی ئەو (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق)ی دانا. هەروەك پێشتر لەگەڵ لەڕێدەرچووەکانی کوفەشدا ئەمەی کرد، کاتێك (سەعیدی کوڕی عاص)ی لەکار خست و (ئەبوموسای ئەشعەری) لەجێگاکەی دانا.

سەبەئیەکان وایان دەرخست کەوا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان و بە لەکارخستنی (عبدالله‌ی کوڕی سەرح) و دانانی (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) لە جێگای ئەو مەبەستەکانیان هاتووەتە دی.

سەبەئیەکانی میصر گەڕانەوە بۆ میصر، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر)ی والی تازەشیان لەگەڵدا بوو، ئەویش وەك ئەوان سەبەئی بوو، سەبەئیەکانی بەصرە و کوفەش بەرەو عێراق گەڕانەوە.[1]

موسڵمانانی مەدینە وایان گومان برد کە گرفتەکە چارەسەر بوو، قەیرانەکە کۆتایی پێهات و، بەڵایەکە نەما، نەیانزانی ئەم گەڕانەوەیە تەنها بەشێکی پیلانی جولەکەیی شەیتانی سەبەئیە.

پاش ئەوەی خەڵکەکە بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە، دوو شەیتان لە شەیتانەکانی سەبەئی بۆ کارێك لە مەدینە جێمان، کە ئەوانیش (ئەشتەری نەخەعی کوفی) و (حەکیمی کوڕی جەبەلەی بەصری) بون.

خەڵکەکە لە دوو ڕێگەی لێك دوورەوە ڕۆیشتن، کاتێك میصریەکان بەرەو ڕۆژئاوا بۆ باکور دەچوون رووەو میصر، هەر لەو کاتەدا عێراقیەکان بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ باکور روەو کوفە و بەصرە دەچوون.

پیلانە پیسەکەیان: غولام و حوشتر و نووسراو

کاتێك میصریەکان بۆ میصر دەگەڕانەوە، لە مەدینەشەوە سێ ڕۆژەڕێ دوور بون، بینیان ئەوا غولامێکی ڕەش سواری حوشترێك بووە، تەپوتۆز لە زەوی هەڵدەستێنێ.

پێیان وت: ئەوە چیتە؟ وەك ئەوەی شتێکت بوێ یان رات کردبێ!

وتی: من غولامی ئەمیری بڕوادارانم، منی بۆ لای والی میصر ناردووە.

پێیان وت: ئەوە والی میصرە لەگەڵمان، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر).

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٥٤-٣٥٥.

وتی: ئەمم ناوێ، (عبداللهی کوڕی سەعد)ی والیم دەوێ!

(موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) پێی وت: ئەو نوسراوەی پێتە بمدەرێ؟

نوسراوەکەیان لێی سەند، کە خەتمی (عوسمان)یﷺ لەسەر بوو، نوسراوێکی سەیر بوو، کە لە (عوسمان)ەوە بۆ (عبداللهی کوڕی سەعد) ئاراستە کرابوو، تیایدا دەڵێ:

کاتێك ئەو خەڵکە هاتن بۆ لات، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) بکوژە، فلان و فلان و فلانیشیان بکوژە، ئەوانی تریش بەند بکە، ئەو نوسراوەی نوسیومە بۆ ئەوەی (موحەممەی کوڕی ئەبوبەکر) ببێ بە والی پوچی کەرەوەو هەر خۆت والی میصر بە، تا رای منت پێ دەگا!!

(موحەممەی کوڕی ئەبوبەکر) خەڵکەکەی وەستاند –کە دەوروبەری هەزار دەبون–، نوسراوەکەی (عوسمان) کە بۆ (عبداللهی کوڕی سەعد)ی ناردبوو بۆیانی خوێندەوە و، دژ بە (عوسمان) وروژاندنی و هانیانی دا، چۆن دەبێ لەگەڵ (عوسمان) لەسەر چارەسەرێك رێکەون و، بگەڕێنەوە بۆ میصر، پاشان (عوسمان)ﷺ ئەو چارەسەرە هەڵوەشێنێتەوە و فەرمان بدا بە کوشتن و گرتنی ئەو خەڵکە؟! کەواتە پێویستە لابردرێ، ئەگەر نەیهێشت دەبێ بکوژرێ!!

گەڕانەوەی سەبەئیەکان بۆ مەدینە

سەبەئیەکانی میصر لەسەرەتای مانگی (ذي القعدة)دا گەڕانەوە بۆ مەدینە، دڵیان پڕ ببو لە رق بەرامبەر (عوسمان)ﷺ، بە ئاشکراش سوور بون لەسەر لەناوبردنی.

هەر لەبەر هەمان هۆ سەبەئیەکانی کوفە و بەصرەش گەڕانەوە بۆ مەدینە، هەمووشیان عەزمیان لەسەر نەهێڵانی (عوسمان)ﷺ بوو.

سەبەئیەکان مەدینە داگیر دەکەن

خەڵکی مەدینە بە گەڕانەوەی سەبەئیەکانی میصر و کوفە و بەصرە و داگیرکردنی شەقام و رێگەکانی مەدینە بەلایانەوە شتێکی کتوپڕ و لەناکاو بوو، دەبێ هۆی گەڕانەوەیان چی بێ؟ ئایا لەگەڵ(عوسمان) رێك نەکەوتن و گرفتەکە چارەسەر نەبوو؟ خۆ بە رەزامەندیەوە بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە، ئەی بۆ ئێستە گەڕاونەتەوە؟!

سەبەئیەکان لەلای گەورە هاوەڵان سکاڵایان لە (عوسمان)ﷺ کرد، هاوەڵانیش چیرۆکی ئەو نوسراوەی (عوسمان)یان زانی، کە بوەتە هۆی وروژاندن و گەڕاندنەوەیان، بۆیە زۆر کاری تێکردن.

عەلی پرسیار لە عوسمان دەکات دەربارەی چیرۆکی غولام و حوشتر و نوسراوەکە

(عەلی کوڕی ئەبوطالب) چووە لای (عوسمان)ﷺ، نوسراو و غولام و حوشترەکەی لەگەڵ خۆیدا برد!

پێی وت: ئەم غولامە غولامی تۆیە؟

(عوسمان) وتی: بەڵێ.

پێی وت: ئایا ئەم حوشترە وشتری تۆیە؟

(عوسمان) وتی: بەڵێ.

پێی وت: ئایا تۆ ئەم نوسراوەت نوسیوە؟

(عوسمان) وتی: نەخێر!!

(عوسمان)ﷺ سوێندی بەخوا خوارد کە نە نوسراوی نوسیوە و نە فەرمانی داوە بە نوسینی و نە غولامی بۆ میصر ڕەوانە کردووە، ناشزانێ کێ نوسیویەتی!

(عەلی)ﷺ و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵیدا بون ڕاستگۆیی (عوسمان)یان بۆ دەرکەوت، چونکە ئەو بە ناڕەوا سوێند ناخوا، هەروەها زانیان کە کەسێك هەیە نوسراوەکەی تەزویر کردووەو لەسەر زمانی (عوسمان)ﷺ نوسیویەتی و غولام و وشترەکەی (عوسمان)یشی بەکار هێناوە، هەر بە مەبەستیشەوە غولامەکە ویستویەتی میصریە گەڕاوەکان ببینن، تا بەتەواوی دژ بە (عوسمان)ﷺ بوروژێن.

عەلی و نیبن مەسلەمە پیلانی سەبەئیەکان ئاشکرا دەکەن

شتێك هەبوو کە سەرنجی هاوەڵانی ڕاکێشابوو، وای لێکردبون لەلایەکی ئەم پیلانە سەبەئیە شەیتانیەوە بوەستن!!

(عەلی کوڕی ئەبوطالب) و (موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری)ﷺ، لەگەڵ لەڕێدەرچووە پیلانگێڕەکاندا قسەیان کرد، هەروەك هەریەکە لە (طەڵحە) و (زوبەیر)یشﷺ لەگەڵیان دوابون.

پێیان وتن: بۆچی گەڕانەوە مەدینە؟ ئێوە بە ڕەزامەندیەوە بۆ

ولاتەکانتان نەگەڕانەوە؟ ئەو گرفتەی بۆی هاتن چارەسەر بوو، چی وای لێکردن ڕاتان بگۆڕن؟

میصریەکان وتیان: دەستمان گرت بەسەر غولامەکەی (عوسمان)دا، کە سواری حوشترەکەی ئەو ببوو، نوسراوێکی لە (عوسمان)ەوە پێبوو بۆ کوشتنی والیەکەمان، بۆیە گەڕاینەوە بۆ لەسەرکار لادانی (عوسمان).

بە لەڕێدەرچووە بەصرایی و کوفەییەکانیان وت: ئەی ئێوە چی گەڕاندنیەوە؟

وتیان: هاتین تا پشتگیری برا میصریەکانمان بکەین و بەرگریان لێ بکەین و یارمەتیان بدەین!

چۆن خەڵکی کوفە و بەصرە ئاگاداری نوسراوەکەی خەڵکی میصر بون؟

(عەلی) و (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)رضي الله عنهما بە بەصرایی و کوفەییەکانیان وت: ئەی بەصرایی و کوفەییەکان، چۆنتان زانی کە خەڵکی میصر ئەوەیان تووش بووە؟ ئەوان بەرەو میصر کەوتنە ڕێ، ئێوەش بەرەو لای ڕۆژهەلاّت بۆ عێراق کەوتنە ڕێ؟ لەنێوان ئێوە و ئەواندا ماوەیەکی دوورو درێژ هەبووە، ئەی چۆن بەسەرهاتی ئەو غولام و نوسراوەتان زانی؟ ئەمە کارێك بوو لە مەدینەدا ڕێکخرابوو، پیلانێك بوو لە شەودا داڕێژرابوو!!

لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان وتیان: چۆنی دادەنێن داینێن، چیتان دەوێ بیلێن، ئێمە دەمانەوێ (عوسمان) بگۆڕدرێ، پێویستمان پێی نیە، با خۆی کەنار خا و خەلافەت بەجێ بێڵێ!![1]

کەواتە: سەبەئیەکان نوسراوەکەیان تەزویر کردووە

(عەلی کوڕی ئەبوطالب) و (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)رضي الله عنهما بە فیراسەتی ئیمانی خۆیان ئەم پیلانە گێلانەیان ئاشکرا کرد و، زانیان بەسەرهاتی ئەم نوسراوە تەزویر کراوە بەشێکە لە پیلانی سەبەئیەکان و، کەسێك لە مەدینە نوسیویەتی و داویەتە پاڵ (عوسمان)رضي الله عنه و لەڕێدەرچووەکانی کوفە و بەصرەشی لێ ئاگادار کردووە.

---

١ ـ سەیری تأريخ الطبري ٤: ٣٥٠-٣٥١، وە سەیری (العواصم من القواصم) ١٠٩-١٢٨، و (عثمان بن عفان)ی محمد صادق عرجون ١١٧-١٢٤ بکە.

لـە بەرامبـەر فیراسـەتی (عـەلی) و (موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمە) و دووربینیـان، لەڕێدەرچـووەکان ناچـار بـون لـە شـانۆگەری نوسـراوی هەڵبەستراو بێدەنگ بن و، ئامانجی ڕاستەقینەیان ئاشکرا بکەن.

ئەوەی داوای دەکەن سەری عوسمانە

ئەوەی داوای دەکەن سـەری (عوسمـان)ە، نوسـراوی هەڵبەستراویش تەنها بازنەیەکە لە بازنەکانی ئەو پیلانە جولەکەییە سەبەئیە!

لـەبیرمان نەچـێ لـە مەدینـەدا دوو سـەرکردەی لـەڕێ دەرچـووە سـەبەئیەکان بـەجێ مـابون، ئـەوانیش (ئەشـتەری نەخـەعی) و ( حـەکیمی کوڕی جەبەلە) بون، کە ڕۆڵێکی گەورەیان هـەبوو لە بەسـەرهاتی نوسـراوە هەڵبەستراوەکە و گەڕانەوەی میصری و کوفی و بەصراییەکان!

مەدینە لە خەڵکەکەی چۆل بوە

لـەڕێ دەرچـووەکان گـەمارۆی مەدینـەیان دا، خـەڵکی لەماڵـەکانیان مانەوە، ژمارەی پیاوەکان لە مەدینەدا کەم بوو، چونکە زۆربەیان موجاهید بون و لە بەرەکانی جەنگ بون، یا بانگخواز بون لە وڵاتە ڕزگارکراوەکاندا، زۆربەی ئەوانەشی لە مەدینەدا مابون چووبون بۆ بەجێهێنانی ڕێوشوێنی حەج.

لەوانەیە پیاوانی ناو مەدینە ژمارەیان کەمتر بووبێت لە لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان، کە ژمارەیان سێهەزار پیاو بون.

لە کۆتـایی مـانگی (ذو القعدة)دا (عوسمـان) نـەیتوانی بچێتە حـەج، کە هەموو سـاڵێ حـەجی دەکـرد، بەڵام لـەم سـاڵەدا سـەبەئیەکان مەدینـەیان داگیرکرد و (عوسمان)یان لە ماڵەکەی خۆیدا گەمارۆ دا.

پێویستە ئەمیرێکی حەج دیاری بکرێ، تا حەج بە خەڵکی بکا.

عوسمان،ئیبن عەباس بۆ ئەمیری حەج دیاری دەکا

(عوسمان)، بانگی (عبداللەی کوڕی عەباس)ی کرد، ڕایسپارد لەو وەرزەدا حەج بە خەڵکی بکا.

(ئـیبن عـەباس) پێـی وت: ئـەی ئـەمیری بـڕواداران! وازم لێ بێنـە، با لەگـەڵتا و لـە تەنیـشتتدا بم بـۆ ڕوبەڕووبونـەوەی ئەمانـە، سـوێند بـەخوا جیهادی ئەم لەڕێدەرچوانەم لە حەجەکە لەلا خۆشترە!

پێی وت: سورم لەسەر ئەوەی هەر دەبێ حەج بە موسڵمانان بکەی.

(ئیبن عەباس)ﷺ هیچی بۆ نەمایەوە تەنها گوێڕایەڵیکردنی ئەمیری بڕواداران نەبێ.

(عوسمان)ﷺ نوسراوێکی بۆ (ئیبن عەباس) نوسی تا لە حەجدا بۆ موسڵمانانی بخوێنێتەوە، بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ لەڕێدەرچووەکان و هەڵوێستی بەرامبەریان و داواکاریەکانی تێدا رونکردبویەوە.[1]

رەفتاری عوسمان بەرامبەر داگیرکردنی مەدینە

مانگی (ذي الحجة) هات و لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان گەمارۆی (عوسمان)یان دابوو، مەدینەیان داگیر کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا (عوسمان)ﷺ پێشنوێژی بۆ ئەوان و موسڵمانانی تر دەکرد، ئەو لەڕێدەرچوانەش لە پشتیەوە نوێژیان دەکرد.

نوسراوی عوسمان بۆ وڵاتان

کاتێ (عوسمان)ﷺ بینی ئەم سەبەئیانە نایانەوێ مەدینە بەجێ بهێڵن، نوسراوێکی بۆ موسڵمانانی وڵاتانی شام و کوفە و بەصرە نوسی، تیایدا داوای یارمەتی و هاتن بۆ مەدینەی لێ کردن، تاوەکو لەڕێدەرچووە سەبەئیەکانی لێ دەرکەن.. لەو وتانەی لەو نوسراوەدا هاتبوو:

((بسم الله الرحمن الرحيم

پاش ئەوە:

لەڕاستیدا خوای بەرز و بالا موحەممەدیﷺ بە هەقەوە ناردووە، بە موژدەدەر و ترسێنەر، ئەوەی خوا فەرمانی پێی کرد گەیاندی، پاشان ڕۆیی، ئەوەی لەسەری بوو ئەنجامی دا، لەدوای خۆی قورئانی بۆ بەجێ هێشتین، حەلاڵ و حەرامی تێدایە، ئەو کاروبارانەی ئەندازەی گیراوە روونی دەکاتەوە لەگەڵیان دەڕوا، بەندەکان پێیان خۆش بێ یان ناخۆش بێ.

پاشان خەلیفەیەتی (ئەبوبەکر) و (عومەر) بووﷺ، پاشان بەبێ زانیاری و داوای خۆم و بەبەرچاوی کۆمەڵێك لە ئوممەتەوە خرامە راوێژەوە، پاشان ئەهلی ڕاوێژ خۆیان و خەڵکی لەسەر من کۆبونەوە، بەبێ ئەوەی داوای بکەم و پێم خۆش بێ، منیش کارم تیایدا کردووە بەوەی بە چاکی دەزانن و پێیان خراپ نیە، بە شوێنکەوتەیی نەك بە زۆر شوێنکەوتن، شوێن

---

[1] ـ سەیری دەقی نوسراوەکەی عوسمان لە (تأريخ الطبري) ٤: ٤٠٧-٤١١ بکە.

پێهەڵگر بووم نەك بیدعەچی، ئیقتدام کردووە بەبێ زۆر لەخۆکردن و تەکەلوف، کاتێك کاروبارەکان کۆتاییان پێهات، شەڕ و زیان یەخەی خراپەکارانی گرت، کینە و قین و ئارەزوبازی بەدەرکەوت، بێئەوەی تاوانێك یا ناهەقیەك بەرامبەریان کرابێ.

عوسمان داوای یارمەتی لە خەڵکی وڵاتان دەکات بۆ سەر سەبەئیەکان

بەبێ بەڵگە و بیانو داوای شتێکیان دەکرد و شتێکی تریان رادەگەیاند، لە شتانێکدا نەنگیان پێگرتم کە خۆیان پێی رازی بون و، لە شتانێکی تردا کە بەبەرچاو خەڵکی مەدینەوە، جگە لەوانەیان بەگونجاو نەدەزانی.

چەند ساڵێکە دەبینم و دەبیستم، بەڵام هەر خۆم ڕاگرتووە و ئارامم گرتووە، ئەوانیش تادێ بەرامبەر خوا بە جورئەت تر دەبن.

تا لە دراوسێیەتی پێغەمبەری خوا و حەرەم و زەوی کۆچدا هەڵیان کوتاوەتە سەرمان، دەشتەکیەکانیان لەگەڵە، ئەوانە وەك کۆمەڵەکانی رۆژانی (الاحزاب)ن، یا ئەوانەی لە ئوحوددا غەزویان کردین.

جا ئەوەی دەتوانێ پێمان بگا، بگاتە لامان!))[1]

کارتێکردنی موسڵمانانی وڵاتان بە نوسراوەکەی عوسمان

کاتێ نوسراوی (عوسمان)ﷺ گەیشت بە موسڵمانانی وڵاتان، کاری تێکردن و سەریان سوڕما لە جورئەتی ئەو لەڕێدەرچوە ئاژاوەچیانە و، هەڵسان بە فریاکەوتنی خەلیفەکەیان و رزگارکردنی لەو گەمارۆیە، بەڵام قەدەری خوا پێش فریاکەوتنەکانی ئەوان کەوتبوو، هەروەك لە خێرایی ڕووداوەکاندا باسی دەکەین.

(موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ﷺ سوپایەکی لە شامەوە بە سەرکردایەتی (حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فیهری) نارد.

(عبداللەی کوڕی سەعید)یشﷺ لە میصرەوە سوپایەکی بە سەرکردایەتی (موعاویەی کوڕی خەدیجی سکونی) نارد.

هاوەڵان و تابعیەکان لە کوفە هانی سەرخستنی عوسمان دەدەن

لە کوفەشدا هەندێ لە هاوەڵان هەستان بە هاندانی خەڵکی کوفە تا دەرچن و فریای (عوسمان)ﷺ بکەون و مەدینە لەو لەڕێدەچوانە رزگار بکەن، لەوانەش:

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٥١-٣٥٢.

(عوقبەی کوڕی عەمر)، (عبداللەی کوڕی ئەبوئەوفا)، (حەنظەلەی کوڕی ڕەبیع).

لەو تابعیانەی بەهەمان کار هەڵدەستان لە کوفەدا:

هاوەڵانی (عبداللەی کوڕی مەسعود)، وەك (مەسروقی کوڕی ئەجدەع)، (ئەسوەدی کوڕی یەزید)، (شورەیحی کوڕی حارث)، (عبداللەی کوڕی عەکیم).

ئەو هاوەڵ و تابعیانە بە ڕێگەکانی کوفەدا دەڕۆیشتن و بە دەوری کۆڕەکانیدا دەسوڕانەوەو بە خەڵکەکەیان دەوت:

خەڵکینە! لە ڕاستیدا قسە ئەمڕۆیە نەك سبەی، ڕوانین ئەمڕۆ جوان دەبێ، سبەی ناشیرین دەبێ، جەنگ ئەمڕۆ حەڵاڵ دەبێ و سبەی حەرام دەبێ، ڕاپەڕن بۆ لای خەلیفە و پارێزەری کاروبارتان!

هەندێ لە چاکەخوازانی خەڵکی کوفە بە دەمیانەوە هاتن، بە سەرکردایەتی تێکۆشەر (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) بەرەو مەدینە دەرچوون بۆ فریاکەوتنی (عوسمان)ﷺ.

هەروەها لە بەصرەو شام و میصر

لەو هاوەڵانەی خەڵکی بەصرەیان هان دەدا بچن بۆ فریاکەوتنی (عوسمان)ﷺ" (عیمرانی کوڕی حەصین) و (ئەنەسی کوڕی مالیك) و (هیشامی کوڕی عامر) بونﷺ.

لە تابیعیەکانیش: (کەعبی کوڕی سور) و (هەرەمی کوڕی حەیانی عەبدی).

لەو هاوەڵانەی هانی خەڵکی شامیان دەدا: (عوبادەی کوڕی صامیت) و (ئەبو ئومامەی باهلی) و (ئەبودەرداء)ﷺ بوو.

لە تابعیەکانیش: (ئەبو موسلمی خەولانی) و (شورەیکی نەمیری) و (عبدالرحمنی کوڕی غەنەم) بوو.[١]

سوپاکانی میصر و شام و کوفە و بەصرە بۆ فریاکەوتنی عوسمانﷺ کەوتنە ڕێ، کاتێك لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان بە کەوتنەڕێیانی زانی، لە

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٥٢.

**خۆیان ترسان، پەلەیان کرد بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەیان و هەستان بە کوشتنی (عوسمان)ﷺ.**

**کاتێکیش سوپاکان بەمەیان زانی، هەر سوپایەی بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە، نەچوونە مەدینەوە!!**

**چوونە ناوەوەی سەبەئیەکان بۆ مەدینە و گەمارۆدانی (عوسمان)ﷺ لە هەشتی (ذي القعدة)ی ساڵی (٣٥)دا بوو.**

وتاری عوسمان لە یەکەم هەینیی پاش داگیرکردنی مەدینە

**کاتێک هەینیی یەکەمی داگیرکردنی مەدینە هات، (عوسمان)ﷺ دەرچوو بۆ ئەوەی وتاری هەینی بدات و نوێژ بە خەڵکی بکات، نوێژی بە خەڵکی کرد، پاش ئەوەی لەنوێژ بویەوە چووە سەر دوانگە، لە مزگەوتەکەدا لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان و هەندێ لە هاوەڵ وموسڵمانان ئامادەبون.**

**کاتێك (عوسمان)ﷺ چووە سەر دوانگە گوتی:**

**ئەی دوژمنان، خوا.. خوا.. لە خوا بترسن، سوێند بەخوا خەڵکی مەدینە دەزانن ئێوە لەسەر زمانی پێغەمبەری خواﷺ نەفرین لێکراون، دەی هەڵەکانتان بە چاکە بسڕنەوە، لە ڕاستیدا خوای گەورە خراپە ناسڕێتەوە بە چاکە نەبێ.**

سەبەئیەکان لە هەندێك هاوەڵ دەدەن و لە مزگەوت دەریان دەکەن

**(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) هەستایە سەر پێ و وتی: من شایەتی دەدەم ئێوە لەسەر زمانی پێغەمبەری خواﷺ نەفرین لێکراون.**

**(حەکیمی کوڕی جەبەلە)ی سەرکردەی سەبەئیەکانی کوفە بۆی هەستا و ڕایکێشا و بە زۆر داینیشاند!**

**پاشان (زەیدی کوڕی ثابیت)ﷺ هەستا و پێی وتن: ئەو نوسراوەم بدەنێ کە دەڵێن عوسمان بۆ والیەکەی میصری نوسیوە.**

**یەکێ لە سەبەئیەکان هەستا بۆی و بەزۆر داینیشاند.**

**پاشان سەبەئیەکانی ناو مزگەوتەکە هەڵچون و دەستیان کرد بە تێگرتنی بەرد و چەو بۆ هاوەڵ و موسڵمانانی تر و، لە مزگەوت دەریان کردن و تورپیانە دانە دەرەوەو جنێویان پێدان.**

دەستیان کرد بە بەرد و چەو باران کردنی (عوسمان)ﷺ کە لەسەر دوانگە بوو، لەسەر دوانگەوە بە لەهۆش خۆ چویی کەوتە سەر زەوی مزگەوتەکە، هەڵیانگرت و بە نەخۆشی و لەهۆشچوویی بردیانەوە ماڵێ!!

کۆمەڵێك لە هاوەڵان خۆیان گورج کردەوە بۆ جەنگان، ئامادەی شەڕکردن بون لەدژی لەڕێدەرچووە سەبەئیەکاندا، هەرچەندە کەمتر و لاوازتر بون لەوان، ئەو هاوەڵانەش:

(سەعدی کوڕی ئەبووەقاص)، (ئەبوهورەیرە)، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)، (زەیدی کوڕی ثابیت)، (حەسەنی کوڕی عەلی)، (عبداللهی کوڕی زوبەیر)ﷺ و چەندانی تر بون.

هاوەڵان بە فەرمانی عوسمان جەنگ ناکەن

کاتێك (عوسمان)ﷺ بەمەی زانی، ناردی بەشوێنیاندا، فەرمانی دانێ کە جەنگ نەکەن و چەکەکانیان دانێن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان!!!

ئەوانیش وەك گوێڕایەڵی فەرمانیان بەجێ هێنا، بەڵام زۆریان پێناخۆش بوو!

هەریەکە لە (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ هاتن و چوونە ژوورەوە بۆ لای و بۆ نەخۆشیەکەی سەردانیان کرد و لە بەرامبەریدا سکالاّ و خەم و خەفەتیان دەربڕی، پاشان گەڕانەوە ماڵەکانیان.

عەلی خۆیان لێ بەری دەکاو ئینکاری نوسینی نوسراو دەکا

چەند کەسێك لە سەبەئیەکانی میصر دەچنە لای (عەلی)ﷺ و پێی دەڵێن: هەستە لەگەڵمان بۆ لای (عوسمان) بۆ ئەوەی لەکاری بخەین، لە ڕاستیدا خوا خوێنەکەی بۆ حەلاڵ کردووین!

(عەلی)ﷺ لێیان تورە بوو، نەفرینی لێکردن و وتی: سوێند بەخوا لەگەڵتان نایەم.

سەبەئیەکان نوسراو بەناوی عەلی و هاوەڵانەوە دەنوسن

هەندێکیان پێیان وت: ئەی کەواتە بۆچی نوسراوت بۆ ناردین تا لە میصرەوە بێین و لە فەرمانی (عوسمان) دەرچین و ئینکاری لێ بکەین، ئەگەر بەهۆی نوسراوەکەی تۆوە نەبوایە ئێمە نەدەهاتین!!

(عەلی)ﷺ لە قسەکانیان سەری سوڕما و، پێی وتن: سوێند بەخوا هیچ کاتێ نوسراوم بۆ نەناردوون! هەندێکیان بەسەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریان

کرد و وتیان: ئایا لەپێناو (عەلی) دەجەنگن؟ لەبەر ئەو تورە دەبن؟[١]

ئەم هەواڵە ڕێگە و شێوازی شەیتانە جولەکە سەبەئیەکانمان پێ نیشان دەدات، لە هەڵخەڵەتاندنی هەرچی و پەرچی و موسڵمانە سادەکان و پەلکێشی و کارتێکردنیان تا بۆ لای خۆیانیان ببەن و لە تێکدانی کاروباری موسڵمانانیدا وەگەڕی بخەن و زاڵ ببن بەسەر سیستەمی حوکم لەناویاندا.

ئا ئەمە (تەزویر)کردنی نوسراوە لەسەر زمانی گەورە هاوەڵان و دانەپاڵیان، وا گومان ببردرێ بەوەی ئەوان خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دەرچوون لەسەر (عوسمان) و ئینکار لەسەرکردن و لەکارخستنی، ئەگەر نا کوشتنی!

ئا ئەوە سەبەئیەکانی میصر نوسراو لەسەر زمانی (عەلی)ﷺ تەزویر دەکەن و ئاژاوەچیەکانی هاوەڵیان دەخەڵەتێنن، بەوەی ئەوان دەرنەدەچوون ئەگەر (عەلی) داوای دەرچوونی لێ نەکردنایە، هەر بۆیە سەریان سوڕما کاتێ (عەلی)ﷺ سوێندی خوارد بەخوا کە ئەو هیچ کات نوسراوی بۆ نەنوسیون!!

طەلحە و زوبەیر ئینکاری نوسینی نوسراو دەکەن بۆیان

(طەڵحەی کوڕی عبیداللە)ﷺ لە بەرامبەر ئاژاوەچیەکانی بەصرە ئینکاری ئەوەی کرد کە ئەو نوسراوی بۆ نوسیبێتن بەوەی لەسەر (عوسمان) دەرچن و بێن بۆ مەدینە!

بە هەمان شێوە (زوبەیری کوڕی عەوام)یشﷺ لە بەرامبەر لەڕێدەرچووەکانی کوفەوە هەمان ئینکاری کرد.

عائشە تەزویرکردنیان لەسەر زمانی ئەوەوە دەگێڕێتەوە

پاش ئەوەی (عوسمان)ﷺ کوژرا، (مەسروق)ی تابعی لە بەرامبەر دایکی ئیمانداران (عائشە) دانیشت.

(عائشە) سەبارەت بە (عوسمان)ﷺ وتی: بەراستی (عوسمان) بە ستەم لێکراوی کوژرا، نەفرینی خوا لەوەی کوشتی، وەك جلی سپی پاك بوو لە پیسی بەجێیان هێشت، پاشان وەك بەران سەریان بڕی!

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٥٢-٣٥٣.

(مەسروق) پێی وت: ئەمە کاری تۆ بوو! تۆ بۆ خەڵکت دەنوسی، فەرمانت دەدانێ تا لە فەرمانی (عوسمان)ﷺ دەرچن!!

(عائشە) وتی: نە بەو خوایەی بڕواداران ئیمانیان پێیەتی، بێبڕوان پێی کافرن، ڕەشم لەسەر سپی بۆ دانەناون(هیچم بۆ نەنووسیون)، تا ئەم دانیشتنەی ئێستا لێی دانیشتووم!!!

(ئەعمەش) کە لە (مەسروق)ەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: وایان دەزانی نوسراوەکان لەسەر زمانی (عائشە) نووسراون![1]

لە ڕاستیدا هەڵبەستانی نوسراوەکان بەدەمی گەورە هاوەڵانەوە لە پیسترین ئامرازە شەیتانیەکان بوو، کە سەبەئیەکان گرتبویانە بەر بۆ کارتێکردنی هەرچی و پەرچیەکان و وروژاندنیان دژ بە (عوسمان)ﷺ.

نوسراویان لە سەر زمانی (عائشە) و (عەلی و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ هەڵبەستابوو، هەروەك بە زمانی (عوسمان) خۆیشیەوە هەڵیانبەستا.

دوای ئەوەی (عوسمان)ﷺ لەو هەینیەدا لەهۆش خۆی چوو، کە لە ناوەڕاستی مانگی (ذي القعدة)دا بوو، بەردەوام لە مزگەوتدا پێشنوێژی دەکرد، لە دوایشیەوە موسڵمانە چاکخواز و لەڕێدەرچوە سەبەئیەکانیش نوێژیان دەکرد.

سەبەئیەکان فەرمانڕەوای فیعلی مەدینە بون و ئەمیرەکەیان ئیمام بوو

دوای ئەوە بەچەند ڕۆژێ لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان نەیانهێڵا پێشنوێژی بکات، لە ماڵەکەی خۆیدا گەمارۆیان دا، نەیانهێڵا هیچ یەك لە گەورەهاوەڵان پێشنوێژی خەڵکی بکا.

لەڕاستیدا ئەوان فەرمانڕەوای مەدینە بون، بە ڕێگەکاندا هاتوچۆیان دەکرد و نەیاندەهێشت موسڵمانان تیایدا کۆببنەوە، بەرهەڵستی هاتنەدەرەوەی (عوسمان)یان دەکرد لە ماڵەکەی خۆیدا.

ئەمیری لەڕێدەرچووەکانی میصر و فەرمانڕەوای فیعلی مەدینە لە ڕۆژانی گەمارۆدا (غامقی کوڕی حەربی عەککی)، پێش دەکەوت و بە ئیمام نوێژیان بە خەڵك دەکرد، لە دوایشیەوە لەڕێ دەرچووەکانی میصر و کوفە

---

[1] ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٧: ١٩٥.

و بەصرە نوێژیان دەکرد.

بەڵام خەڵکی مەدینە لە ماڵەکانیان مانەوە، لەترسی ئەوان هیچ یەکێکیان بەبێ چەك لەماڵ دەرنەدەچوون و، ژمارەیان لە لەرێدەرچووەکان کەمتر بوو![1]

لە رۆژانی دوایی گەمارۆکە گەورە هاوەڵان مەدینەیان بەجێهێشت، ئەوەبوو (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر) و (سەعد)ﷺ و کەسانی تریش دەرچوون.

عوسمان مۆڵەت بە هاوەڵان نادات جەنگیان لەگەڵدا بدەن

کاتێك سەبەئیەکان گەمارۆی (عوسمان)یان دا، کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە دەوریدا بەرگرییان لێدەکرد، نزیکەی حەوت سەد کەسێ دەبون، کە تیایاندا (عبداللەی کوڕی عومەر) و (عبداللەی کوڕی زوبەیر) و (ئەبوهورەیرە) و (حەسەن) و (حوسەین) و (مەروانی کوڕی حەکەم) و کەسانی تر هەبونﷺ.

عوسمان رێگری لە زەید و ئەبوهورەیرە و ئیبن عومەر دەکات کە بجەنگن

ئەگەر (عوسمان)ﷺ مۆڵەتی جەنگ کردنی پێبدانایە جەنگیان دەکرد، بەڵام ئەو جەنگ نەکردنی هەڵبژارد، پێی وتن: سوێند دەخۆم هەرکەسێك گوێڕایەڵی منی لەگەردندایە، با دەست بکێشێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی!

(زەیدی کوڕی ثابیت)ﷺ هات بۆ لای (عوسمان)ﷺ، پێی وت: ئەوە ئەنصارەکان لەبەردەرگان و دەڵێن، ئەگەر دەتەوێ دووجار دەبین بە (أنصار الله)!

(عوسمان)ﷺ پێی وت: پێویستیم بەوە نیە، دەستان هەڵگرن و مەجەنگێن!

(ئەبو هورەیرە)شﷺ هات بۆ لای و چەکەکەی لەشاندا بوو، دەیوت: ئەمرۆ لێدران لەگەڵتدا شادیە!

(عوسمان)ﷺ پێی وت: سوێندت لەسەر دەخۆم کە دەبێ دەرچیت، بگەڕێوە بۆ ماڵەکەت و جەنگ مەکە.

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٥٤.

(عبدالله‌ی کوڕی عومەر)ﷺ هات بۆ لای و چەکەکەی هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی تا لەدژی لەڕێدەرچووەکاندا بجەنگێ -(عبدالله) تەنها دوو جار چەکی هەڵگرتوە: لە ماڵی (عوسمان)ﷺ بۆ بەرگریکردن لێی، ئەو ڕۆژەش کە سەرکردەی لەڕێدەرچووەکان(نەجدەی کوڕی عامر) لەسەردەمی (ئیبن زوبەیر)دا ویستی بێتە مەدینەوە-.

(عوسمان)ﷺ پێی وت: هەستە فەرمانی من بە خەڵکی بگەیەنە کە نەجەنگن و لە ماڵەکانیان بمێننەوە!

چەند گێڕانەوەیەك سەبارەت بە ڕێگری کردنی عوسمان لە جەنگ

(سولەیطی کوڕی ئەبو سولەیط)ﷺ وتویەتی: (عوسمان)ﷺ بەرهەڵستی شەڕکردنی لەدژی لەڕێلادەرەکان ئێکردین، ئەگەر مۆڵەتی چەنگی بدایناية، لێمان دەدان تا لە مەدینە دەرمان دەکردن.

(عبدالله‌ی کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە)ﷺ وتویەتی: من لەگەڵ (عوسمان)ﷺ لە ماڵەکەیدا بووم، پێی وتین: سوێند دەخۆم لەسەر هەموو ئەوانەی وا دەبینن گوێڕایەڵی منیان لەسەرە، دەست و چەکەکەی لە جەنگ بکێشێتەوە، باشترینیان بۆ من ئەوەیە دەست و چەکەکەی لە جەنگ دەکێشێتەوە.

عوسمان ڕێگری جەنگ لە کوڕانی هاوەڵان دەکات

لەگەڵ (عوسمان)ﷺ لە ماڵەکەیدا کۆمەڵێك لە کوڕانی هاوەڵان هەبون: (حەسەن) و (حوسەین)ی کوڕی عەلی، (عبدالله‌ی کوڕی زوبەیر)، (موحەممەدی کوڕی طەڵحە)، (مەروانی کوڕی حەکەم)، (عبدالله‌ی کوڕی عومەر)ﷺ.

(عوسمان)ﷺ پێی وتن: سوێندتان ئێدەخۆم کە بگەڕێنەوەو چەکەکانتان دانێن و لە ماڵەکانتان بمێننەوە![1]

ئەشتەری نەخەعی گفتوگۆ لەگەڵ عوسمان دەکا

لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان یەکێك لە سەرکردەکانیان نارد بۆ لای (عوسمان)ﷺ تا دەستبەرداری خەلافەت بێ، ئەویش (ئەشتەری نەخەعی- مالکی کوڕی حارث-) بوو.

(عوسمان)ﷺ پێی وت: چیتان دەوێ؟

---

١ ـ بۆ ئەم هاوەڵانەو جگە لەمەش سەیری (العواصم من القواصم) و پەراوێزەکانی (محب الدین الخطیب) ١٣٢-١٤٢ لەسەری بکە.

(ئەشتەر) وتی: سێ شت، بواری تێدا نیە دەبێ یەکێکیان جێبەجێ بکرێت.

(عوسمان) وتی: ئەوانە چین؟

(ئەشتەر) وتی: خۆت لە خەلافەت لەکار خەی، بە خەڵکی بڵێی: ئەمە کاروباری ئێوەیە، کێتان دەوێ هەڵیبژێرن! ئەگەر نەتکرد، ئەوا دەتوانی تۆڵە لەخۆت بکەیتەوە! ئەگەر ئەوەشت نەکرد، ئەوا خەڵکی بێگومـ ن دەتکوژن!

عوسمان هەرسێ پێشنیارەکەی ئەشتەر ڕەت دەکاتەوە

(عوسمان)ﷺ پێی وت: سەبارەت بەوەی کاروباریان بدەمە دەست و خۆم لەکار بخەم، ئەوە من نایکەم، من کراس و قەمیسێك کە خوا لەبەرمی کردووە لەبەری داناکەنم، واز ناهێنم لە ئوممەتی موحەممەد، بەسەریەکدا بکەون.

بەڵام ئەوەی کە تۆڵەیان لەخۆم بۆ بکەمەوە، ئەوا شتێکم نەکردووە کە مایەی تۆڵەسەندن بێت، دوو هاوەڵەکەم، (ئەبوبەکر) و (عومەر)یش تۆڵەیان لەخۆیان نەسەندووە، لاشەشم بەرگەی ئەوە ناگرێ.

ئەگەر دەشم کوژن، بە شتێك هەڵنەستاوم شایستەی کوشتن بم، سوێند بەخوا گەر بمکوژن، لەدوای من هیچ کات یەکتریتان خۆش ناوێ و هیچ کاتێکیش پێکەوە نوێژ ناکەن، هیچ کاتیش پێکەوە جەنگی دوژمن ناکەن![1]

(عوسمان)ﷺ لەو بارەیەوە ڕاوێژی بە هەندێ لە گەورە هاوەڵانی دەوروبەری کرد، ڕاوێژی بە (عبداللەی کوڕی زوبەیر)ﷺ، کەپێش ئەوەی (عوسمان)ﷺ فەرمانی پێبکات بە ڕۆیشتن ئەمیریماڵەکەی بوو.

عوسمان هەرسێ پێشنیارەکەی ئیبن زوبەیر پەسەند ناکا

(ئیبن زوبەیر)ﷺ پێی وت: ئاماژەت پێ دەدەم بە یەك لەم سێیە:

یا ئیحرامی عەمرە ببەستە، کە ئەوکاتە خوێنت لەسەریان حەرام دەبێت، یا ئەوەتانێ سواربە و بچۆ بۆ لای (موعاویە) لە شام، یا مۆڵەتمان بدە و لەگەڵمان دەرچۆ، تا بەشمشێر لەملی ئەوانە بدەین، تا خوا لەنێوان ئێمە و ئەواندا فەرمانی خۆی دەدات، بەراستی ئێمە لەسەر هەقین و ئەوان

---

١ـــ البداية والنهاية: ابن كثير ٧: ١٨٤.

لەسەر ناهەق!

(عوسمان)ﷺ پێی وت: گەر ئیحرام ببەستم بۆ عەمرە، ئەوە ڕێیان لێناگرێت لە کوشتنم، چونکە ئەوان وا دەبینن خوێنم حەڵاڵە، جا پێش ئیحرام بێ یان دوای ئیحرام!!

ڕۆیشتنم بۆ شام، ئەوا من واز لە دراوسێیەتی پێغەمبەری خواﷺ ناهێنم، شەرمیش لەخوا دەکەم بە ترسنۆکی لەنێوانیانەوە دەرچم و خەڵکی شام بمبینێ، کافران هەواڵم ببیستن و دڵخۆش بن پێی و ئۆخەی دەربڕن!

ئیبن عومەر ئاماژە بە عوسمان دەدات کە تەنازول نەکات

بەڵام کوشتنیان، من هیواخوازم بەخوای خۆم بگەم و، بەهۆی منەوە لوێچە خوێنێك نەڕژێ![1]

(ئیبن عومەر)ﷺ پێی وت: ئایا لە دنیادا بە هەتاهەتایی دەژیت؟

(عوسمان)ﷺ وتی: نەخێر.

وتی: دەتوانن لە کوشتن زیاترت لێ بکەن؟

(عوسمان) وتی: نەخێر.

وتی: ئایا بەهەشت و دۆزەخیان بەدەستە؟

(عوسمان) وتی: نەخێر.

(ئیبن عومەر)ﷺ وتی: دەی کراسی خوا لەبەرت دامەکەنە، تا لەدوای تۆوە نەبێتە سوننەتێك، هەر قەومێك خەلیفەیان خۆش نەوێ لەکاری بخەن یا بیکوژن![2]

دووربینی ئیبن عومەر

خوا لە (عبداللەی کوڕی عومەر) ڕازی بێت، چەند وردبین بووە، ئەو دەیەوێ (عوسمان)ﷺ سوننەتێکی نەشیاو دانەهێنێ بۆ خەلیفەکانی دوای خۆی-حاشا لە (عوسمان) وا بکات-، ئەگەر (عوسمان) بۆ ئەو لەڕێدەرچوە سەبەئیانە تەنازولی بکردایە و خۆی لەکاربخستایە، ئەو کاتە خەلیفەکان دەبون بە بووکەشوشەی دەستی چاوچنۆك و قین لەدڵان، بەم

---

١ ـ البداية والنهاية ٤: ١٩٨.

٢ ـ العواصم من القواصم: ١٣٠.

شێوەیە وێنەی خەلیفە دەلەرزێ و سامی لە دڵی خەڵکیدا نامێنێ.

بەم شێوەیە (عوسمان)ﷺ ڕێوشوێنێکی جوانی بۆ دوای خۆی کێشا، بەراوێژی (ئیبن عومەر) و جگە لەویش هاوەڵانی ترﷺ، ئەوە بوو ئارامی گرت و پاداشتی لەخوا ویست، لە خەلافەت دانەبەزی و خوێنی موسڵمانانیشی نەڕشت!!

دوا دیداری عوسمان

دوا دیدارێکی گشتی (عوسمان)ﷺ لەگەڵ موسڵماناندا، پاش چەند هەفتەی گەمارۆ بوو، ئەوەبوو خەڵکی بانگ کرد، بە شەڕکەرە کتوپڕە سەبەئیەکان و، بێوەیەکانی دانیشتووی خەڵکی مەدینەشەوە، لەپێشەوەی هاتواندا (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر) هەبونﷺ، کاتێك لەبەردەمیدا دانیشتن، پێی وتن:

عوسمان ئامۆژگاری موسڵمانان دەکات

لە ڕاستیدا خوای باڵادەست بۆیە دنیای پێبەخشیون تا دوارۆژی پێ وەدەست خەن، دنیای پێنەبەخشیون تا پەنای بۆ بەرن و چنگی پێداکەن.

لە ڕاستیدا دنیا لەناو دەچێت، دوارۆژ دەمێنێتەوە، دەی ئەوەی لەناودەچێ لوتبەرزتان نەکات، لەوەی دەمێنێتەوە سەرقاڵتان نەکات، ئەوەی دەمێنێتەوە پێشیخەن بەسەر ئەوەی لەناودەچێت، بەراستی دنیا بڕاوەیە، گەڕانەوەش بۆ لای خوایە، دەی لەخوا بترسن، چونکە لەخواترسان قەڵغان و پارێزەرە لە سزا و تۆڵەی ئەو، پابەند بن بە کۆمەڵەکەتانەوە، مەبن بە دەستەدەستە، خواش فەرموویەتی:

﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا: بیر لەو چاکە بکەنەوە کە خودا دەربارەی کردن" کە ئێوە دژ بەیەکتر بون، بەدڵ کردوونی بەهۆگر" لەسایەی چاکەی ئەمەوە، ئێستا لەگەڵ یەکتر بونە برا﴾آل عمران/١٠٣.

پاشان بە موسڵمانانی گوت:

بە ئارام و ئومێدی پاداشتەوە ماڵئاواییان لێدەکات

ئەی خەڵکی مەدینە! بەخواتان دەسپێرم و، داواکارم لەخوای گەورە خەلافەت لەدوای من چاك بکات، لە ڕاستیدا من لەمڕۆ بەدواوە ناچم بۆ لای کەس، تا خوا فەرمانی خۆیم بەسەردا جێبەجێ دەکات، وازدێنم لەم لەڕێدەرچوانە کە لە دەرگای ماڵم بن، هیچیان پێ نابەخشم تا لە دین یا

دنیادا بیکەنە ڕێچکەیەك، تا خوا خۆی چی باشە لەم کارەدا ئەنجامی بدا![1]

لەدوای ئەوەوە (عوسمان)ﷺ لە ماڵەکەی خۆی مایەوە، تا ئەجەلی هات و سەبەئیەکان هەستان بە خوێن ڕشتنی.

توندکردنی گەمارۆ لەسەر عوسمان

کاتێك سەبەئیەکان بینیان (عوسمان)ﷺ سورە لەسەر تەنازول نەکردن، گەمارۆیان لەسەر ماڵەکەی توند کردەوەو نەیاندەهێلا کەس بچێتە لای، بەڵکو نەیاندەهێلا موسڵمانان خواردن و خواردنەوەشی بۆ ببەن.

عوسمان داوای ئاو دەکات

خانەوادەی (حەزم) دراوسێی ماڵی (عوسمان) بوو، (عوسمان)ﷺ رووی لێنان و کوڕەکەیانی نارد بۆ لای (عەلی کوڕی ئەبوطالب) و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ و خێزانەکانی پێغەمبەری خواﷺ، پێی وتن: ئەو خەڵکە ئاویان لێ قەدەغە کردوین، ئەگەر توانیتان هەندێ ئاومان بۆ بنێرن، ئەوا بۆمان بنێرن!

سەبەئیەکان رێگە بە عەلی نادەن فریای عوسمان بکەوێت

(عەلی) دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، هاواری بەسەر لەرێدەرچووەکاندا کرد و پێی وتن: هۆ خەڵکینە! ئەوەی ئێوە دەیکەن بە کاری بڕواداران و بێباوەڕانیش ناچێت، خواردن و خواردنەوە لەم پیاوە مەبڕن، لە راستیدا فارس و رۆم و کافرەکان دیل دەگرن خواردن و خواردنەوەیان پێ دەدەن، لەپای چی خوێنی ئەم پیاوە حەڵاڵ دەکەن و گەمارۆی دەدەن؟

(عەلی)یان دەرکرد و پێیان وت: سوێند بەخوا ناهێڵین بخوات و بخواتەوە.

کاتێ (عەلی)ﷺ نەیتوانی گەمارۆکە بشکێنێ و، خواردن و خواردنەوە بە عوسمانﷺ بگەیەنێ، یا بچێتە لای و قسەی لەگەڵ بکات، مێزەرەکەی فڕێدایە ماڵی عوسمانەوە تا بیبینێ و بزانێ عەلی بەو کارە هەستا کە پێی سپاردبوو، بەڵام نەیتوانی بە فریای بکەوێ!

سەبەئیەکان رێگە لە ئوم حەبیبە دەگرن ئاویان پێ بگەیەنێت

(ئوم حەبیبە)ی دایکی بڕواداران، کە رەملەی کچی ئەبوسوفیان– بوو، هەستا بە هەوڵێك بۆ فریاکەوتن و ئاوپێدانی، بە سواری هێسترێك هات بۆ

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٨٤–٣٨٥.

لای ماڵی (عوسمان)ﷺ و کوندەیەکی پڕ ئاوی پێبوو، لەڕێدەرچووەکان ڕێیان لێگرت و نەیانهێشت بچێتە ژورەوە.

پێیان وترا: ئەوە (ئوم حەبیبە)ی دایکی بڕوادارانە، خێزانی پێغەمبەری خوایەﷺ.

وتیان: ناهێڵین بچێتە ژوورەوە، ئینجا لەرووی هێسترەکەیان دا.

پێی وتن: هەندێ ڕاسپاردەی بەنی ئومەییە لەلای (عوسمان)ە، ئەمەوێ ببینم و پرسیاری لێبکەم، تا ماڵ و سامانی بێوەژن و هەتیویان بەفیڕۆ نەچێ!

پێیان وت: تۆ درۆدەکەی، بەڵکو دەتەوێ ئاوی پێبدەی.

لەو کاتەی ئەو لەسەر هێسترەکەی بوو، گوریسی هێسترەکەیان پچڕاند، (ئوم حەبیبە) لار بوویەوە و وەخت بوو بکەوێ، گەر موسڵمانان پێی نەگیشتنایە، جا گرتیان و گەڕاندیانەوە بۆ ماڵ.

گفتوگۆی عائیشە لەگەڵ مەروانی کوڕی حەکەم و چوونی بۆ حەج

کاتێك (عائیشە) ڕوداوەکەی بینی، لەو لەڕێدەرچووە سەبەئیانە تووڕە بوو، لە مەدینەوە بەرەو مەککە بۆ حەج کردن کەوتە ڕێ.

(مەروانی کوڕی حەکەم) پێی گەیشت و پێی وت:

ئەی دایکی بڕواداران، ئەگەر لە مەدینەدا بمێنیتەوە باشترە، چونکە لەوانەیە ئەوانە سامت لێ بکەن و، لەگەڵ (عوسمان)دا باشتر بن!!

پێی وت: مەروان! دەتەوێ هەمان ڕەفتاری (ئوم حەبیبە)م لەگەڵ بکەن، پاشانیش کەس بەرگریم لێنەکا و پاڵپشتم نابێ، نەخێر بەخوا خۆم عەیبدار ناکەم، ناشزانم سەرئەنجامی ئەم خەڵکە بەرەو کوێ دەچێ، بەخودا ئەگەر بمتوانیبایە وابکەم خوای گەورە ئەوانە بێبەش بکات لە هەوڵ و مەبەستەکانیان، ئەوا دەمکرد.

موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر نایەوێ لەگەڵ عائیشەی خوشکیدا بچێت بۆ حەج

(عائیشە) داوای لە (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر)ی برای کرد کە لەگەڵی بچێت بۆ حەج، کە یەکێك بوو لە سەرانی فیتنە و (عبداللەی کوڕی سەبەء) هەڵیخەڵەتاندبوو، لەگەڵی دەرنەچوو، ئەوەی بەباش زانی کە لەگەڵ سەبەئیەکاندا بمێنێتەوە و، لە گەمارۆدانی (عوسمان)دا بەشدار بێ.

(عائیشە) لێی توڕە بوو، پێی وت: تو (موحەممەد) نیت، بەڵکو (مُذَمَّم: سەرزەنشتکراو)یت!

کاتێك (حەنظەلەی کوڕی ڕەبیعە)ی نووسەرﷺ بەم هەڵوێستەی (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر)ی زانی، پێی وت: موحەممەد! خوشکەکەت دایکی بڕوادارانە، داوای ئەوەت لێدەکات لەگەڵی بچی بۆ حەج، بەڵام شوێنی ناکەویت، بەڵام گورگ و قەلەڕەشەکانی عەرەب بانگت دەکەن بۆ شتێکی نادروست، کە دەرچوونە لەسەر خەلیفە، شوێنیان دەکەویت!

(موحەممەد) وتی: ئیبنی تەمیمی! تۆ چیت بەسەر ئەوەوە هەیە،؟

لێکدانەوەکەی حەنظەلە ڕاست دەرچوو

(حەنظەلە) بەدەم خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕە شیعرە ڕۆیشت، کە لە تروپکی داناییدان:

عَجِبْتُ لِما يُخوضُ الناسُ فيهِ　　يَرمــونَ الخلافــةَ أنْ تَــزولا
وَلَــو زالَــتْ لَزالَ الخَيرُ عَنْهُمْ　　وَلاقَــوْا بَعــدَها ذُلاًّ ذَلــيلاً
وَكانـوا كَاليَهودِ أو النَّصارى　　سَــواءً كلُّهُــمْ ضَــلّوا الــسَّبيلا[1]

ئەوەی (حەنظەلە)ی نووسەر بە فیراسەتی ئیمانی خۆی چاوەڕێی دەکرد، ڕویداو هاتەدی، چونکە پەرتەوازەیی موسڵمان و، لاوازی خەلافەت یان لابردنی، سەر دەکێشێ بۆ سەرشۆڕی و سوکی و گومڕابونی موسڵمانان.

(حەنظەلە) بە بیرتیژی و وردبینیەکەی ئەوەی هەست پێکردبوو، کە ئامانجی ئەم لەڕێدەرچوە سەبەئیانە خودی (عوسمان)ﷺ نیە، بەڵکو مەبەستی شەیتانەکانیان سیستەمی فەرمانڕەوایی(حکم)ی ئیسلامە، دەیانەوێ خەلافەت لەناوببەن!!

لەیلای کچی عومەیس، ئامۆژگاری برا لەڕێ دەرچوەکانی دەکا

(لەیلای کچی عومەیس) بە (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) کە برای بوو لە دایکەوە، چونکە کچی (ئەسمائی کچی عومەیس) بوو، هەروەها بە (موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوطالب)–ئەمیش برای بوو،

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٨٥-٣٨٦

**چونکە (ئەسمای کچی عومەیس) خێزانی (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب) بوو، کاتێك لە موئتەدا شەهید بوو (ئەبو بەکری صدیق)ﷺ مارەی کرد-، پێی وتن:**

**لە ڕاستیدا چرا خۆی دەسوتێنێ و ڕۆشناییەکەی بۆ خەڵکە، جا لە کارێکدا خۆتان گوناهبار مەکەن کە سبەی لەسەر ئێوە کەس خۆی گوناهبار ناکا! ئەم هەوڵەی ئەمڕۆ ئێوە دەیدەن بۆ دەرچوون لەسەر (عوسمان) سبەی بۆ جگە لەئێوەیە، ئەمڕۆ خۆتان لەکارێك بپارێزن کە ئەو کردەوەیە سبەی دەبێتە ئاخ و حەسرەت لە سەرتان!!**

**ئەوان لێی تووڕە بون و وتیان: ئەوەی (عوسمان) پێی کردین لەبیرمان ناچێ!**

**پێی وتن: چی پێکردوون، لەوە زیاتری نەکردوە کە پابەندی شەرعی خوای کردوون و لەسەرپێچی فەرمانی خوا تەمێی داون![1]**

پەلەکردنی سەبەئیەکان لە جێبەجێکردنی نەخشەکەیان، پاش سی ڕۆژ لە گەمارۆ

**سی ڕۆژ بەسەر گەمارۆدانی (عوسمان)ﷺ لەلایەن سەبەئیەکانی تێپەڕی-ئەوەبوو گەمارۆکە لە هەشتی مانگی (ذي القعدة) دەستی پێکرد- سوپای موسڵمانان لە میصر و شام و کوفە و بەصرەوە بۆ فریاکەوتنی (عوسمان) و دژایەتیکردنی لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان بەڕێ کەوتن.**

**لەڕێدەرچووەکان هەواڵی دەرچوونی سوپاکانیان زانیبوو، بۆیە پەلەیان کرد بۆ لەناوبردنی (عوسمان) و کوشتنی، تا پەرتەوازەیی نێوان موسڵمانان زیاتر بێت و موسڵمانانیش نەتوانن لەدژی ئەوان ڕێك بکەون.**

حاجیەکان و سوپاکان بەرەو مەدینە دێن

**هەروەها لەڕێدەرچوان زانیان وەرزی حەج کۆتایی پێهات و حاجیەکانیش سورن لەسەر ئەوەی بێن بۆ مەدینە و پشتگیری (عوسمان)ﷺ بکەن و زاڵ بن بەسەر ئەو لەڕێدەرچوانەوە، (ئیبن عەباس)ﷺ نامەکەی (عوسمان)ی بەسەر حاجیاندا خوێندەوەو کاری تێکردن و وتیان: کاتێك لەحەج ئێدەبینەوە دەچینە مەدینە و لەدژی میصری و شوێنکەوتەکانیان دەجەنگین، ئەوانەی گەمارۆی (عوسمان)یان**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٨٧.

داوە، جەنگانیان عیبادەتە، ئەوەش دەخەینە پاڵ عیبادەتی حەجەکەمان.

بە کرداریش سەرەتای حاجیەکان گەیشتنە مەدینە، یەکەم کەسێك کە گەیشتە مەدینە (موغیرەی کوڕی ئەخنەسی کوڕی شورەیق) بوو کە چووە ماڵی (عوسمان) و بەرگری لێکرد و لەگەڵ دوژمنە سەبەئیەکان بەشەڕ هات!

سەبەئیەکان شەڕ بە منداڵانی هاوەڵان دەفرۆشن

سەبەئیەکان شەڕیان بە (عوسمان)ﷺ و ئەوانەی لەناو ماڵەکە لەگەڵیدا بون دەفرۆشت،-کۆمەڵێك لە کوڕانی هاوەڵان لەگەڵی بون و بەرگریان لێی دەکرد، وەکو کوڕەکانی (عەلی) و کوڕی (طەڵحە) و کوڕی (زوبەیر) و کوڕی (عومەر) و کوڕی (حەکەم)ﷺ-، دەیانویست بیانویەکیان دەستکەوێ بیکەنە پاساوی هێرش کردنە سەر ماڵی (عوسمان)ﷺ، بەڵام دەستیان نەدەکەوت.

عبدالله ی کوڕی سەلام بە قسەیەکی زۆر جوان ئامۆژگاری سەبەئیەکان دەکات

گەمارۆکەیان بۆ ماڵی (عوسمان)ﷺ زیادی کرد، زیادەڕەویان کرد لە نەهێشتنی هێنانی خواردن و ئاو بۆ ئەوانەی لەناو ماڵەکەدا گەمارۆدرابون، کەمێك ئاویان پێدەگەیشت، ئەوەش بەنهێنی و شاراوایی لەماڵی (ئیبن حەزم)ی دراوسێیانەوە.

چەند ڕۆژێك پێش کوشتنی (عوسمان)ﷺ لەلایەن لەڕێدەرچووەکانەوە، هاوەڵی پایەبەرز (عبداللەی کوڕی سەلام)ﷺ-کە پێش موسڵمان بونی یەك لە زانایانی ئایینی جولەکە بوو- بەوێدا تێپەڕی و لەبەر دەرگای ماڵی (عوسمان)دا وەستا و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ لەڕێدەرچووە گەمارۆدەرەکان و پێیانی وت:

خەڵکینە! پێشەوا و خەلیفەکەتان مەکوژن، بە کوشتنی ئەو شمشێری خوا لەسەر خۆتان هەڵمەکێشن، بەخوا ئەگەر شمشێری خوا لەسەر خۆتان هەڵکێشن، دوای ئەوە ناکرێ بە کێلاندا!

هاوار بۆتان! ئەمرۆ دەسەڵاتتان بە قامچی و دارە، ئەگەر ئەو بکوژن، ئەوە دەسەڵاتتان تەنها بە شمشێر ڕەفتار دەکات!

هاوار بۆتان! لە ڕاستیدا ئەمرۆ مەدینە بە فریشتەی خوا دەورەدراوە و ئێشکی لەسەر دەگرن، سوێند بەخوا ئەگەر بیکوژن، ئەو فریشتانەش واز

لە مەدینە دێنن!

سەبەئیەکان لە قسەکانی (عبداللەی کوڕی سەلام) توڕەبون و دەستیان کرد بە جنێوپێدانی و پێیان وت: ئەی کوڕی جولەکە، تۆ چیت داوە لەمە، چی لەم کارە دەزانی؟[1]

ئەم قسەیەی (عبداللەی کوڕی سەلام) لە ترۆپکی جوانی و بەنرخیدایە، وەك قسەکەی (حەنظەلەی کوڕی رەبیع)ی نووسەر، کە لەپێشەوە هێنامان، ئەوەی لەو کاتەی خوێنی (عوسمان)یان ڕژاندﷺ، ئەوەی (ئیبن سەلام) ئاگاداری پێدان هاتەدی!

بۆچی بڕیاری پەلەکردن لە کوشتنی عوسمانیان دا؟

لەڕێ دەرچوە سەبەئیەکان زانیان نزیکە سوپا ئیسلامیەکانی ولاتانی تر بگەنە مەدینە، هەر بۆیە لە خۆیان ترسان چارەسەری گرفتەکەشیان تەنها لە کوشتنی (عوسمان)دا بینیەوە.

وتیان: تەنها کوشتنی ئەم پیاوە لەوەی تێی کەوتوین رزگارمان دەکا، ئەگەر کوشتمان خەڵکی ئاگایان لێمان نامێنێ و بە کوشتنی ئەوەوە سەرقاڵ دەبن!

بەم شێوەیە شەیتانە سەبەئیەکان لە ڕۆژانی دوایی گەمارۆکەدا بڕیاری کوشتنی (عوسمان)یان داﷺ.

موغیرەی کوڕی ئەخنەس، یەکەم حاجیە بەرگری لە عوسمان بکات

(موغیرەی کوڕی ئەخنەسی کوڕی شورەیق) کە بە پەلە لە جێبەجێکردنی حەج گەڕابویەوە، چوە ژوورەوە بۆ ماڵی عوسمان و چوە پاڵ ئەو کوڕانەی هاوەڵان کە بەرگریان لە عوسمان دەکرد.

(موغیرەی کوڕی ئەخنەس) لە ناوەوە لەبەر دەرگای ماڵەکەی (عوسمان)دا وەستا و پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! بیانومان چیە لای خوا ئەگەر تۆ بەجێ بهێڵین! پێویستە لەدژیان بجەنگین تا دەمرین.[2]

(عوسمان)ﷺ لە ڕۆژانی دوایی گەمارۆکەدا دەستی کردبوو بە نوێژ و خوێندنی قورئان، ئەوەندەی خوا حەزی کرد نوێژی دەکرد، ئەگەر ماندوو

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٩١.

٢ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٣٨.

بوایە دادەنیشت و دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن، بەم شێوەیە لە نێوان نوێژ و قورئان خوێندندا بوو.

سەبەئیەکان ئاگر لە ماڵی عوسمان بەردەدەن

سەبەئیەکان بڕیاریان دا یەکەم هێرش بکەنە سەر خانوەکە، ئاگریان هێنا، ئاگریان لە دەرگا و سەقفەکەی بەردا، پیاوەکانی ژورەوە دەستیان کرد بە کوژاندنەوەی ئاگرەکە، (عوسمان)ﷺ هەر خەریکی نوێژکردنی خۆی بوو.

دەرگا و سەقفەکە سوتان و دارەکان کەوتنە سەر زەوی.

یەکەم جەنگ لەبەر دەرگای ماڵی عوسمان

کۆمەڵێك پیاوی بەرگریکەر لەناوەوە بۆیان ڕاپەڕین و لەگەڵیان کەوتنە جەنگەوە، لەوانە: (موغیرەی کوڕی ئەخنەس) و (حەسەنی کوڕی عەلی) و (موحەممەدی کوڕی طەڵحە) و (سەعیدی کوڕی عاص) و (مەروانی کوڕی حەکەم) و (عبدالله‌ی کوڕی زوبەیر) و (زیادی کوڕی نوعەیمی فەهری) و (نیاری کوڕی عبدالله‌ی ئەسلەمی) و (ئەبوهورەیرە)ﷺ.

(ئەبوهورەیرە)ﷺ لەکاتی جەنگان لەگەڵ لەڕێدەرچووەکاندا دەیوت: من سەرمەشق و پێشڕەوتانم لە جەنگ کردن لە دژیاندا، ئەمە ڕۆژێکە لێدان تێیدا خۆشە و، جەنگ تێیدا حەڵاڵە.

لەگەڵ لەڕێدەرچووەکان دەجەنگا و پێی دەوتن: ﴿وَيَاقَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ: ئەی هۆزەکەم، ئەوە چیە من بۆ ڕزگاری و سەرفرازی بانگهێشتان دەکەم، ئێوەش بۆ ئاگر بانگم دەکەن.﴾.

عوسمان نوێژی دەکرد و قورئانیدەخوێند.

هەموو ئەمانە ڕوویدا (عوسمان)ﷺ نوێژی دەکرد و سورەتی (طە)ی لە نوێژەکەیدا دەخوێند، ئەوەی ڕوویدا نەیشڵەژان و قورئانەکەی پێ تێك نەدا و نوێژەکەی نەبڕی، کاتێك سورەتی (طە)ی تەواوکرد ڕکوعی برد و نوێژی تەواو کرد، پاشان دانیشت لە قورئانەکە سورەتی (آل عمران)ی دەخوێند.[1]

دوو شەهید لەبەر دەرگای عوسمان

یەکەم شەهیدێکی بەردەرگای ماڵی عوسمان، (موغیرەی کوڕی ئەخنەس) بوو، کە پیاوێکی (لەیثی) لە (بەنی لەیث) کوشتی، کاتێك

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٨٨-٣٨٩.

کوشتی پەشیمان بویەوەو وتی: إنا لله وإنا اليه راجعون..

(عبدالرحمنی کوڕی عەدیس) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی لەڕێدەرچووەکان، بەکابرای (لەیثی) وت: ها چیتە؟

وتی: لە خەوندا پێم وترا: مژدەی ئاگر بدە بە بکوژی (موغیرەی کوڕی ئەخنەس)! کەچی من تووشی کوشتنەکەی بووم!!

عوسمان فەرمان بە بەرگریکەرەکان دەدات کە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان

پیاوێکی (کەنانی)ش (نیاری کوڕی عبداللەی ئەسلەمی) کوشت، (ئەسلەمی)ش بوویە دووەم شەهیدی بەردەرگای ماڵی (عوسمان)، کاتێك (عوسمان)ﷺ لاشەی هەردوو شەهیدەکەی لەبەردەم دەرگای ماڵەکەیدا بینی، ئازار و خەفەتی خوارد، سوێندی خوارد دەبێ ئەو پیاوانەی بەرگری لێدەکەن لە جەنگ بوەستن و شمشێرەکانیان بکەن بە کێلانا! فەرمانی پێکردن لە خانوەکە دەرچن، هەموویان ماڵەکەیان جێهێشت و گەڕانەوە ماڵەکانیان.

بەم شێوەیە و بە فەرمانی (عوسمان)ﷺ پێکدادانی یەکەمی نێوان موسڵمانە چاکەخواز و لەڕێدەرچوە سەبەئیەکان کۆتایی پێهات!!

دواهەمین کەسێك کە ماڵەکەی بەجێهێلا (عبداللەی کوڕی زوبەیر بوو)ﷺ، ئەوەبوو (عوسمان)ﷺ ڕاسپاردەکەی خۆی پیا نارد، تا تەسلیمی (زوبەیری کوڕی عەوام)ی باوکی بکات،ﷺ.[1]

(عوسمان)ﷺ تەنها خۆی لە ماڵدا مایەوە، لەگەڵ هەندێ لە خێزان و خزمەتکارەکانی، سێ هەزار لەڕێدەرچووی سەبەئیش گەمارۆی ماڵەکەیان داوە!!

دوارۆژی ژیانی عوسمان: هەینی ١٨/١٢/٣٥ك

لە دواییدا ڕۆژ هەینی (١٨)ی (ذي الحجة)ی ساڵی (٣٥)ی کۆچی هات، بەمەش چل ڕۆژی تەواو بەسەر گەمارۆی (عوسمان)دا تێپەڕیبوو.

هەر لەو ڕۆژەشدا (عوسمان)یان کوشتﷺ، ڕۆژی هەینی (عوسمان) بەڕۆژوو بوو، دڵنیابوو لەوەی ئەجەلی نزیك بوەتەوە، ئەو خەڵکە دەیکوژن، دەستیکرد بە خوێندنی قورئان، تا بە بەڕۆژویی و قورئان خوێندنەوە بە

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٨٩-٣٩٠.

**دیداری خوای خۆی شاد بێت!**

عوسمان لەگەڵ ڕاسپێردراوی یەکەم بەکوشتنی گفتوگۆ دەکات و قەناعەتی پێ دەکات

**سەبەئیەکان هاتنە ژوورەوە و دەستیان کرد بە تێکدانی ناوماڵەکە.**

**یەکێك لە سەبەئیەکان ڕووەو (عوسمان ﷺ) هات بۆ ئەوەی بیکوژێ و پێی وت: خۆت لە خەلافەت لەکار خە، پاشان لێت دەگەڕێین و وازت لێ دێنین!**

**(عوسمان ﷺ) پێی وت: ئەی بێبەلا بی! بەخوا نە لە ئیسلام و نە لە نەفامیشدا هیچ ئافرەتێکم ڕووت نەکردوەتەوە، نە گۆرانیم وتوە، نە ئاواتم خواستوە، سوێند بەخوا لەوەتەی دەستی ڕاستم خستوەتە نێو دەستی پێغەمبەری خواوە ﷺ و بەیعەتم پێداوە، لەسەر عەورەتم دانەناوە.**

**کراسێك داناکەنم خوا کردبێتیە بەرم، من هەر لەم جێگایەدا دەبم، تا خوا بەختیاران ڕێزدار دەکا و خراپەکاران سوك و ڕیسوا دەکا!**

**پیاوەکە دەستی لە عوسمان ﷺ هەڵگرت و چووە دەرەوە بۆ لای لەڕێدەرچووەکان، پێیان وت: ها چیت کرد؟ بۆچی نەتکوشت؟**

**پێی وتن: بەخوا کەوتینە گرفتێکەوە چارەسەری نیە، بەخوا تەنها بە کوشتنی لە دەست خەڵك ڕزگارمان دەبێ، سوێند بەخوا بۆمان حەڵاڵ نیە بیکوژین! نازانم چی بکەین!**

عوسمان قەناعەت بە ڕاسپێردراوی دوەمیش دەکات کە دەست لە کوشتنی هەڵگرێت

**سەبەئیەکان پیاوێکی تریان نارد تا بیکوژێ.**

**(عوسمان) ﷺ پێی وت: تۆ لە کامە هۆزی؟**

**وتی: (لەیثی)م.**

**(عوسمان) ﷺ پێی وت: دەرچۆ، تۆ ئەو کەسە نیت کە من دەکوژی!**

**پێی وت: چۆن؟!**

**وتی: تۆ ئەوە نەبویت پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی فلان و فلاندا بۆت پاڕایەوە، کە تۆ لەگەڵ چەند هاوەڵێکتدا بوی؟**

**وتی: بەڵێ.**

**(عوسمان) ﷺ وتی: بڕۆ براکەم، پاڕانەوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەفیڕۆ مەدە!!**

پیاوەکە بیریکەوتەوەو پەشیمان بوویەوە لەوەی کردی و لەماڵەکە چووە دەرەوەو لە سەبەئیەکان دوور کەوتەوە.

قەناعەت بە ڕاسپێردراوی سێیەمیش دەکا

پیاوێکی قوڕەیشیان خستە ژورەوە تا بیکوژێ!

پێی وت: (عوسمان)! من دەتکوژم.

(عوسمان)ﷺ وتی: نەخێر، فلان! تۆ نامکوژی!

وتی: بۆچی؟

(عوسمان)ﷺ وتی: لە ڕۆژی فلان و فلاندا پێغەمبەری خواﷺ داوای لێخۆشبونی بۆکردی، بۆیە خوێن بەناهەق ناڕێژی!

پیاوەکە بیری کەوتەوەو پەشیمان بویەوە لەوەی کردی و، داوای لێخۆشبونی لەخوا کرد و ماڵەکەی بەجێ هێلا و لەوانیش جیابویەوە!

دواکەسێك کە چووە سەری، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) بوو، ڕیشی گرت و ڕایکێشا.

قەناعەت بە ڕاسپێردراوی چوارەمیش دەهێنێ کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بوو

(عوسمان)ﷺ پێی وت: ڕیشم بەردە، ڕەفتارێکت ئەنجام دا و پێگەیەکت بەرامبەرم گرت، ئەبوبەکری باوکتﷺ شتی وای نەدەکرد، کوڕی برام، هاوار بۆ تۆ، لەسەر خوا توڕەبویت؟ چیم لێکردووی؟ تاوانێکت ئەنجام دا و حوکمی خوام بەسەرتا جێبەجێکرد!

(موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) پەشیمان بویەوەو لەلای (عوسمان)ﷺ هەستا و بە پەشیمانی لە ماڵەکەی چووە دەرەوە.[١]

سەرکردە لەڕێدەرچوەکان سەریان سوڕما لە پاشگەزبونەوەی ئەو خەڵکە لە کوشتنی (عوسمان)ﷺ، ئەوەتانێ چوارکەسیان ڕاسپارد بۆ کوشتنی، (عوسمان)ﷺ لەگەڵیان دەدوێ و قەناعەتیان پێ دەکا، پاشگەزدەبن و وازی لێدێنن و بە پەشیمانیەوە واز لەمانیش دێنن!

چوونە ژوورەوەی سێ لە سەرکردە سەبەئیەکان بۆ کوشتنی

ئا لەم کاتەدا سێ لە سەرکردە سەبەئیەکان و شەیتانەکانیان بڕیاریان دا هەموو پێکەوە بچنە سەری و پێکەوە بیکوژن.

---

١ ـ تەماشای گفتوگۆی (عوسمان) لەگەڵ ئەو چوار کەسەدا بکە لە (تأريخ الطبري ٤: ٣٩٠-٣٩١).

کاتیش دوای عەصری ڕۆژی هەینی بوو، (عوسمان)ﷺ بەڕۆژووە و دانیشتووەو قورئانەکەی لەپێشدایەو لێی دەخوێنێ.

هەریەکە لە (غافقی کوڕی حەربی عەکی)ی ئەمیری لەڕێدەرچوەکان و (سودانی کوڕی حەمرانی سوکونی) و (قەتیرەی کوڕی فولانی سوکونی) هاتنە ژوورەوە بۆ سەری.

غافقی لە عوسمان دەدا و شەق لە قورئانەکە هەڵدەدا

(غافقی) بە ئاسنێك کە پێی بوو کێشای بەسەری (عوسمان)دا و شەقێکیشی لە قورئانەکەی بەردەستی دا!! قورئانەکە سوڕێکی خوارد و لەبەردەمی (عوسمان)دا جێگیر بوو. بەهۆی لێدانەکەی (غافقی کوڕی حەرب) خوێن بە دەموچاوی (عوسمان)دا هاتەخوارﷺ، چەند دڵۆپێك کەوتە سەر فەرمودەی خوا ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ: خوات بەسە، چونکە ئەو خوایە بیسەر و زانایە.﴾البقرة/١٣٧.

سودانی کوڕی حەمران پەنجەکانی دەستی خێزانەکەی عوسمان دەقرتێنێ و پاشان عوسمانیش دەکوژێ

(سودانی کوڕی حەمرانی سکونی) هات و بە شمشێرەکەی بەربوە (عوسمان)ﷺ، خێزانەکەی کە (نائلەی کچی فەرافیصە) بوو، بەرگری لێکرد و دەستی دایە بەر شمشێرەکەی، سودان بە شمشێرەکەی لێیدا و پەنجەکانی قرتاند، جا ڕۆشت و خوێن لە پەنجە بڕاوەکانی دەچۆڕا.

(سودان) بەچاو تەشەری لێدەدا و سەیری پشتەوەی دەکرد و دەیوت: پاشکۆیەکی گەورەی هەیە!!

(سودانی کوڕی حەمران) چەند جارێك بە شمشێرەکەی دای لە (عوسمان)ﷺ و کوشتی.

نەجیح، سودان دەکوژێ

یەکێك لە غولامەکانی (عوسمان)ﷺ کە بە (نەجیح) ناودەبرا، کاتێك ئەمەی بینی، کوشتنی (عوسمان)ی زۆر لا ناخۆش بوو، بەشمشێرەکەی هێرشی کردە سەر (سودانی کوڕی حەمران) و کوشتی!!

کاتێك (قەتیرەی کوڕی فولانی سکونی) بینی (نەجیح) (سودان)ی کوشت، هێرشی کردە سەر (نەجیح) و کوشتی.

غولامێکی تری (عوسمان)ﷺ کە ناوی (صەبیح) بوو، هێرشی کردە سەر (قەتیرەی کوڕی فولان) و کوشتی.

چوار کوژراو لە ماڵەکەدا: دوو شەهید و دوو تاوانبار

**لە ماڵەکەدا چوار کوژراو هەبون" دوو شەهید و دوو تاوانبار.**

**دوو شەهیدەکە (عوسمان) و (نەجیح)ی غولامی بوو.**

**بەڵام دوو سەبەئیە تاونبارەکە (سودان) و (قەتیرە) بون.**

**کاتێك کوشتنی (عوسمان)ﷺ کۆتایی پێهات، -کە لە پێش خۆرئاوابونی ڕۆژی هەینی بوو-، فیتنەگەرێکی سەبەئیەکان هاواری کرد و وتی: خوێنی ئەم پیاوەمان بۆ حەڵاڵ نەبوە، تا ماڵەکەیمان لەسەر حەرام بێت! ئاگادار بن ماڵەکەشی حەڵاڵە بۆمان، ئەوەی لە ماڵەکەیدایە تاڵانی بکەن!**

**هەرچی و پەرچیە سەبەئیەکان دەستیان کرد بە خراپەکاری و تێکدانی، تەنانەت ئەوەی بە ئافرەتیشەوە بوو تاڵانیان کرد!**

دوو کوژراو لەسەر ماڵەکە: شەهیدێك و تاوانبارێك

**یەك لە سەبەئیەکان کە بە (کەلثومی تەجیبی) ناودەبرا، هێرشی کردە سەر (نائلە)ی خێزانی (عوسمان)ﷺ و عەبایەکی لەسەر بوو بەتاڵان بردی و پاشان تەماشایەکی پاشەوەی کرد و پێی وت: ماڵی دایکت وێران بێ، پاشکۆیەکی چەند تەواوت هەیە!**

**(صەبیح)ی غولامی (عوسمان) دیتی و گوێی لێبوو ئەو قسە ناشرینانەی بە (نائیلە) دەوت، شمشێرەکەی لێبەرزکردەوەو کوشتی، یەك لە سەبەئیەکانیش هێرشی کردە سەر غولامەکە و کوشتی.**

سەرەنجام شەش کوژراو بوو: سێ بە سێ

**بەم شێوەیە ماڵی (عوسمان)ﷺ لەسەر شەش کوژراو داخرا، سێیان شەهید بون کە (عوسمان) و هەردوو غولامەکەی (نەجیح) و (صەبیح) بون.**

**سێ تاوانبارەکەش: (سودان و قەتیرە و کەلثومی تەجیبی) بون.**

**پێشتریش سێکەس بۆ بەرگری کردن لە (عوسمان)ﷺ شەهید بون، کە ئەوانیش: (موغیرەی کوڕی ئەخنەس) و (زیادی کوڕی نوعەیمی فەهری) و نیاری کوڕی عبداللەی ئەسلەمی) بوو.**

سەبەئیەکان بەیتولمال تاڵان دەکەن

**پاش ئەوەی هەرچیوپەرچیە سەبەئیەکان ماڵی (عوسمان)یان تاڵان کرد، بانگیان کرد و وتیان: بگەن بە (بەیتولمال)، نەهێڵن کەس پێشتان کەوێ، ئەوەی تێیدایە بیبەن!**

**ئێشکگرانی (بەیتولمال) گوێبیستی دەنگ و هەرایان بون، تەنها دوو**

تورەکە خواردنیشی تێدابوو، وتیان: خۆتان ڕزگارکەن، چونکە ئەم خەڵکە دنیاخۆرن!

تەمەنی عوسمان و ماوەی خەلیفایەتی و کاتی شەهیدبونی

سەبەئیەکان پەلاماری (بەیتولمال)یان دا و ئەوەی تێیدا بوو تالانیان کرد![1]

شەهیدبونی (عوسمان)ﷺ لەپێش خۆرئاوابونی ڕۆژی هەینی (١٨)ی مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی (٣٥) بوو.

ئەمەش دوای ئەوەی لەڕێدەرچووە سەبەئیەکانی میصر و کوفە و بەصرە چل ڕۆژ گەمارۆیان دا، لە (٨)ی مانگی (ذي القعدة)تا (١٨)ی مانگی (ذي الحجة).

خەلافەتەکەشی دوانزە ساڵ دوانزە ڕۆژی کەم بوو، چونکە بەیعەتی خەلافەتی لە سەرەتای مانگی (موحەڕەم)ی ساڵی (٢٤)دا بوو.

تەمەنیشی لە کاتی شەهیدبونیدا لە دەوروبەری (٨٣) ساڵیدا بوو.[2]

دوای کوشتنی عوسمان، هەرچیو پەرچیەکانی شوێنکەوتەی سەبەئیەکان کارەکەیان بەسەردا دەشکێتەوە

لەڕێ دەرچووە سەبەئیەکان مەبەستەکانی خۆیان هێنایە دی، ئەمیری بڕوادارانیان کوشت، زۆرێك لە شوێنکەوتەکانیان لە هەرچی و پەرچی و ئاژاوەچیەکان دوای کوشتنی (عوسمان)ﷺ هەڵوەستەیان کرد و بیریان کردەوە، چونکە وایان گومان نەدەبرد کە سەرەنجام دەستیان دەچێتە کوشتنی.

شەیتانە سەبەئیەکانیان بێئاگایان کردبون و بۆ ئاژاوەگێڕی لەسەر (عوسمان)ﷺ بەکاریان هێنان، بەڵام بۆ ئەوەی بیکوژن ئەوە شتێك بوو بە ناشایستەو کارێکی زۆر ناشیرینیان دەزانی.

کارەکە کەوتە دەست ئەو ئاژاوەگێڕانە و، ئەوەیان بەسەرهات کە بەسەر (بەنی ئیسرائیل)دا هات، کاتێك کە گوێرەکەیان پەرست، هەندێکیان پەشیمان بونەوە، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلاً جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لاَ يُكَلِّمُهُمْ وَلاَ يَهْدِيهِمْ سَبِيلاً اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ(١٤٨)وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٩١-٣٩٢.

٢ ـ تەماشای (البداية والنهاية)ی (ابن كثير) ٧: ١٩٠ بکە.

﴿أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا قَالُوا لَئِنْ لَمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾: لەپاش موسا، هۆزەکەی ئەو پەیکەری گوێرەکەیان . لەخشڵ و زینەی خۆیان . دروست کرد کە هەر دەیبۆڕاند! ئەدی نەیاندی ئەو گوێرەکە قسەیان لەگەڵ ناکا و ڕێگایان پێ نیشان دانا؟ بەڵێ کەوتنە . پەرستنی و- ستەمکاربون، کاتێ تەواو پەژیوانی دایگرتن و دیتیان سەریان لێشێواوە، گوتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بەر بەزەیی خۆیمان نەخا و لە گوناهانمان نەبورێ، ئێمە لە زیانبارانین.﴾الأعراف/١٤٨-١٤٩.

پیاوچاکانی خەڵکی مەدینە خەمباری کوشتنی خەلیفەکەیان بون، چونکە بەهۆی کەمی ژمارەیان لەبەرامبەر سەبەئیەکان نەیانتوانی سەریخەن و پشتگیری بکەن، لەبەر ئەوەی (عوسمان)ﷺ فەرمانی پێکردبون دەست بکێشنەوەو جەنگ نەکەن، دەستیان کرد بە وتنی (إنّا لله وإنّا إليه راجعون) و گریان، بەلام چی بکەن؟ لە کاتێکدا سوپای ئەو لەرێدەرچووە سەبەئیانە مەدینەی داگیرکردوەو خراپەکاری تێدا دەکا و رێگری خەڵکەکەی دەکا لە هەموو شتێ؟

ئەمیری بەفیعلی مەدینە غافقی کوڕی حەربی عەککی بوو

فەرمانڕەوای مەدینە ئەمیری لەرێدەرچووەکانی میصر(غافقی کوڕی حەربی عەککی) بوو.

شەیتانە نەخشەکێشەکە (عبداللەی کوڕی وەهەبی سەبەء)یشیان لەگەڵ بوو، شاد و دڵخۆش بوو بەهۆی گەیشتنی بە هیواو ئاوات و ئامانجە جولەکەییە شەیتانیەکانی!

گەورە هاوەڵان هەریەکەیان لەسەر کوشتنی (عوسمان)ﷺ قسەی خۆیان کرد.

زوبەیر و طەلحە و عەلی جنێو بە بکوژانی عوسمان دەدەن

کاتێك (زوبەیری کوڕی عەوام)ﷺ بەوەی زانی وتی: رەحمەتی خوا لە (عوسمان)، إنّا لله وإنّا إليه راجعون.

پێیان وت: ئەوانەی کوشتیان پەشیمان بونەتەوە!

وتی: تەدبیریان کرد، تەدبیریان کرد، بەلام بەوشێویەیان لێهات کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ: ئەوانە دوور دەخرێنەوە لەوەی

وا ئارەزووی دەکەن.﴾سبأ/٥٤.

کاتێ (طلحەﷺ) بەوەی زانی وتی: ڕەحمەتی خوا لە (عوسمان)، إنّا لله وإنّا إليه راجعون.

وتیان: پەشیمان بونەتەوە.

وتی: دەك لەناوچن! جا ئەم فەرمودەیەی خوای خوێند:

﴿مَا يَنظُرُونَ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ(٤٩)فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلاَ إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ: ئەوانە هەر چاوەنۆڕی یەك نەعرەتەن کە لە کاتێکدا خەریکی هەرا و کێشەی ناوخۆیانن، دەیانگرێ، ناتوانن وەسیەتیش بکەن، ڕێشیان نابێ بچنەوە ناو کەس وکاریان.﴾یس/٤٠-٥٠.

کاتێکیش عەلیﷺ بەوەی زانی وتی: ڕەحمەتی خوا لە (عوسمان)، إنّا لله وإنّا إليه راجعون.

وتیان: پەشیمان بونەتەوە.

ئەویش ئەم ئایەتەی خوێند:

﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ(١٦)فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا: وەکو شەیتان، کاتێ بە بنیادەمی گوت: خوا مەناسە، وەختێ لە خودا تەکیەوە، گوتی: لێم نزیك مەبەوە، من لەو خودایە دەترسم کە پەروەردگاری گشت دنیایە.. سەرەنجامی هەردووکیان هەر ئەوەیە کە تاهەتایە لە ئاگردا دەمێننەوە﴾الحشر/١٦-١٧.

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص دوعا لە بکوژانی عوسمان دەکات

کاتێکیش (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)ﷺ بەوەی زانی وتی: ڕەحمەتی خوا لە عوسمان. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً(١٠٣)الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا(١٠٤)أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ: بلێ: ئاخۆ دەتانەوێ پێتان بلێم، کێن ئەوانەی لە کردەوەکانی خۆیان زۆرتر زیانیان پێدەگا؟ ئەو کەسانەی تەقالایان لەژیانی سەر دنیایەدا بەفیڕۆ چووەو لاشیان وایە کارێکی چاکیان

**كـردووه.. ئەوانـە كەسـگەلێكن كـە لـە نیـشانان و دیـداری پـەروەردگاریان حاشایان كرد، ئیتر هەركارێكی كردیان پوچەڵە.**﴾الكهف/١٠٣-١٠٦.

**پاشـان وتـی: خوایـەگیان، پەشـیمان و سـوك و ریـسوایان كـەی، پاشـان بیانگرە.**

**خوای گەورەش پاڕانەوەكەی (سەعد)ی قبوڵ كرد-سـەعد دوعـای قبـوڵ دەبوو-، ئەوەبوو هـەموو ئەوانـەی بەشـداری كوشـتنی (عوسمـان)یـان كـرد، خودا گرتنی و بە كوشت چوون، وەك (عبداللەی كوڕی سەبەء) و (غافقی) و (ئەشتەر) و ( حەكیمی كوڕی جەبەلە) و (كەنانەی تەجیبی).**[1]

هەموویان بە كوشتن مردن

**هیچ كەس لەوانەی بەشداری كوشتنی (عوسمان)یان كرد بـە مردنـی ئاسایی نەمردن، بەڵكو كوژران!!**

**(موسـتەنیری كـوڕی یەزیـد) لـە براكەیـەوە (قەیـسی كـوڕی یەزیـد) دەگێڕێتەوە كە وتویەتی: بەخوا نـەمزانیوە و نەمبیستووە كەسێك غـەزوی (عوسمـان)ی كردبـێ یـا سـواربوبێ بـۆ ئـەو مەبەسـتە و لـە كـوژران رزگـاری بووبێت.**

**پاشـان (قەیـسی كـوڕی یەزیـد) باسـی كۆبونـەوەی خـەڵكێك دەكـا لـە لەڕێدەرچـووەكانی كوفـە كـە لەسـەر عوسمـان دەرچـوون كـە تیایـدا (ئەشتەری نەخەعی) و (كومـەیلی كـوڕی زیـاد) و (عومـەیری كـوڕی ضـابئ) هەبوو.**

**كەوا چۆن هەموویان كوژران جگە لە (عومەر) و (كومەیل).**

حەجاج دوا دوكەسیان دەكوژێت

**پـاش زیـاتر لـە چـل سـاڵ لـە كوشـتنی (عوسمـان)، ئـەمارەتی (حەجاجی كوڕی یوسفی ثەقەفی) لە عێراق بەرپا بوو.**

**(حـەجاج) پاشـی ئـەو هـەموو سـاڵە، بـەهۆی دەرچـوونیان لەسـەر (عوسمان) هەستا بە كوشتنیان.**[2]

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٩٢، والبداية والنهاية ٧: ١٨٩.

٢ ـ تەماشای بەسەرهاتی كوشتنیان لەلایەن حەجاجەوە لە (تـأريخ الطـبري ٤: ٤٠٣-٤٠٤) بكە.

وتمان (عوسمان رضي الله عنه) کەمێك لەپێش خۆر ئاوابونی ڕۆژی هەینی (١٨)ی مانگی (ذي الحجة)دا کوژرا.

کاتێك تاریك داهات، (نائلەی کچی فەرافیصە)ی خێزانی (عوسمان رضي الله عنه) هات بۆ لای (عبدالرحمنی کوڕی عودەیسی بەلەوی) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی لەڕێدەرچووەکان بوو، داوای لێکرد لاشەی شەش کوژراوەکە لە ماڵەکەی دەرکا، ئەویش جنێوی پێدا و قەدەغەی کرد!

دەرهێنانی لاشەی عوسمان لە تاریکی شەودا

لە نیوەشەودا (مەروانی کوڕی حەکەم) هات بۆ ماڵی (عوسمان) رضي الله عنه و وتی: ئەگەر تا بەیانی لەعوسمان گەڕێن، ئەوا ئەو خەڵکە لاشەکەی دەشێوێنن.

کۆمەڵێ هاوەڵ کۆوە بون، کە تیایاندا (عەلی) و (طەڵحە) و (کەعبی کوڕی مالیك) و (زەیدی کوڕی ثابیت) و (حەکیمی کوڕی حەزام) و (جوبەیری کوڕی موطعیم) و (زوبەیری کوڕی عەوام) هەبوو رضي الله عنهم.

نوێژ لەسەر کردنی و سپاردنی لە گۆڕستانی بەقیعدا

لاشەکەی (عوسمان)یان دەرکرد، شۆردیان و کفنیان کرد، پاشان (مەروانی کوڕی حەکەم) نوێژی لەسەر جەنازەکەی کرد، پاشان گۆڕەکەیان لە (حەوشی کەوکەب)دا بۆ هەڵکەند، کە بێستانێك بوو پێیان دەوت (بێستانی کەوکەب)، لە تەنیشت (بەقیعی غەرقەد)ەوە بوو، عوسمان رضي الله عنه کڕیبوی و کردبووی بە گۆڕستان و کردبویە زیادەیەك بۆ (بەقیع)، یەکەم کەسیش کە تیایدا سپاردە کرا خۆی بوو رضي الله عنه.

لە بەیانیشدا لاشەی غولامەکانی (عوسمان)" (نەجیح) و (صەبیح)یان هەڵگرت و نوێژیان لەسەرکردن، پاشان لە (حەوشی کەوکەب)دا لە تەنیشت گۆڕەکەی (عوسمان)ەوە ئەسپەردەیان کردن.

بەڵام سێ کوژراوە سەبەئیەکە" (سودان) و (قەتیرە) و (کەلثوم)، بەپێ ڕایان کێشان و فڕێیان دایە بێستانەکانی مەدینەوەو سەگ خواردنی!![1]

دوای کوژران و سپاردەکردنی (عوسمان)، (مەروانی کوڕی حەکەم) لەگەڵ هەندێ لە بەنی ئومەییە لە مەدینە دەرچون بۆ مەککە، لە ترسی

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٤١٤–٤١٥.

چنگی لەڕێ دەرچووە سەبەئیەکان، لە ڕێگەدا گەیشتن بە دایکی بڕواداران (عائشە)ﷺ، کە لە مەککەوە بۆ مەدینە دەگەڕایەوە، پاش جێبەجێکردنی مەناسیکی حەج، هەواڵی کوژرانی (عوسمان)ی پێ ڕاگەیاندﷺ، ئەویش ڕەحمەتی بۆ نارد و دوعای لە بکوژانی کرد و نەفرینی لێکردن، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە.

دەرچوونی هەندێك لە بەنی ئومەییە بەرەو مەککە

هەندێ لە بەنی ئومەییە لە مەدینە دەرچون و بەرەو شام چوون، لە (وادی القری)دا گەیشتن بە سوپای شام بە سەرکردایەتی (حەبیبی کوڕی مەسلەمە) کە بۆ پشتگیری (عوسمان)ﷺ هاتبون، ئەوانیش هەواڵی کوژرانی (عوسمان)یان پێ ڕاگەیاندن، (حەبیب)یش بە سوپاکەیەوە گەڕایەوە شام و نەچووە مەدینە.

سوپای کوفەش بە سەرکردایەتی (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) کە بۆ پشتگیری (عوسمان)ﷺ دەرچووبون بە کوژرانی (عوسمان)یان زانی و هەر لە ڕێگەوە گەڕانەوە!

چەند قسەیەك دەربارەی کوژرانی عوسمان

لێرەوە چەند قسەیەك دەهێنین سەبارەت بە کوژرانی (عوسمان)ﷺ کە پێغەمبەری خواﷺ و هەندێ لە هاوەڵان و تابعین گوتویانە:

١- (نەسائی) لە (ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی)یەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: بۆ حەج دەرچوین، چوینە مەدینە و دەمانویست حەج بکەین [ئەمەش لە فیتنەکەی عوسماندا بووﷺ]، کاتێك لە ماڵەکانمان بوین و بارو بنەمان دادەنا، یەکێك هات، وتی: خەڵکی لە مزگەوتدا کۆبونەتەوەو ترساویشن، ئێمەش ڕۆیشتین، بینیمان خەڵکی لەمزگەوتدا کۆبونەتەوەو (عەلی) و (زوبەیر) و (طەڵحە) و (سەعدی کوڕی ئەبووەقاص)یشیان لەگەڵدایەﷺ، هەروەها ئێمەش چووین، کاتێك (عوسمان)ﷺ هات بانپۆشێك(چەرچەف)ی زەردی لەبەردا بوو، سەریشی پێ داپۆشیبوو.

عوسمان، هاوەڵان بەشاهێد دەگرێ لە ستایشکردنی پێغەمبەر بۆی

(عوسمان)ﷺ وتی: (عەلی) لێرەیە؟ (طەڵحە) لێرەیە؟ (زوبەیر) لێرەیە؟ (سەعد) لێرەیە؟

وتیان: بەڵێ.

سێ لە دیاردەکانی ماڵ بەخشینی عوسمان لە سەردەمی پێغەمبەر

(عوسمان)ﷺ وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك جگە لەو نیە، دەزانن پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: هەرکەسێ شوێنی بەستنەوەی حوشتری بەنی فولان بکڕێ خوا لێی خۆش دەبێت؟ منیش بە بیست هەزار-یا بیست و پێنج هەزار- کڕیم و چووم بۆ لای پێغەمبەرﷺ و هەواڵەکەم پێدا، فەرمووی: بیخەرە سەر مزگەوتەکەمان و پاداشتەکەی بۆ تۆیە؟

وتیان: ئەرێ بەخوا!

(عوسمان) وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك جگە لەو نیە، دەزانن پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: هەرکەسێ بیری (ڕۆمە) بکڕێ خوا لێی خۆش بووە؟

منیش بەوەندەو بەوەندە کڕیم، چومە لای پێغەمبەرﷺ و پێم وت: بەوەندەو بەوەندە کڕیومە.

فەرمووی: بیکە بیری موسڵمانان و پاداشتەکەی بۆ تۆیە؟

وتیان: ئەرێ بەخوا!

(عوسمان) وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخۆی نەبێت، ئەرێ ئێوە دەزانن پێغەمبەری خواﷺ سەیرێکی دەم و چاوی خەڵکی کرد و فەرمووی: هەرکەس پێداویستی جەنگی ئەوانە ئامادە بکات خوا لێی خۆش دەبێت؟-مەبەستی (سوپای تەنگی و ناخۆشی: جیش العسرة) بوو-، من ئامادەم کردن، تەنانەت وشتر و ڕەشمەیەکیشی کەم نەبوو؟

وتیان: ئەرێ بەخوا!

(عوسمان) وتی: پەروەردگارم شاهێد بە، پەروەردگارم شاهێد بە، پەروەردگارم شاهێد بە![1]

پێغەمبەر هەواڵی شەهیدبونی عوسمان و دوو ماوەڵەکەی دەدات

٢- (ترمذی) لە (ئەبو عبدالرحمنی سولەمی)یەوە دەگێڕێتەوە، وتویەتی: (کاتێك عوسمانﷺ گەمارۆ درا، چووە سەرەوەی خانوەکەی و

---

١ ـ رواه النسائي في كتاب الجهاد، باب فضل من جهز غازياً. أنظر جامع الأصول لأبن الأثير ٨: ٦٣٧-٦٣٨.

پێی وتن: لەبەر خوا بیرتان دەخەمەوە، ئایا دەزانن کاتێك (حیراء) هاتە هەژان، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: جێگیربە ئەی (حیراء)! هیچت لەسەر نیە بێجگە لە پێغەمبەرێك یان صدیقێك یان شەهیدێك؟

وتیان بەڵێ......)[١]

٣- (بوخاری) و (موسلیم) لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوەرضي الله عنه دەگێڕنەوە کە وتویەتی: شاخی ئوحود هاتە لەرزە، پێغەمبەرﷺ و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانی لەسەربووريضي الله عنهم، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (ئوحود ئارام بە! تەنها پێغەمبەرێك و صدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە).[٢]

پێغەمبەر هەواڵی تەنگژەکە بە عوسمان دەدات

٤- (بوخاری) و (موسلیم) لە (ئەبو موسای ئەشعەری)یەوە دەگێڕێتەوەرضي الله عنه، کە وتویەتی: من لە یەکێك لە بێستانەکانی مەدینەدا لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووم، پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردم دەرگاکەی بگرم.

پیاوێك هات داوای مۆڵەتی کرد، وتم: کێیە؟

وتی: ئەبوبەکر.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی پێبدە.

پاشان (عومەر) هات، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتی پێ بدە.

پاشان (عوسمان)رضي الله عنه هات، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی پێبدە لەسەر بەڵایەك کە توشی دێ!

(عوسمان)رضي الله عنه هاتە ژورەوەو دەیوت: خوایە ئارامیت، خوا پشتیوانە!![٣]

٥- (ترمذی) و (ئەحمەد) لە (عائشە)وەرضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: من لە خزمەت پێغەمبەردا بوومﷺ، فەرمووی: عائشە! ئەگەر یەکێکمان لابوایەو قسەی بۆ بکردینایە!

---

١ ـ رواه الترمذي في كتاب المناقب، باب مناقب عثمان. أنظر جامع الأصول ٧: ٤٠.

٢ ـ أخرجه البخاري في كتاب الفضائل. ومسلم في كتاب الفضائل.

٣ ـ أخرجه البخاري في كتاب الفضائل ومسلم في كتاب الفضائل.

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! نەنێرم بەدوای ئەبوبەکردا؟

بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: ئەگەر یەکێکمان لابوایەو قسەی بۆ بکردینایە!

وتم: ئایا نەنێرم بەدوای (عومەر)دا؟

بێدەنگ بوو، پاشان بەردەستێکی بانگ کردو بە نهێنی بە گوێیدا چپاندی و ڕۆیشت.

کاتێکم زانی (عوسمان)ﷺ داوای مۆڵەت دەکات.

پێغەمبەر فەرمان به عوسمان دەدات که له خەلیفایەتی تەنازول نەکات

مۆڵەتی دا و هاتە ژورەوە.

پێغەمبەری خواﷺ ماوەیەکی زۆر بە چرپە قسەی لەگەڵ کرد.

پاشان پێی فەرموو: (عوسمان)! خوای بەرز و بالاّ کراسێکت لەبەر دەکا–مەبەستی خەلافەت بوو–، ئەگەر دووڕووەکان ویستیان دایبکەنی، دایمەکەنە.. دووجار یا سێجار ئەمەی پێفەرموو.[1]

(نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) گێڕەرەوەی فەرمودەکە لە (عائشە)وە وتویەتی: دایکی بڕواداران! ئەی ئەو کاتە ئەم فەرمودەیە لەکوێ بوو؟

پێی وت: بەخوا لەبیرم چووبوو، بیرم نەکەوتەوە!

کاتێك (موعاویە) بەم فەرمودەیەی زانی، داوای لە (عائشە) کرد بۆی بنوسێ، منیش نوسیمەوەو ناردم بۆ شام.[2]

هەر ئەمەش بوو هۆی دەست لەکار نەکێشانەوەی عوسمان تا کوژرا

٦– (ترمذی) لە (ئەبو سەهل)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: گوێبیستی (عوسمانی کوڕی عەفان) بووم‌ﷺ کە لە ماڵەکەی خۆیدا بوو، دەیگوت: لە ڕاستیدا پێغەمبەری خواﷺ سپاردەیەکی پێداوم، منیش جێبەجێی دەکەم و ئینشاء الله خۆڕاگرم لەسەری.. ڕەحمەتی خوای لێبێ، خۆڕاگر بوو تا بەشەهیدی کوژرا.[3]

---

١ ـ أخرجه الترمذی في مناقب عثمان، وأحمد في المسند. أنظر صفة الصفوة ١: ٢٩٨-٢٩٩.

٢ ـ البداية والنهايةو لأبن كثير ٧: ٢٠٨.

٣ ـ رواه الترمذي في كتاب المناقب، باب مناقب عثمان.

پێغەمبەر هەواڵی کوژرانی عوسمان بە ستەملێکراوی دەدات

٧-(ترمذي) و (ئەحمەد) لە (عبداللهى كوڕی عومەر)ەوە دەگێڕێتەوە كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی فیتنەی کرد و فەرمووی: ئەم سەر و مل پێچراوە بە ستەملێکراوی دەکوژرێ.. ئیبن عومەر دەڵێ: سەیری سەر و مل پێچراوەکەم کرد، دیتم (عوسمان)ە.[1]

پێغەمبەر هەواڵ دەدات کە عوسمان لەسەر ڕێنمونیە

٨- (ترمذي) لە (ئەبو ئەشعەثی صەنعانی)یەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: دوای کوژرانی (عوسمان) رضي الله عنه چەند وتاربێژێك لە شامدا دەستیان دایە وتار، کە تیایاندا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو، دوا پیاوێکیان هەستا، پێی دەوترا (موڕەی کوڕی کەعب)، وتی: ئەگەر فەرمودەیەك نەبوایە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستبوو، هەڵنەدەستام.

پێغەمبەری خوا ﷺ باسی فیتنەی بۆ کردین و نزیکی کردەوە، پیاوێکی سەرومل پێچراو بەوێدا تێپەڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە لەو ڕۆژەدا لەسەر ڕێنوێنیە.. چووم بۆ لای، بینیم (عوسمانی کوڕی عەفان)ە رضي الله عنه، ڕوویم بۆ لای وەرگێڕا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! مەبەستت ئەمەیە؟ فەرمووی: بەڵێ!!![2]

عوسمان لە فیتنەکەدا ڕاستەقینەی کاروبارەکانی دەزانی

ئەم فەرمودە دروستانە ئەوەمان نیشان دەدات کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوە بە (عوسمان) رضي الله عنه سەبارەت بەوەی بەسەریدا دێ و، ئەو لەسەر ڕێنمونیە و داواشی لێ کردووە لەسەر بەلا خۆڕاگر بێ و لە خەلافەتیش تەنازول نەکا، چونکە بەشەهیدی دەمرێ.

(عوسمان) رضي الله عنه لە ڕۆژانی فیتنە و میحنەکەدا، دەیزانی چی بەسەر دێ و، فیتنە بەچی کۆتایی دێت، لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستبوو.

(عوسمان) رضي الله عنه دڵنیابوو کە لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان ئاژاوەچین و لەسەر ناهەقن، ناوەستن و بێدەنگ نابن و سەرەنجامیش لە کوشتنیدا سەردەکەون.

---

١ ـ رواه الترمذي في مناقب عثمان. وأحمد في مسند ابن عمر.

٢ ـ رواه الترمذي في مناقب عثمان.

ئەو ئەنجامەی پێی دەگەین

**لەوانەیە ئەمە ڕاڤەی نهێنی سوربونی (عوسمان)مانؓ بۆ بکات لەسەر دانەبەزین لە خەلافەت و، خەلافەت کراسێك بێ لەلایەن خواوە لەبەری کراوەو دروست نیە دایکەنێت، هەرچەندە دووڕووە سەبەئیەکان هەوڵی داکەنینی بدەن، چونکە لەسەر ناهەقن. ئەمەیە کە پێغەمبەری خواﷺ وەسیەتی بۆ کردووەو (عبداللەی کوڕی عومەر)یش ئاماژەی بۆ دەکات.**

**لەوانەیە هەر ئەمەش ڕاڤەکەری نهێنی ئەو سوربونەی (عوسمان)ؓ بێت لەسەر جەنگ نەکردن لە مەدینەدا و سەرچاوەی ئەو فەرمانە یەکلایی و زۆر سورەی (عوسمان)ؓ بێ بۆ هاوەڵان و کوڕەکانیان کە چەك فڕێ دەن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان!**

**خوا لە (عوسمان) ڕازی بێت و بە ڕەزامەندی خۆیشی شادی کا، چۆن خۆڕاگر و خواویست بوو و پشتی بەخوا بەست، تەسلیمی قەدەری خوا بوو، چاودێری و چاوەڕێی کوژران و شەهیدبونی بوو، پێی باش بوو خۆی قوربانی ئوممەتەکەی بێ، بەهۆی ئەوەوە خوێنێ نەڕژێ!!**

**٩- (بوخاری) و (ترمذی) لە (عوسمانی کوڕی عبداللەی کوڕی موەهەب)ەوە دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی خەڵکی میصر هات دەیویست حەج بکات، بینی کۆمەڵێك کۆڕیان گرتوە، وتی: ئەو خەڵکە کێن؟**

ئیبن عومەر هەندێك گومان لەسەر عوسمان بۆ میصریەکە ڕوون دەکاتەوە

**وتیان: ئەوانە قورەیشین!**

**وتی: کێ شێخ(مامۆستا)یانە؟**

**وتیان: عبداللەی کوڕی عومەر.**

**وتی: (ئیبن عومەر)! من پرسیاری شتێکت لێدەکەم، هەواڵم پێبدە، ئایا دەزانی (عوسمان) لە ڕۆژی (ئوحود)دا رایکرد؟**

**(ئیبن عومەر) وتی: بەڵێ.**

**وتی: ئایا دەزانی بەشداری جەنگی بەدری نەکرد؟**

**(ئیبن عومەر) وتی: بەڵێ.**

**وتی: ئایا دەزانی بە (بیعة الرضوان)یشدا خۆی شاردەوەو ئامادەی نەبوو؟**

**(ئیبن عومەر) وتی: بەڵێ.**

پیاوەکە وتی: الله اکبر!

(ئیبن عومەر) وتی: وەرە با بۆت روون کەمەوە.

مەسەلەی راکردنی لە رۆژی (ئوحود)دا شایەتی دەدەم خوای گەورە لێی بوردوەو لێی خۆشبوو، خوا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ: ئەوانەی لەئێوە رایان کرد-لەورۆژەدا کە دوو کۆمەڵ گەیشتنە یەك-، شەیتان هەڵی خلیسکاندن، لەبەر کارێ کە کردبویان" خوایش بەخشینی. هەر خودایە کە لە گوناهان دەبورێ و لەسەرخۆیە.﴾آل عمران/١٥٥.

بەلام ئامادەنەبونی لە (بەدر)دا، لەبەر ئەوەبوو کە (روقیە)ی کچی پێغەمبەری خواﷺ کە خێزانی ئەوبوو، لەو کاتەدا نەخۆش بوو، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: تۆ پاداشت و بەشی پیاوێکت هەیە کە ئامادەی (بەدر) بووە.

بەلام ئامادە نەبونی لە (بیعة الرضوان)دا، ئەگەر لە بنەچەکانی مەککەدا کەسێکی بەڕێزتر لە (عوسمان) هەبوایە، ئەوا دەیاننارد بۆ مەککە، پێغەمبەری خواﷺ ناردی، (بیعة الرضوان)یش دوای ناردنی (عوسمان) بوو بۆ مەککە، پێغەمبەری خواشﷺ بە دەستی راستی ئاماژەی دا: ئا ئەمە دەستی (عوسمان)ە، دای بە دەستی خۆیداو وتی: ئەمەش لەبۆ عوسمان!!

پاشان (ئیبن عومەر) بە پیاوە میصریەکەی وت: دەی ئەمە لەگەڵ خۆت ببە!![1]

حوذەیفەی کوڕی یەمان قسە لەسەر شەهیدبونی عوسمان دەکات

١٠- (حوذەیفەی کوڕی یەمان)ﷺ قسەیەکی سەیری هەیە لەسەر مەسەلەی کوژرانەکەی (عوسمان)ﷺ.

(زەیدی کوڕی وەهەب) لە (حوذەیفە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: یەکەم فیتنە کوژرانی (عوسمان)ە و دواهەمین فیتنە دەرچوونی دەجالە، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، هەرکەسێك بە ئەندازەی وردیلەیەك

---

١ ـ رواه البخاري في الفضائل، والترمذي في مناقب عثمان.

**کوژرانی (عوسمان)ی پێ خۆش بێت، ئەگەر بە دەجال بگا یەکسەر شوێنی دەکەوێت، ئەگەر پێشی نەگا لە گۆڕەکەیدا بڕوای پێ دێنێ!**

**(موحەممەدی کوڕی سیرین)یش لە (حوذەیفە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: پەروەردگارا! ئەگەر کوژرانی (عوسمان) خێری تیا بووبێ، ئەوا بەشی منی تێدا نیە، ئەگەر کوژرانەکەی شەڕیش بووبێت، ئەوا من لێی بەریم.. بەخوا ئەگەر کوشتنی خەیر بێت ئەوا خەیری لێ دەبارێت، ئەگەر کوشتنیشی شەڕ بێت ئەوا خوێن دەمژێ.**

**(ئەبوعبداللەی حەرانی) لە (حوذەیفەﷺ)وە گێڕاویەتیەوە، کاتێك (حوذەیفە) لە ماڵی خۆیدا نەخۆشی مردنی گرت، یەك لە براکانی لەگەڵدا بوو، قسەی لەگەڵ خێزانەکەی دەکرد و دەیچپاند بە گوێیدا، ئەویش چاوی کردەوەو پێی وت: چی ڕوویداوە؟ وتیان: خەیرا!**

**وتی: شتێك لەمنی بشارنەوە خەیر نیە.**

**پیاوەکە وتی: (عوسمان) کوژراوە.**

**(حوذەیفە) وتی: إنا لله وإنا الیه راجعون، پەروەردگارا! من بەری و کەنارگیرم لەم کارە، ئەگەر کوشتنی خەیر بێت، ئەوە بۆ ئەوانەیە ئامادەی بون، من لێی بەریم، ئەگەریش کوشتنەکەی زیان بێت، ئەوا هی ئەوەیە ئامادەی بوو، منیش لێی بەریم.. ئەی (عوسمان) ئەمڕۆ دڵەکان گۆڕان، سوپاس بۆ ئەو خوایەی پێش فیتنەی خستم، بە سەرکردە و پیاوەگەورەکانیەوە.**[1]

ئیبن موسەیەب هۆی لاڕێبونی ئیبن ئەبی حوذەیفە ڕوون دەکاتەوە

**١١- (یەحیای کوڕی سەعید) و (عبداللەی کوڕی سەعیدی کوڕی ثابیت) وتویانە: پرسیارکەرێك سەبارەت بە (موحەممەدی کوڕی ئەبو حوذەیفەی کوڕی عوتبە)-کە (عوسمان)ﷺ بەخێوی کردبوو، کوڕی ژنەکەی بوو، لەماڵی ئەودا بە هەتیوی گەورە بوو- پرسیاری لە (سەعیدی کوڕی موسەیەب) کرد: چی وای لەو کرد لە (عوسمان)ﷺ یاخی بێ؟**

**(سەعیدی کوڕی موسەیەب) وتی: ئەو هەتیو بوو، لە ماڵی (عوسمان)دا**

---

١ ـ تەماشای وتەکانی حوژەیفە بکە لە (البداية والنهاية) ٤: ١٩٢.

**گەورە بوو، (عوسمان)ﷺ سەرپەرشتیاری هەتیوی كەسوكارەكانیشی بوو، هەموویانی لەخۆ دەگرت و نەفەقەی دەكێشان، كاتێ (عوسمانﷺ) خەلافەتی گرتە دەست، (موحەممەد) داوای لە (عوسمان) كرد بیكاتە سەرپەرشتیاری كارێك!**

**(عوسمانﷺ) پێی وت: ڕۆڵەكەم، ئەگەر تۆ باش و وشیار و شایستە بی بۆ كار، ئەوا بەكارت دەهێنم و سەرپەرشتیاری كارێكیشت پێ دەدەم، بەڵام هێشتا شایستەی ئەوە نیت!**

**(موحەممەد) پێی وت: كەواتە مۆڵەتم بدە تا دەرچم و بەدوای كارێكدا بگەڕێم بۆ قوتی ژیانم.**

**(عوسمانﷺ) پێی وت: بۆ كوێ دەتەوێ بچۆ.**

**(عوسمانﷺ) لەلایەن خۆیەوە ئامادەی كرد و ماڵ و سامانی پێدا.**

**(موحەممەدی كوڕی ئەبو حوذەیفە) ڕۆیشت بۆ میصر، ڕقی لە (عوسمان)ﷺ هەڵسابوو، چونكە ویلایەتی پێ نەسپاردبوو، لەوێش سەبەئیەكان لە دەوری كۆبونەوەو بەلای خۆیاندا ڕایانكێشا![1]**

ئیبن موسەییەب هۆی كاریگەربونی عەممار بە گومانەكان ڕوون دەكاتەوە

**١٢- پرسیار لە (سەعیدی كوڕی موسەییەب) كرا سەبارەت بە هۆی وەستانی (عەممای كوڕی یاسر) دژ بە (عوسمان)ﷺ و كاریگەر بونی پێیان-لەگەڵ ئەوەی ئەو وەك ئەوان سەبەئی نەبووﷺ-.**

**وتی: لەنێوان (عەممار) و (عەباسی كوڕی عوتبەی كوڕی ئەبوجەهل)دا دەمەقاڵێك ڕوویدا، (عوسمان)ﷺ لێی دان، ئەوەش بووە هۆی تێكچوونی نێوان خاوخێزانی (عەممار) و خاوخێزانی (عوتبە)، (عەممار)یش لەمەوە هەڵوێستی بەرامبەر (عوسمان)ﷺ گۆڕا.**

**(سەعیدی كوڕی موسەییەب) هۆ و مەبەستی لێدانەكەی (عەممار)ی درێژە پێنەدا.[2]**

سالمی كوڕی عبدالله، هۆی كاریگەربونی موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكر بە گومانەكان ڕوون دەكاتەوە

**١٣- (موبەشیر) پرسیاری لە (سالمی كوڕی عبداللهی كوڕی عومەر)**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٩٩.

٢ ـ تأريخ الطبري ٤: ٣٩٩.

**کردﷺ، سەبارەت بە (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق)، کە چی وای لێکرد دژ بە (عوسمان)ﷺ بوەستێ؟**

**(سالم) وتی: توڕەیی و تەماح!**

**(موبەشیر) وتی: توڕەیی و تەماحی چی؟**

**(سالم) وتی: (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) ئەو شوێنەی هەبو لە ئیسلامدا کە هەیبوو، ئەو کوڕی (ئەبوبەکری صدیق) بووﷺ، هەندێك لە خەڵکی هانیان دا و تەماحیان بۆی دروست کرد، ڕێنیشاندەری هەبوو.**

**هەقێك کەوتە سەری، (عوسمان)یشﷺ بە ڕەوا گرتی و دای لە پشتی و، نەرمی لەگەڵ نەنواند!**

**لە دەرونی (موحەممەد)دا ئەمە و ئەوە کۆبونەوە، دژ بە (عوسمان)ﷺ وەستا، بوو بە سەرزەنشتکراو(مذمم)، پاش ئەوەی سوپاسکراو(محمد) بوو.[1]**

ئیبن کەپیر هۆی نەجەنگانی هاوەڵان لەگەڵ سەبەئیەکان روون دەکاتەوە

**١٤- ئەم وتانە بە پرسیارێك کۆتایی پێ دێنین کە ئیمامی مێژوونووس (ئیبن کەثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێ، وروژاندویەتی و چەند وەڵامێکی نایابیشی بۆ تۆمار کردووە.**

**دەڵێ: ئەگەر یەکێك بڵێ: چۆن (عوسمان) لە مەدینەدا کوژرا؟ لەکاتێکدا کۆمەڵێك لە گەورە هاوەڵانی تێدا بوو؟ بۆ بەربەستی کوشتنەکەیان نەکرد؟**

هاوەڵان تەوەقوعی کوشتنی عوسمانیان نەدەکرد

**وەڵام لە چەند رویەکەوە:**

**وەڵامێکیان: هیچ یەکێك لەو هاوەڵانە گومانی نەدەبرد کە کار بگا بەوەی لەڕێدەرچووەکان (عوسمان)ﷺ بکوژن، ئەوان مەبەستی کوشتنیان ڕانەگەیاندبوو، بەڵکو لەوانەیە زۆرینیان لەسەرەتاوە نەیانویستبێ بیکوژن.**

**چونکە یەك لەم سێیەیان لێ داوا دەکرد:**

**یا خۆی لە کار بخا، یا (مەروانی کوڕی حەکەم)یان تەسلیم بکات، یان دەیکوژن!**

**زۆربەی هاوەڵان داواخواز بون (مەروان)یان تەسلیم بکا یا خۆی لەکار بخا، بەمەش لەو میحنەتە ڕزگاری دەبێ.**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤: ٤٠٠.

هاوەڵان گومانیان نەدەبرد کوشتن روو بدا و، ئەو خەڵکە جورئەتیان بگاتە ئەو رادەیە کە هەستن بە کوشتنی!

هاوەڵان لە پێناویدا جەنگان بەڵام ئەو فەرمانی راگرتنی جەنگی پێدان

دووەم: هاوەڵان بەرگریان لە کوشتنی (عوسمان)ﷺ کرد و پشتگیریان کرد، زۆر بەتوندیش بەربەستیان لێکرد، بەڵکو هەندێکیان لەپێناویدا جەنگان، بەڵام کاتێك میحنەتەکە پەرەی سەند، (عوسمان)ﷺ سوێندی لیخواردن کە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان، ئەوانیش لەگەڵ پێناخۆش بونیاندا فەرمانەکەیان جێبەجێکرد، چونکە دەیانزانی جێبەجێکردنی فەرمانی ئەمیر خواپەرستی و گوێڕایەڵیەو سەرپێچیکردنیشی بێفەرمانیە.

خەڵکی مەدینە لەبەرامبەر سەبەئیەکان کەم بون

وەڵامی سێیەمیان: ئەو لەڕێدەرچووە سەبەئیانە کاتێکی گونجاو و لەباریان هەڵبژارد بۆ داگیرکردنی مەدینە، ئەویش کاتی دەرچوونی زۆربەی خەڵکی مەدینە بوو بۆ حەج، لە مەدینەشدا کەمێك لە خەڵکی مابویەوە کە توانای هەڵگرتنی چەکی هەبوبێت.

کاتێکیش لەڕێدەرچووەکان زانیان سوپاکانی میصر و شام و کوفە و بەصرە روویان لە مەدینە کردووە بۆ فریاکەوتنی (عوسمان) و نزیکە حاجیەکانیش بگەڕێنەوە مەدینە، پەلەیان کرد لە جێبەجێکردنی کوشتنی (عوسمان)ﷺ، پێش ئەوەی فریاکەوتنەکان بگەن.

وەڵامی چوارەمیان: ژمارەی لەڕێدەرچووە سەبەئیەکان بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی جەنگاوەری مەدینە زۆر بون و سێ هەزار جەنگاوەر بون، کە لەوانەیە ئەو ژمارەیە لە جەنگاوەران لە مەدینەدا نەبوبێ، چونکە خەڵکی لە سەنگەر و شار و وڵاتە رزگارکراوەکاندا بون.

زۆرێکیان کەنارگیریان لە فیتنە کرد

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی هاوەڵان کەنارگیریان لە فیتنە کرد و لە ماڵەکانیان نەهاتنە دەرەوە، ئەو کەسەش کە دەهاتە نوێژ لە مزگەوت بە شمشێرەوە دەهات.

ئەگەریش ئەو هاوەڵانە بیانویستایە ئەو لەڕێدەرچووانە لە ماڵی (عوسمان) دوورخەنەوە، لەوانەیە نەیاتوانیبایە!

منداڵانی هاوەڵان بەرگریان لە عوسمان کرد

پاشان گەورە هاوەڵان، وێنەی (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ

کوڕەکانیان ناردە لای (عوسمان)ﷺ، بۆ ئەوەی لەگەڵی بن و بەرگری لە ماڵەکەی بکەن، ئەو کوڕانە بە باشترین شێوە بە ڕۆڵی خۆیان هەستان و دەستیان کرد بە شەڕکردن لەگەڵ لەڕێدەرچووەکان، تا ئەو کاتەی (عوسمان)ﷺ داوای لێکردن و سوێندی لێخواردن لە جەنگ کردن نەوەستان!

هیچ هاوەڵێك بە کوشتنی عوسمان رازی نەبوو

بەڵام ئەوەی هەندێ لە خەڵکی باسی دەکەن لەوەی کە هەندێ لە هاوەڵان . وەك (عەلی و طەڵحە و زوبەیر)ـ ﷺ (عوسمان)یان تەسلیم و سەرشۆڕ کرد و، ڕازی بون بە کوشتنی، ئەوە شتێکی پوچ و ناڕەوایە.

هیچ یەکێك لە هاوەڵان رازی نەبووە بە کوشتنی (عوسمانﷺ) ، بەڵکو هەموو هاوەڵێك کوشتنەکەی پێ ناخۆش بووەو ریسوای کردووەو جنێوی داوە بەوانەی جێبەجێیان کرد، بەڵام هەندێکیان ئاواتەخواز بون ئەگەر (عوسمانﷺ) خۆی لەکار بخستایە، وەکو (عەمماری کوڕی یاسر).[١]

ڕەزای خوا لە شەهیدی ماڵەکەی (شهید الدار)، (عوسمانی کوڕی عەفان) بێ و بە رازیبونی خۆی شادی بکا، خوای گەورەش لە سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ڕازی بێت...

---

١ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٤: ١٩٧-١٩٨، بە دەستکاری داڕشتن و کورتکردنەوەی، بەڵام ئەمە ناوەڕۆکی وتەکانی (ابن كثير)ە.

# ترۆسکی پێنجەم

## عەلی کوڕی ئەبوطالب، لەنێوان جێنشین بون و شەهیدبوندا.

خەواریجە سەبەئیەکان توانیان عوسمانی کوڕی عەففانﷺ بکوژن، ئەوەش لەپێش ئاوابونی خۆر لە ڕۆژی هەینی هەژدەی مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی ٣٥ی کۆچی بوو.

سەبەئیەکان مەدینە داگیر دەکەن

لەو کاتەدا فەرمانڕەوای سەبەئییەکان لە مەدینەدا (غافقی کوڕی حەربی عەککی) بوو، شەیتانی ڕاستەقینەیان (عبداللەی کوڕی وەهەبی کوڕی سەبەء)یان لەگەڵدا بوو.

لە ڕۆژانی گەمارۆی عوسمان و ڕۆژانی دوای شەهیدبونی، غافقی کوڕی حەرب فەرمانڕەوای کرداری مەدینە بوو، واتە شاری مەدینە لەو کاتەدا لەژێر دەسەلاتی خەواریجە سەبەئیەکان بوو.

ناکۆکی سەبەئییەکان لەسەر خەلیفەی نوێ

لەپێش کوژرانی عوسمان، سەبەئیەکان لەنێوان خۆیاندا کۆك نەبون لەسەر ئەوەی لەدوای عوسمانﷺ کێ ببێتە جێنشین، بەڵکو لەسەر دانانی جێنشینی تازەش ناکۆك بون.

ئێمە ئەوە دەزانین کە سەبەئیەکان سێ کۆمەڵ بون لە میصرو کوفە و بەصرە، سەبەئیەکانی میصری هەواداری (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ بون و سەبەئیەکانی کوفە هەواداری (زوبەیری کوڕی عەوام)ﷺ بون و سەبەئیەکانی بەصرەش هەواداری (طەڵحەی کوڕی عبیداللە)ﷺ بون.

سەبەئیەکان تەنها لەسەر کوشتنی عوسمانﷺ و شێواندنی ژیانی موسڵمانان و دروستکردنی دووبەرەکی لەنێوانیاندا کۆك بون، لەبەر ئەوە بەدوای دانانی جێنشینێك لەدوای عوسمانﷺدا نەدەگەڕان.

موسڵمانەکان بەبێ جێنشینن، ئەمە یەکەم جارە شتی وا ڕوو بدات، چەند ڕۆژێك بەسەر کوژرانی جێنشینەکەیاندا تێپەڕی، ئایە سەرکردە سەبەئیەکان دەبێ چی بکەن؟ شەیتانەکانیان وێنەی (عبداللەی کوڕی

**سەبەء) و (غافقی کوڕی حەرب) و (ئەشتەری نەخەعی) و (حەکیمی کوڕی جەبەلە) دەبێ چۆن هەڵسوکەوت بکەن؟ پێویستە کارێك بکەن ئەو گرفتەی پێ چارەسەر بێ.**

گەورە هاوەڵان بانگەشەی سەبەئیەکان بۆ بەیعەت پێدان ڕەت دەکەنەوە

**سەرکردە سەبەئیەکان پێنج ڕۆژ بەردەوام بون و پەیوەندیان دەکرد بە گەورە هاوەڵەکان و داوای ئەوەیان لێ دەکردن کە یەکێکیان ببێت بە جێنشین و ئەوانیش بەیعەتی بدەنێ. بەڵام هاوەڵە بەڕێزەکان قسەی سەبەئیەکانیان ڕەت دەکردەوەو پەسەندیان نەدەکرد، بەڵکو نەفرەتیان لێدەکردن لەوەی کە هەستان بە کوشتنی عوسمانﷺ.!!**

عەلی و طەڵحە و زوبەیر بەیعەتی سەبەئیەکان ڕەت دەکەنەوە

**لەو (دە) کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو پێنجیان لەژیاندا مابون، ئەوانیش (عەلی کوڕی ئەبوطالب) و (طەڵحەی کوڕی عبیداللە) و (زوبەیری کوڕی عەوام) و (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس) و (سەعیدی کوڕی زەید)ﷺ، بەڵام ئەوانی تر کۆچی دواییان کردبوو کە ئەم پێنجە بون: (ئەبوبەکر) و (عومەر) و (عوسمان) و (ئەبوعبیدەی عامری کوڕی جەڕاح) و (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ﷺ.**

**سەبەئیەکانی میصر دەچنە لای (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ چونکە هەواداری ئەوبون و داوای لێ دەکەن کە ڕازی بێت و بەیعەتی بدەنێ و بیکەن بە جێنشین، بەڵام داواکەیان ڕەت دەکاتەوەو خۆی لێیان بەری دەکا و نەفرەتیان لێ دەکات.**

**سەبەئیەکانی کوفەش دەچنە لای (زوبەیر)ﷺ و داوای ئەوەی لێ دەکەن ببێت بە جێنشین، ئەویش داواکەیان ڕەت دەکاتەوەو خۆیان لێ بەری دەکا و نەفرەتیان لێ دەکات.**

**سەبەئیەکانی بەصرەش دەچنە لای (طەڵحە)ﷺ و داوای ئەوەی لێ دەکەن، ئەویش ڕەتی دەکاتەوە و خۆی لێیان بەری دەکا و نەفرەتیان لێ دەکا.**

**چەند جار ئەو هەوڵانەیان لەگەڵ ئەو سێ هاوەڵەدا دووبارە کردەوە، بەڵام ئەوان لەسەر ڕەت کردنەوەی داواکەیان سووربون.**

سەبەئیەکان دەچنە لای سەعیدی کوڕی ئەبو وەقاص بۆ جێنشینایەتی

لێرەدا قسەی هەرسێ کۆمەڵەکە بوو بە یەك لەسەر ئەوەی (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ بەلاوە بنێن و هیچ کام لەو سیانە هەڵنەبژێرن و بچن بۆ لای هاوەڵی چوارەم، ئەویش (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)ە ﷺ.

لەو سەردەمەدا (سەعد) و (سەعیدی کوڕی زەید)ﷺ خۆیان لەو ئاژاوەیەدا کەنارگیر کردبوو، لە پارچە زەویەك کە هەیان بوو لە ناوچەی (العقیق)ی نزیك مەدینە نیشتەجێ ببون.

سەبەئیەکان بە سەعدیان وت: تۆ خاڵۆی پێغەمبەری خوایﷺ و یەکێکی لەو (دە)کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە و پێغەمبەرﷺ کە کۆچی دوایی کرد لە تۆ ڕازی بوو و، (عومەر)ﷺ تۆی کردبووە ئەندامی شورا و ئێمەش لەسەر تۆ کۆبوینەتەوە و کۆین لەسەرئەوەی بەیعەتت بدەینێ و بتکەین بە فەرمانڕەوای بڕواداران، جا هەستە و با بەیعەتت بدەینێ.

سەعد داواکەیان ڕەت دەکاتەوە

سەعدﷺ بەم شێوەیە وەڵامی داواکەی دانەوەو وتی: هەر لەو کاتەی شورا کۆبووەوە و بەیعەتیان دا بە عوسمان من و (ئیبن عومەر) لێی دەرچووین، من هەرگیز پێویستم بەمە نیە.

دواتر ئەم دێرە شیعرەی گوت:

لا تخلطن خبيثات بطيّبة واخلع ثيابك منها وانْجُ عُريانا[1]

کاتێك گوێبیستی ڕەتدانەوەی سەعد بون ڕوویان کردە (عبداللهی کوڕی عومەر)ﷺ و پێیان وت: تۆ کوڕی (عومەری کوڕی خەتتاب)ی، تۆ بەم کارە هەستە..

ئیبن عومەر داواکەیان ڕەت دەکاتەوە

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە:

ئەم کارە تۆڵەی هەیە، بەخوا من خۆمی تێدا هەڵناقورتێنم.

سەبەئیەکان واقیان وڕما بە ڕەت کردنەوەی هەر پێنج هاوەڵەکە بۆ قبوڵ کردنی خەلافەت و دانیشتن بۆ بەیعەتدان لە ژێر شمشێری

---

١ ـ ماناکەی ئەوەیە: پیسەکان بە پاك تێکەڵ مەکە، جلەکانت فڕێدە و بە ڕووتی خۆت ڕزگار کە.

**سەبەئیەکان و لەژێر داگیرکردنیان بۆ مەدینە. هەوڵەکانی سەبەئیەکان کە پێنج ڕۆژی خایاند بێئاکام بوو.!!**

**لە کارەکەشیان سەرسام بون و نەیاندەزانی چی بکەن.**

**عەلی داوای هەندێك لە هاوەڵان ڕەت دەکاتەوە بۆ بەیعەت پێدان**

**هەندێ لە موسڵمانان-کە سەبەئی نەبون- چوون بۆ لای (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ و داوایان لێ کرد ببێتە جێنشین، ئەویش ڕەتی کردەوە و، داوای لێکردن جێنشینایەتی بە شورا بێ و پێی وتن: عومەر پیاوێکی پیرۆز بوو، دانانی جێنشینی کردە شورا، لەسەر خەڵکی پێویستە کۆ ببنەوەو ڕاوێژ بکەن، بۆ ئەوەی جێنشینی خۆیان دەستنیشان بکەن.**

**هەندێك لە موسڵمانان وتیان: ئەگەر خەڵکی گەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان و جێنشین هەڵنەبژێردرا، ئەوکاتە مەترسی ناکۆکی خەڵکی و پشێوی ئوممەت لەئارادا دەبێت، پێویستە هەرچی زووترە جێنشین هەڵبژێرین..**

**هەوڵ و تەقەلای سەبەئیەکان بۆ هەڵبژاردنی جێنشین پێنج ڕۆژ بەردەوام بوو، لە ڕۆژی شەممەوە تاوەکو ڕۆژی چوارشەممە، بێ ئەوەی ئەنجامێکی هەبێ.**[1]

**سەبەئیەکان خەڵکی مەدینە کۆدەکەنەوە**

**لە ڕۆژی شەشەمدا، کە دەکاتە ڕۆژی پێنج شەممەی (٢٤)ی (ذي الحجة)، سەبەئیەکان خەڵکی مەدینەیان بە زۆر لەمزگەوت کۆکردەوە.**

**(طەڵحە) و (زوبەیر) و (سەعد)ﷺ لەگەڵ خەڵکە کۆبووەوەکە نەبون، چونکە بۆ سەر زەویەکانیان لە دەرەوەی مەدینە دەرچووبون.**

**پاش کۆکردنەوە پێیان وتن: ئەی خەڵکی مەدینە! ئێوە ئەهلی ڕاوێژن، لەم ئوممەتەدا ئێوە ئەهلی حەل و عەقدن، بە ڕەزامەندی ئێوە پێشەوا جێگیر دەبێت، فەرمانی ئێوە لای ئوممەت جێبەجێ دەکرێت، پیاوێك لەخۆتان هەڵبژێرن و بەیعەتی جێنشینایەتی پێ بدەن، ئێمەش دواتان دەکەوین و هاودەنگ دەبین لەسەر ئەو کەسەی هەڵی دەبژێرن!**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٢-٤٣٣

مۆڵەتی دوو ڕۆژیان دەدەن بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە

دوای ئـەوە هەڕەشـەیان لـە خـەڵکی مەدینـە کـرد و وتیـان: دوو ڕۆژ کاتەکەتان بۆ دوا دەخەین بۆ ئەوەی جێنشین هەڵبـژێرن.. سوێند بەخوا ئەگەر لەم دوو ڕۆژەدا جێنشین هەڵنەبژێرن، ئەوا ئێمە (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر) و خەڵکانێکی زۆر لە ئێوە دەکوژین!![1]

خـەڵکی مەدینـە لـەوە ترسـان خەواریجـە سـەبەئیەکان هەڕەشـەکانیان جێبەجێ بکـەن، چونکە ئەوانە خەڵکێکی پیاوکوژن، پێشتر فەرمانڕەوای ئیمانداران (عوسمان)یانﷺ کوشـت، چی ڕێیـان لێ دەگرێت هەڕەشـەکانیان جێبەجێ نەکەن؟

بارودۆخی هەڵبژاردنی عەلی بۆ جێنشینایەتی

لـەم بارودۆخـە خەماویـەدا و، لـەو کاتـەی کـە سـەبەئیەکان مەدینـەیان داگیر کـردووە و، زۆریـان لـە خەڵکەکـەی کـردووە کـە جێنـشین هەڵبـژێرن، خەڵکی مەدینە ڕوویان کردە (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ.

بارودۆخەکە بـارودۆخی زۆرکـردن و تۆقاندن بوو، لەلایـەن ئـەو کۆمەڵـە بکوژە خەواریجانەوە، ئەگـەر لـە ماوەی دیاریکراودا جێنشین هەڵنەبژێرن، ئەوا مەرگ چاوەڕوانی خەڵکی مەدینە دەکات!!

گفتوگۆی نێوان عەلی و خەڵکی مەدینە

خەڵکی مەدینە چوون بـۆ لای (عـەلی کوڕی ئـەبوطالب)ﷺ و پێیـان وت: وەرە بـا بەیعـەتت بـدەینێ!! نـابینی ئیـسلام چـی بەسـەر هـاتووە؟ نـابینی تووشی چی بووین؟ ئەو کۆمەڵە نابینی؟

(عەلی)ﷺ وەڵامی دانەوەو وتی: وازم لێبێنن و بچن یەکێکی تر دابنێن، چونکە ڕوبەڕوی کارێك بووینەتەوە چەند ڕوویـەکی هەیـە و چەند ڕەنگـی هەیە، دڵ پێی هەڵناستێت و ژیریەکان لەسەری جێگیر نابن!!

پێیان وت: بۆ خـوا داوات لێدەکەین کە ڕازی بیت بەیعـەتت بدەینێ و بـەم کـارە هەڵبـستی، ئایـا ئـەوە نـابینی کـە ئێمـە دەیبینـین؟ ئایـا ئیـسلام نابینی! ئایا ئاژاوەکە نابینی! ئایا لە خوا ناترسێی!!!

عەلی ڕازی دەبێ بەوەی بەیعەتی بدەنێ

عـەلیﷺ لەبـەردەم ئـەو هـەموو هـەوڵ و پێداگیریانـەی گـەورە هاوەڵانـدا

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٣-٤٣٤

ناچار بوو پاشگەز بێتەوە و داواکەیان وەربگرێت.

پێی وتن: ئەوە بزانن من ئەگەر وەڵامی داواکەتانم داوە و رازی بووم بە بەیعەتتان، ئەوکاتە رای خۆم بەسەرتاندا دەسەپێنم، دەتانخەمە سەر ئەوەی دەیزانم، ئەگەریش وازم لێبێنن و کەسێکی تر هەڵبژێرن، ئەوە لەلای من چاکترە و من یەکێکم وەك ئێوە.. من گوێڕایەڵترین و ملکەچترینتانم بۆ هەر کەسێ کە ئێوە بیکەن بە فەرمانڕەوا.

کۆبونەوەی هەینی لە مزگەوت بۆ بەیعەت دان بە عەلی

ئەو ڕۆژە بڵاوەیان لێکرد و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بەیانی یەکتری ببینن کە ڕۆژی هەینییە و ڕۆژی کۆتایی مۆڵەتەکەی سەبەئیەکانە بۆیان.

سەبەئیەکان بەوەیان زانی کە خەڵکی مەدینە روو دەکەنە مزگەوت بۆ بەیعەت دان بە (عەلی)ﷺ، کاتی بەیعەت دانەکەشیان زانی کە هەینییە و لەناو مزگەوتدایە.

دڵخۆشی سەبەئیەکانی میصر و تورەبونی سەبەئیەکانی کوفە و بەصرة

سەبەئیە مصریەکان-و لەگەڵ ئەوانیشدا سەری ئاژاوەگێڕیەکە (عبداللەی کوڕی سەبەء)، کە هەر ئەوانیش بون (عوسمان)یانﷺ کوشت- دڵخۆش بون، چونکە هەواداری (عەلی) بون و، هەڵبژاردنی (عەلی)ﷺ بە فەرمانڕەوای بڕواداران بە سەرکەوتنێکی خۆیان دەزانی بەسەر سەبەئیەکانی دیکەدا.

لەو کاتەی ئەمانە دڵخۆش بون، بەڵام سەبەئیەکانی کوفە لە (زوبەیر)ﷺ تورە بون چونکە بە جێنشینی رازی نەبوو، هەروەها سەبەئیەکانی بەصرەش لە (طەڵحە)ﷺ تورە بون لەبەر هەمان هۆ.

هەر یەك لەم دوو کۆمەڵە خۆیان بە دۆڕا و شکست خواردوو دەزانی، چونکە نەیانتوانیوە ئەو کەسە بکەنە جێنشین کە دەیانویست و هەواداری بون.

ئامادەکردنی طەڵحە و زوبەیر بۆ بەیعەت دان بە عەلی

بەمەش سەبەئیەکانی بەصرە و کوفە بونە شوێنکەوتەی سەبەئیەکانی میصر و پارچەیەك لەوان.

بەڵام سوور بون لەسەر بەیعەت دان بە جێنشینی تازە و کۆتایی هێنان بەم گرفتە.

سەبەئیەکان وتیان: پێویستە بەیعەت بە (عەلی) بدرێ، چونکە خەڵکی مەدینە ئەویان دەوێت، دەبێ هەموو بەیعەتی پێ بدەن، بە (طەڵحە) و (زوبەیر)یشەوە.

لەو کاتەدا (زوبەیری کوڕی عەوام)ﷺ لە دەرەوەی مەدینە بوو، سەبەئیەکی بەصراییان نارد تا بیهێنێتەوە، تا لە ڕۆژی هەینیدا ئامادەی بەیعەتی (عەلی)ﷺ بێت، ئەوەبوو سەرکردەی سەبەئیەکانی بەصرە (حەکیمی کوڕی جەبەلە) لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوون بۆ لای و بەزۆری و بە زەبری شمشێر هێنایانەوە، تا ئامادەی کۆبوونەوەکەی بەیعەت بێت.

(طەڵحەی کوڕی عبیدالله)ﷺ لە دەرەوەی مەدینە بوو، سەبەئیەکی کوفەییان نارد تا ئامادەی بەیعەتی (عەلی)ﷺ بێت لە ڕۆژی هەینیدا، ئەوەبوو سەرکردەی سەبەئیەکانی کوفە (الاشتر النخعی) لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوون بۆ لای و بەزۆری و بە زەبری شمشێر هێنایانەوە تا ئامادەی کۆبوونەوەکەی بەیعەت بێت.

کۆبونەوەی ڕۆژی هەینی ٢٥ ذوالحجە لە مزگەوتی پێغەمبەر

لە ڕۆژی هەینی، (٢٥)ی ذي الحجة، ساڵی (٣٥)، هاوەڵان لە مزگەوت کۆبونەوە، لەژێر پاسەوانی و دەسەڵاتی سەبەئیەکاندا بون کە بە شمشێرەوە بەسەر سەریانەوە وەستابون!!.

(عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ هات و چووە سەر مینبەر و گوتی: خەڵکینە! ئەمە کاری ئێوەیە، کەس حەقی تێدا نیە، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە ئێوە دەیکەن بە فەرمانڕەوا و بەیعەتی دەدەنێ.

عەلی کاروباری جێنشینی دەداتە دەست ئەهلی حەل و عەقد

دوێنێ لەسەر بڕیارێك یەکترمان بەجێ هێشت، ئەگەر ویستتان لەسەر بێت ئەوە بۆتان دادەنیشم و بەیعەتم دەدەنێ و لەسەر بڕیارەکەی دوێنێ دەڕۆین، ئەگەریش ئەوە بەباش نازانن، هەرکەسێك حەز دەکەن هەڵیبژێرن، من هیچ شتێك لە دڵمدا نابێت بەرامبەر بەکەس و، لەگەڵ ئێوەشدا بەیعەتی دەدەمێ!!.

هاوەڵان وتیان: ئێمە لەسەر ئەو بڕیارەی دوێنێین و ڕازین کە تۆ ببینە

**فەرمانڕەوای بڕواداران، دەستت بێنە با بەیعەتت بدەینێ.**

**(عەلی)ﷺ دانیشت بۆ بەیعەت پێدان، هاوەڵانیش بەرەو پیری چوون و بەیعەتیان پێدا.**

بەیعەتدانی هەموو هاوەڵانی مەدینە بە عەلی

**ئەو هاوەڵانەش کە خۆیان لە فیتنەکە بەدوور گرتبوو، وەك (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) و (سەعیدی کوڕی زەید) و (عبداللهی کوڕی عومەر) و (ئوسامەی کوڕی زەید) و (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و ئەوانیتر، بەیعەتیان پێدا-خوا لەهەموویان رازیبێت.**

**بەم شێوەیە لەلایەن هەموو هاوەڵانەوە بەیعەت بە عەلی درا و، کەسیان لە بەیعەت دوانەکەوتن، دوای ئەوان هەموو خەڵکی بەیعەتیان پێدا، لەگەڵ ئەوانیشدا هێزە سەبەئیەکانیش کە مەدینەیان داگیرکردبوو.**

**هەندێك لە هاوەڵان لە کاتی بەیعەت پێدانەکە پێیان وت: بەیعەتت دەدەینێ لەسەر بەرپاکردنی کیتابی خوا لە نزیك و لە دوور، لە بەهێزی و بێهێزیدا. ئەویش لەسەر ئەوە بەیعەتی لێ وەرگرتن.[1]**

**دوای ئەوەی خەڵکەکە بەیعەتیان پێدا، هەستا و وتارێکی بۆ خەڵك دا و، گوتی:**

وتاری عەلی لەدوای بەیعەت پێداندا

**((خوای گەورە کیتابێکی رێنیشاندەری دابەزاندوە، چاکە و خراپەی تێدا رونکردۆتەوە، ئێوەش کار بە چاکە بکەن و واز لە خراپە بهێنن، فەرزەکان لەسەرتان پێویستە، بۆ خوا جێبەجێی بکەن، دەتانگەیەنێتە بەهەشت.**

**خوای گەورە هەندێك سنوری حەرام کردووە کە ئاشکران، سنوری موسڵمانیشی لەسەروو هەموو سنوورەکانی ترەوە داناوە، موسڵمانانیشی بە دڵسۆزی و یەکخواپەرستی یەوە پەیوەست کردووە.**

**موسڵمانیش ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن تەنها بە حەق نەبێت، ئازاردانی موسڵمانیش حەڵاڵ نیە، تەنها بەوە نەبێت کە خوای گەورە لەسەری پێویست کردووە.**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٤-٤٣٥

**دەستپێشخەری بکەن لە کاروباری خەڵکیدا، تایبەتمەندی هەریەکێکتان مردنە، لەراستیدا خەڵکی لە بەردەمتانە و ڕۆژی دواییش لە پشتەوە دەورەی داون، جا باری خۆتان سوك بکەن، پێی دەگەن، بەلام خەڵکی چاوەڕوانی دوایینیانن.**

**بەندەکانی خوا! لە بەندە و زەوی خوادا ترسی خواتان هەبێت، ئێوە لە هەموو شتێك لێتان دەپرسرێتەوە، هەتا لە پارچە زەوی و ئاژەڵانیش.**

**گوێڕایەڵی خوای گەورە بن و لە فەرمانی دەرنەچن، ئەگەر چاکەتان دیت وەری بگرن و، ئەگەر خراپەتان دیت وازی لێبێنن.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الأَرْضِ تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ: **بیر لەو دەمە بکەنەوە کە ئێوە لەم وڵاتەدا کەمێکی بێدەسەلات بون" ترستان هەبو خەڵکیتر دەرتان بکەن و بێ جێ وڕێ بمێننەوە. پەنای دان و یاریدەی دان و سەرکەوتن و ڕۆزی پاك و ڕەوای پێدان، بەشکە شوکرانەبژێر بن.**﴾الأنفال/٢٦.))[1]

بەیعەتەکەی عەلی بەپێی بنەما شەرعیەکان دروستە

**بەم شێوەیە بەیعەتی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ؓ تەواو بوو، بەیعەتێکی ڕاست و دروست بوو بەپێی بنەماکانی ئیسلام و، لەلایەن ئەهلی ڕاوێژ و ئەهلی حەل و عەقد لە موسڵمانان و، هیچ یەکێك لە خەڵکی مەدینە لە بەیعەتەکە بەدوا نەکەوت.**

**دەست گرتنی سەبەئیەکان بەسەر مەدینەدا و، هاتنە ناو سوپاکەیەوە لەوەو دوا، هیچ لێڵی یەك ناخاتە بەیعەتەکەی (عەلی)یەوەؓ، چونکە پێویست بوو بەیعەت بە فەرمانڕەوایەکی بڕواداران بدرێت، تاکو دەنگی موسڵمانان یەك بخات و، کاروباریان بەڕێوە ببات، دوای ئەوەش یەکلابێتەوە بۆ لێپرسینەوەو دادگایی‌کردن و سزادانی ئەوانەی هەستان بە خراپەکاری و، کوشتنی (عوسمان)ؓ.**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٦

مادام ئەوانەی هەڵیانبژارد و پێی رازی بون و بەیعەتیان پێدا خاوەنی كارەكە بون و، ئەهلی حەل و عەقد و راوێژ لە هاوەڵان بون، كەواتە بەشێوەیەكی شەرعی و دروست بوەتە جێنشین.

عەلی داوای جێنشینایەتی نەكردوەو هەوڵی بۆ نەداوە

وا دەبینین شان دانەبەری (عەلی)ﷺ بۆ جێنشینایەتی، دوای داواكاری و سووربونی گەورەهاوەڵان و موسڵمانە چاكەكان بوو، دوای ئەوەی رەتی كردەوە و لەخۆی قەدەغە كرد، بەڵام لە كۆتاییدا هاتە سەر ویست و ئیرادەی ئەوان! ئەو داوای جێنشینی نەكرد و، نەیویست و هەوڵی بۆ نەدا، پیلانی لەسەر (عوسمان)ﷺ نەگێڕا تا جێنشینایەتی پێی بگات، وەك هەندێ لە مێژوونووسە درۆزنە دەمهەڵبەستەكان هەڵی دەبەستن!!

رازیبونی بە جێنشینایەتی بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئوممەت و قوربانی دان لەپێناویدا بوو

وا دەبینین رازیبونی (عەلی)ﷺ بە جێنشینێتی، داكۆكی كردن بوو لە رزگاركردنی موسڵمانان و، كۆكردنەوەی قسەیان و، چارەسەری گرفتەكەیان، دەیزانی كە جێنشینایەتی لەدەستدانە نەك دەستكەوت، تێكۆشانە نەك قازانج، دەردەسەری و ماندوبونە نەك بەرژەوەندی و سودوەرگرتن!.

(عەلی)ﷺ بە وەرگرتنی جێنشینایەتی، دەیزانی ئەوەی پێی هەڵدەستێت چیە، هەستی بە مەترسیەكەی دەكرد، سەرەنجامەكەی لەبەرچاوبوو، رازیش بوو بەم رێگە سەخت و دڕكاویەدا گوزەر بكات و، بە هەموو شتێك قوربانی بدات بۆ بەرژەوەندی ئوممەتەكەی.

(عەلی كوڕی ئەبوطالب)ﷺ دەیتوانی دەست لە كارەكە بكێشێتەوە و، دورەپەرێزی هەڵبژێرێ- هەروەك چۆن هاوەڵە بەرێزە پایەبەرزەكان كردیان- و بەمەش حەسانەوە و سەلامەتی و رزگاربونی بۆ خۆی هەڵدەبژارد، ئەگەر بشی كردبایە گوناهبار یان كەمتەرخەم نەدەبوو.

بەڵام كێ بۆ ئوممەت دەبێ؟ كێ بۆ یەكخستنی دەنگیان دەبێ؟ كێ بۆ بەڕێوەبردنی كاروباریان دەبێ؟

(عەلی)ﷺ بە وەرگرتنی جێنشینایەتی، سەختترین چارەسەر و، توندترین لای هەڵبژارد و، بەرژەوەندی ئوممەتی خستە سەرووی

بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، بەمەش جێنشینیەکەی قوربانیدانێکی مەزن بوو!!!

کاتێ بەیعەتەکەی (عەلی)ﷺ تەواو بوو، سەبەئیەکان پێیان وت:

خُذْها إِلَيْكَ وَاحْذَرَنْ أَبا الحَسَنْ — إِنَّا نُمِرُّ الأَمْرَ إِمْرارَ الرَّسَنْ
صَوْلَة آســادٍ كأسداد السُّفُن — بِمَشرفِيّـات كَغُدْرانِ اللَّبَنْ
ونَطْعَنُ المُلْكَ بِلِين كالشَّـــطَنْ — حَتّى يَمُرَّنَّ عَلَى غَيْرِ عَنَنْ

بەمەش رایان گەیاند کە چونەتە ناو سوپای (عەلی)یەوەﷺ و سەربازی ئەون، گوێڕایەڵ و ملکەچی ئەون، لەگەڵیدا جەنگی ئەوانە دەکەن کە لەفەرمانی دەردەچن و دژی دەوەستن.

ئەوان بەم کارەیان بەرژەوەندی خۆیان دەویست، تا موسڵمانان لێیان بەئاگا نەیەنەوە و نەتوانن لێیان بپرسنەوە و لەسەر کوشتنی (عوسمان)ﷺ، سزایان بدەن.

بونیان لە سوپاکەی عەلی بنەڕەتی گرفتەکەیەتی

ئەمەش بنەڕەتی گرفتەکەی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ بوو، کە بووە هۆی جیاواز بون لەگەڵ (معاویە) و، پاشان (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ و، پاشان ڕوودانی چەند جەنگێك..

(عەلی)ﷺ بەم شێوەیە وەڵامی وتەکەی پێشووی سەبەئیەکانی دایەوە:

إِنِّـــي عَجَزْتُ عَجْــزَةً لا أَعْتَــذِرْ — سَوفَ أَكِيسُ بَعْدَهَـــا وأسْـــتَمِرّ
أَرْفَـــعُ مِن ذَيْلِيَ مَـــا كُنْتُ أَجُــرّ — وأَجْمَـعُ الأَمـرَ الـشَّتِيَت المُنْتَـشِــرْ
إِنْ لَمْ يُشـاغِبْني العَجـولُ المُنْتَصِرَ — أَوْ يَتْرُكـوني وَالـسِّـــلاحُ يُبْتَــدَرْ[١]

کراسەکەی عوسمان و پەنجەکانی خێزانەکەی لە شامدا

لە ماوەی نێوان کوشتنی (عوسمان)ﷺ و بە جێنشین بونی (عەلی)داﷺ، (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) لەمەدینە بەرەو شام دەرچوو بۆ لای (موعاویە)ﷺ و، ئەو کراسەی (عوسمان)ی لەگەڵ خۆی برد کە کاتی کوژرانی لەبەریدابوو، کە بە خوێن بوو، هەروا پەنجەکانی (نائلە)ی خێزانی

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٧.

**(عوسمان)یشی لەگەڵ خۆی برد کە لەکاتی بەرگری کردن لە (عوسمان) بڕابوو رضي الله عنه.**

**(موعاویە)ش رضي الله عنه کراسەکەی (عوسمان) رضي الله عنه و پەنجەکانی (نائلە)ی لە مزگەوت هەڵواسی و موسڵمانانیش لە دیمەشق دەهاتن و کاری تێدەکردن و بۆ خەلیفە شەهیدەکەیان دەگریان!.**

**بەڵێنیان دەدا کە تۆڵەی (عوسمان) رضي الله عنه بسەننەوە و، تۆڵە لەو خەواریجە سەبەئیانە بکەنەوە کە کوشتویانە.**

**لەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە لە دیمەشقدا هانی تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)یان دەدا: (عوبادەی کوڕی صامیت) و ( (ئەبودەرداء) و (ئەبو ئومامەی باهلی) بوو رضي الله عنهم.[1]**

طەڵحە و زوبەیر داوای سزادانی بکوژان لە عەلی دەکەن

**کاتێ (عەلی) رضي الله عنه بەیعەتی پێدرا، (طەڵحە) و (زوبەیر) و هەندێ هاوەڵی تر رضي الله عنهم چوونە لای و پێیان وت: ئێمە کاتێ بەیعەتمان بەتۆ دا مەرجمان ئەوەبوو کە سنوورەکان(حدود) بەرپا بکەیت، ئەوانەش کۆمەڵی خەواریجەکانن و بەشدارییان لە کوشتنی (عوسمان)دا کردووە، دەمانەوێت حەدیان لەسەر جێبەجێ بکەیت.**

وەلامی عەلی بۆیان و بەڵگەی دواخستنی

**(عەلی) رضي الله عنه وەلامی دانەوە: براکانم! من بێئاگا نیم لەوەی ئێوە دەیزانن، بەلام چی بکەم لەگەڵ ئەم کۆمەڵە پیاوکوژە، لەکاتێکدا ئەوان دەستیان بەسەر مەدینەدا گرتووە،دەسەڵاتیان بەسەرماندا هەیە و دەسەڵاتمان بەسەریاندا نیە، ناتوانین ڕووبەڕوویان ببینەوە یان ناڕەزاییان بەرامبەر دەربڕین، جا چۆن دەتوانین لێیان بپرسینەوە یان سزایان بدەین؟ کە هێزێکیشمان نیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەیان؟ هەروەها بەندەکانیشتان لەگەڵیان هەڵساونەتەوە، دەشتەکیەکانیشتان چوونەتە ڕیزی ئەوانەوە، ئەوانە لەناو ئێوەن و چییان بوێت بەسەرتان دێنن و، چییان بوێت پێتانی دەکەن!!**

**ئایا هیچ بوارێك دەدۆزنەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی دەتانەوێ؟ ئایا ئێستا توانای لێپرسینەوە و سزادانی ئەوان لای ئێمە دەبینن؟**

---

١ ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٧ : ٢٢٨.

**پاشان (عەلی) بە (طلحە) و (زوبەیر)ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیاندا بون وتی: سوێند بەخوا (ان شاء الله) هەمان رای ئێوەم هەیە، لەوەی دەیڵێن لەگەڵتاندام، بەڵام کاری ئەو خەواریجانە کاری نەفامیە و، هێزیان هەیە و، لایەنگریان لەگەڵدایە و، لە وڵاتانەوە یارمەتیان بۆ دێت! ئێمەش لەژێر هێزی ئەواندایین!!**

عەلی خەڵك دەکاتە سێ بەشەوە و داوای مۆڵەت پێدان دەکا

**ئەگەر من بە رای ئێوە بکەم و ئەم کارە بوروژێنم و پەلەبکەم لە جێبەجێکردنی حەد لەسەریان، ئەوا خەڵك دەبنە سێ بەشەوە، بەشێکی هەمان رای ئێوەیان دەبێت و ئاماژە بە پەلەکردن لە سزادانیان و جێبەجێکردنی حەد لەسەریان دەکات.**

**بەشێکیش هەمان رای ئێوەیان نیە و، بەڵکو لەگەڵ خەواریجەکانە و سەریان دەخات.**

**بەشێکیش لەسەرخۆیی و پەلەنەکردن لە سزادانیان بەچاك دەزانێ و، داوای ئەوە دەکات چاوەڕوان بکرێت تا خەڵکەکە هێمن دەبنەوە و دڵەکان دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و، ئەم تەم و مژە دەڕەوێتەوە، ئەوکاتە هەق دەسەنرێت و حەدەکان جێبەجێدەکرێت.**

**جا لێم بێدەنگ بن و مۆڵەتم بدەن هەتا بارودۆخەکە هێمن دەبێتەوە، دوای ئەوە بگەڕێنەوە تا حەدیان لەسەر جێبەجێبکەین.[1]**

پەلەکردن لە سزادانی بکوژەکان یان دواخستنی

**هاوەڵان لە مەدینە بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان لەگەڵ بۆچونی (عەلی کوڕی ئەبوطالبﷺ) بون ودەیانوت: ئێمە ئێستا ناتوانین بەسەر ئەم کۆمەڵە شەڕەنگێزەی بکوژانی عوسماندا سەرکەوین، لەبەر ئەوە سزادانیان وجێبەجێکردنی حەد لەسەریان دوادەخەین تا ئەوکاتەی بەهێز دەبین.**

**بەشەکەی تریان ڕایان وابوو کە حەدیان لەسەر جێبەجێ بکرێت و دوانەخرێت، ئەنجامەکەشی هەرچیەك بێت.**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٧ .

(طەڵحە) و (زوبەیر)یش‌ؓ لەگەڵ بەشی دووەمدا بون.

ڕەتكردنەوەی فەرمانی عەلی بە دەرچوونی دەشتەكیەكان لە مەدینە

لەبەرامبەر پێداگیری ئەو هاوەڵانەی خاوەنی ڕای دووەم بوون كە دەبێ پەلەبكات لە جێبەجێكردنی سنوورەكان لەسەر بكوژانی (عوسمان)ؓ، (عەلی) لە ڕۆژی سێیەمی جێنشینایەتیەكەیدا دەرچوو بۆ ناو خەڵكەكە و پێی وتن: ئەو دەشتەكیانەی لە مەدینە كۆبونەتەوە لەناو خۆتان دەریانكەن.

ئەو دەشتەكیانەی كە لەكاتی كوژرانی (عوسمان)دا لە بیابانەوە هاتبون بۆ مەدینە، فەرمانی پێكردن بگەڕێنەوە بۆ شوێنەكانی خۆیان و، پێی وتن: ئەی دەشتەكیەكان! بگەنەوە بە ئاوەكانتان.

خەواریجە سەبەئیەكان ئەم فەرمانەی ئەمیری بڕوادارانیان ڕەت كردەوە و، بە هەنگاوێكی ئەویان دانا تا هەرچی و پەرچی و خەڵكە سادەكەیان لێ جودا بكاتەوە و بۆیان یەكلا بێتەوە و، تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە-كە هەرواش بوو-!.. جا هانی دەشتەكیەكانیان دا كە دەرنەچن و سەرپێچی بكەن، ئەوانیش بەقسەیان كردن.

عەلی نیشانی هاوەڵانی دا كە لە بەرامبەر سەبەئیەكاندا دەستەوسانن

(عەلی)ؓ كە بینی سەبەئی و دەشتەكیەكان بەدەنگیەوە نەهاتن، بە سەغڵەتیەوە گەڕایەوەماڵەوە، (طەڵحە) و (زوبەیر)ؓ و هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ چوونە لای.

پێی وتن: بینیتان؟ ئەوە ئێوە و ئەوە تۆڵەكەتان، دەبیستێننەوە، ئەوانە بكوژن! وتیان: ناتوانین!

ئەویش وتی:

وَلَوْ أَنَّ قَوْمِي طاوَعَتْني سَرَاتُهُمْ      أَمَرتُهُم أَمْراً يُدِيخُ الأعاديا

طەڵحە و زوبەیر داوای دەرچوون دەكەن بۆ هێنانی سەرباز

دوای ئەوە (طەڵحە)ؓ پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! ڕێم بدە بچم بۆ بەصرە، تا لەوێ هێز و سەرباز و ئەسپت بۆ بێنم یارمەتیت بدەن، تا بەسەر ئەو خەواریجە یاخیبوانەی مەدینەیان داگیركردوە زاڵ بیت.

(زوبەیر)ؓ پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، ڕێم بدە بچم بۆ كوفە، تا لەوێ سوپا و سەربازت بۆ بێنم یارمەتیت بدەن.

(عـەلی)ﷺ بـە هـەردووکیانی وت: دەرفـەتم بـدەن بـیر لـە قـسەکانتان بکەمەوە![1]

ئەوانیش لەسەر داواکردنی دەرفەت گلەییان لێی کرد و، دەیانویست ڕێیان بدات تا بچن بۆ بەصرە و کوفە سەرباز بێنن، تا لە چنگی سەبەئیەکان ڕزگاریان بێت و پەلەبکەن لە جێبەجێکردنی حەدەکان لەسەریاندا!

ئەم هەڵوێست و گفتوگۆیەی نێوان ئەو دوانە و (عەلی)ﷺ سەرەتای ناکۆکی بۆچوونەکانی نێوانیان بوو، ئەوان دەیانویست پەلەبکرێ لە سزادانی بکوژەکان و ئەویش دەیویست چاوەڕوان بکرێ هەتا بارودۆخەکە هێمن دەبێتەوە.

پاشان ڕووداوەکان بەدوای یەکدا هاتن و ناکۆکیەکان کەڵەکە بون و (عەلی)یان سەرقاڵ کرد لەوەی بتوانێ ئەم ئەرکە ئەنجام بدات، بەجۆرێك بەدرێژایی جێنشینیەکەی بۆی یەکلانەبووەوە.

لە ڕۆژانی یەکەمی جێنشینیەکەی (عەلی)ﷺ، (موغیرەی کوڕی شوعبە)ﷺ چووە لای و وەك ئامۆژگاریکار پێی وت: ئەمیری بڕواداران! تۆ مافی گوێڕایەڵی و ئامۆژگاریت لەسەرم هەیە" پەلە مەکە لە لادانی ئەو والییانەی کە (عوسمان) لەسەر وڵاتەکان داینـاون، (موعاویە) لەسەر شام بهێڵەوە و مەیگۆڕە، (ئیبن عامر) لە بەصرە بهێڵەوە و مەیگۆڕە، والییەکانی تریش لەسەر وڵاتەکانیان بهێڵەوە، دوای ئەوەی گوێڕایەڵت دەبن و بەیعەتت پێدەدەن، بە خۆیان و سەربازەکانیانەوە، ئەوا ئەوکاتە دەکرێ یان بیانهێڵیتەوە و یان بیانگۆڕیت!

بۆچوونەکەی (موغیرە)ﷺ ڕاست و دروست بوو.

(عەلی)ﷺ پێی وت: لێم گەڕێ با تەماشا بکەم و بیربکەمەوە!.

به گلەیی کردنەوە دەگەڕێتەوە

(موغیرە)ﷺ گلەیی لە (عەلی)ﷺ کرد، چونکە یەکسەر بۆچوونەکەی

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ :٤٣٧-٤٣٨ .

**وەرنەگرت و ڕاستەوخۆ كاری پێنەكرد، بە دڵشكاوی چووە دەرەوە.**

**لە ڕۆژی دوای ئەوە چووەوە لای وئەمجارەیان ئامۆژگاریكار نەبوو، بۆیە بۆچونەكەی دوێنێی هەڵوەشاندەوەو پێی وت: من وای دەبینم كە پەلە بكەیت لە لەكارخستنی (موعاویە) و (ئیبن عامر) و والیەكانی دی و، داوای بەیعەتیان لێبكەیت، تا بزانیت كێ لەگەڵتدایە و كێ لەگەڵتدا نیە، تا بزانیت كێ گوێڕایەڵە و كێ گوێڕایەڵ نیە.**

**كاتێ (موغیرە)ﷺ لەلای (عەلی) چووە دەرەوە وتی: سوێند بەخوا دوێنێ ئامۆژگاریم كرد، كاتێ كە وەری نەگرت ئەمڕۆ فێڵم لێی كرد.[1]**

**(موغیرە)ﷺ بە توڕەیی لە مەدینە بەرەو مەكە كەوتەڕێ، پاشان چوو بۆ طائف، لە هەموو فیتنەیەك خۆی بەلا دا، لەگەڵ هیچ لایەك لە لایەنەكان نەبوو: نە لەگەڵ (عەلی) بوو، نە لەگەڵ (طەڵحە) و (زوبەیر) بوو، نە لەگەڵ (موعاویە) بوو، خوا لە هەموو هاوەڵان ڕازی بێت.**

ئیبن عەباس پرسیار لە بۆچونی موغیرە دەكات

**پاش دەرچوونی (موغیرە)، (عبداللهی كوڕی عەباس)ﷺ چوو بۆ لای (عەلی)، پرسیاری دەربارەی قسەكانی (موغیرە) لێكرد.**

**(عەلی)ﷺ وتی: دوێنێ هات و ئەوەها و ئەوەهای وت، ئەمڕۆ هات ئاوەها و ئاوەهای وت!**

**(ئیبن عەباس)ﷺ وتی: ئەوەی دوێنێ ئامۆژگاری كردووی، بەڵام ئەمڕۆ فێڵی لێكردوویت!!**

بۆچونی ئیبن عەباس دەربارەی كردارەكانی عەلی

**(ئیبن عەباس)ﷺ ڕاستی وت، بەڵكو ئەوە بوو كە (موغیرە) ڕایگەیاند.**

**(عەلی) بە (ئیبن عەباس)ی وتﷺ: تۆ ڕات چی یە؟**

**(ئیبن عەباس)ﷺ ئامۆژگاری كرد و وتی: كاتێ (عوسمان) كوژرا، یان پێش كوژرانی، ڕام وابوو كە لە مەدینە دەربچیت و، بچیتەماڵەكەت لە مەككە و دەرگا لەسەر خۆت دابخەیت.**

**كە موسڵمانان لەناو خۆیان دەشێوان، لەتۆ زیاتر كەسیان نەدەدیتەوە و، دەهاتن بۆ لات و تكایان دەكرد كە جێنشینی بگریتە دەست.**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٨.

**بەڵام ئێستا، دوای ئەوەی، ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا، پاش کوژرانی (عوسمان)ﷺ، هەندێ لە بەنی ئومەییە بە کوشتنی (عوسمان) تاوانبارت دەکەن و، وا هەڵدەبەستن کە دەستت لەو کارەدا هەبووە، ئەمەش لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە.**

**ئەوانەش هەمان داواکاری بەشێك لە خەڵکی مەدینە-وەك (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ-یان هەیە لە پەلەکردن لە سزادانی بکوژانی (عوسمان) و، تۆش ناتوانیت ویستەکەیان جێبەجێ بکەیت.**

ئیبن عەباس ئامازە به هێشتنەوەی والیەکانی عوسمان دەکات

**ئەمیری بڕواداران! وادەبینم کە والیەکانی (عوسمان)ﷺ لەسەر کاری خۆیان بهێڵیتەوە، بەتایبەتی (موعاویە) لەسەر شام بهێڵیتەوە، ئەگەر ئەوە نەکەیت، دەترسم گوێڕایەڵت نەبن و لە فەرمانت دەربچن و بە کوشتنی (عوسمان) تاوانبارت بکەن.**

عەلی هەموو والیەکانی عوسمان لەکار دەخات و خەڵك بەش بەش بون

**لە وەڵامی ئامارەکەی (ئیبن عەباس)داﷺ-کە هەمان ڕای پێشوی (موغیرەی کوڕی شعبە)ﷺ بوو- (عەلی) وتی: هەر دەبێت والیەکان بگۆڕرێت و، والی دیکە لەسەر وڵاتەکان دابنرێ.**[1]

**والییە تازەکان بۆ شوێنی کارەکانیان بەڕێکەوتن، هەبوو کارەکەی کەوتە دەست و بۆی چووە سەر، هەشبوو ڕێگری کرا لە گەیشتن بە کارەکەی.**

**موسڵمانان لە وڵاتەکان بەش بەش بون، هەبوو بەیعەتی بە (عەلی) دا و چووە ژێر فەرمانیەوە، هەبوو رایدەگەیاند کە ناچێتە ژێر فەرمانیەوە تا بکوژەکانی (عوسمان)ﷺ سزا نەدات، هەبوو چاوەڕوانی دەکرد تا بزانێ کاروبارەکە بەچی دەگات.**

طەڵحە و زوبەیر لە عەلی جودا دەبنەوە

**(موعاویە)شﷺ لەوانە بوو کە سەرپێچی ڕاگەیاند تا حەد لەسەر بکوژانی (عوسمان)ﷺ جێبەجێ دەکرێت.**[2]

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٣٨-٤٣٩ .

٢ ـ سەیری درێژەی ئەمە لە (تأريخ الطبري ٤ : ٤٤٢-٤٤٤) بکە.

کاتێ (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ لەسەرخۆیی (عەلی)یان بینی لە سزادانی بکوژانی (عوسمان)داﷺ، گلەییان لێکرد و ڕایەکەیان بە ڕاست نەزانی و بۆچوونەکەیان وەرنەگرت، پاشان وایان بەباش زانی لێی جودا ببنەوە، داوای مۆڵەتیان لێی کرد تا بچن بۆ (عومرە)، ئەویش مۆڵەتی دان.

(طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ مەدینەیان بەجێهێشت بەرەو مەککە بەڕێکەوتن بۆ بەجێهێنانی (عومرە)، لەوێ چاویان بە دایکی ئیمانداران (عائیشە) کەوت، کە هەر لە کاتی جێبەجێکردنی پەرستشەکانی حەجەوە تا ئەو کاتە لە مەکە مابووەوە.[1]

حەسەنی کوڕی ئاماژەی نەجەنگان لەدژی موعاویەی بۆ دەکا

کاتێ (موعاویە)ﷺ لە شام ڕایگەیاند کە لەگەڵ بۆچوونەکەی (عەلی)دا نیە و، بەیعەتی پێنادات تاوەکو سزای بکوژانی (عوسمان)ﷺ نەدرێت، (عەلی)ﷺ پێی وابوو کە دروست نیە بۆ (موعاویە) و سەربازەکانی وا بکەن، بەیعەت دان بە ئەمیری بڕواداران واجبە، پێویستە لەسەر ئوممەت گوێڕایەڵ و ملکەچی بن و، نابێت داری گوێڕایەڵی لەت بکرێت.

هەرچەندە (موعاویە)ﷺ و خەڵکی شام ئەمەیان بە ئیجتهاد کرد، بەڵام بۆچوونەکەیان لەلای (عەلی) قبوڵ نیە، لەبەر ئەوە پێویستە بگێڕدرێنەوە ژێر گوێڕایەڵی ئەمیری بڕواداران و یاخیبونەکەیان نەهێڵرێ.

بۆچونی طەڵحە و زوبەیر و عائیشە لە دەرچوون لە فەرمانی عەلی

لەبەر ئەوەی خەڵکی شام لە فەرمانی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ دەرچوون و گوێڕایەڵی نەبوون، ئەویش سوپایەکی بۆ جەنگ کردن لە دژیان ئامادەکرد، جا داوای لە والیەکانی بەصرە و کوفە و میصریش کرد کە خەڵك ئامادەبکەن بۆ جەنگان لەدژی خەڵکی شام.

(حەسەن)ی کوڕیﷺ چووە لای و داوای لێکرد کە لەسەرخۆ بێت و دەست بە جەنگان لەدژی خەڵکی شام نەکات و، نەرم و نیان بێت لەگەڵیان، ئەوانە دوای نەمانی گومانەکان دێنە ژێر فەرمانیەوە، بەڵام (عەلی) قسەکەی ڕەت کردەوە، هەروەك قسەی ئەوانی تریش ڕەت کردەوە کە هەمان

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٤٤

ئامازەکەی (حەسەن)یان پێدا، وەك (زیادی کوڕی حەنظەلەی تەمیمی).[١]

پێش ئەوەی (عەلی)ﷺ بکەوێتە ڕێ بۆ جەنگی خەڵکی شام، چەند هەواڵێکی بێزارکەری لە مەکەوە پێگەیشت، کە (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ﷺ کۆبونەتەوە لەسەر ئەوەی داوا لە (عەلی) بکەن پەلەبکات لە سزادانی ئەو بکوژانەی ئێستا لەناو سوپاکەیدان.

لەسەرخۆیی و دواخستن لە جێبەجێکردنی حەد و بەجێهێنانی ئەو ئەرکەیان لەسەر (عەلی)ﷺ گرتبوو، بەڵگە و ئیجتهاد و بۆچونەکەیان لەوەدا پەسەند نەکرد.

ئەم ئیجتهادەیان وای لێکردن کە داوای پەلەکردن لەو کارە لە (عەلی) بکەن و، هانی خەڵك بدەن بۆ داواکردنی ئەو کارە و، خەڵك کۆبکەنەوە و کۆمەڵیان بکەن و بۆ ئەو مەبەستە بیانوروژێنن، تا فشار بخەنە سەر (عەلی) و داوای جێبەجێکردنی حوکمی خوای لێ بکەن بەسەر بکوژەکاندا، وای لێهات (عائیشە) وتاری بۆ موسڵمانان دەدا و هانی دەدان بۆ داواکردنی سزادانی بکوژەکان.

خەڵك لە مەککە لە دەوری (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ﷺ کۆبونەوە و هەموو ڕێکەوتن لەسەر داواکردنی ئەمە لە (عەلی) و، ڕایان هاتە سەر ئەوەی بۆ ئەم مەبەستە بەرەو بەصرە دەربچن.

عائیشە لەسەر حوشترەکەی لەگەڵ طەڵحەو زوبەیر بەرەو بەصرە بەڕێ دەکەون

حوشترێکیان بۆ (عائیشە) ئامادەکرد، کە ناوی (عەسکەر) بوو، تا بۆ بەصرە سواری بێت، ئەو حوشترە (یەعلی کوڕی ئومەییە) لە یەمەن کڕیبووی، دایکانی دیکەی بڕواداران ڕازی نەبون لەگەڵ (عائیشە) بەرەو بەصرە دەربچن، (طەڵحە)و (زوبەیر)و (عائیشە)ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیاندا بون بەپەلە بەرەو بەصرە کەوتنە ڕێ.

(عائیشە)-خوای لێ ڕازی بێ- دەیوت: (عوسمان) بە ستەم لێکراوی کوژرا، کاروبار ڕاست نابێتەوە هەتا فەرمان و دەسەڵات بەدەست ئەو

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٤٤-٤٤٥

**ئاژاوەچی و خەواریجانەوە بێت، جا داوای خوێنی (عوسمان) بکەن، سزای بکوژەکانی بدەن، ئیسلام سەربەرز دەکەن.**

جێنشینایەتی عەلی ڕەت ناکەنەوە، بەڵکو داوای جێبەجێ کردنی حەد دەکەن

**مەبەستی دیاریکراوی (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ﷺ: داواکردنی خوێنی (عوسمان)ﷺ و، داواکردن لە (عەلی)ﷺ بە دادگایی کردن و سزادانی بکوژەکان و، تۆڵەسەندنەوە لێیان لەسەر تاوانەکەیان بوو.**

**فەرمانڕەوایی (عەلی)یانﷺ ڕەت نەکردبووەوە و، بەیعەتەکەیان بۆی نەشکاندبوو و، داوای لابردن و لەکارخستنیان نەکردبوو و، لە فەرمانی دەرنەچووبون.**

**بەڵکو لێی ڕازی نەبون، بەهۆی دواکەوتنی لە سزادانی خەواریجە بکوژەکان و، ڕازیبونی بەوەی لە سوپاکەیدا بن.**

**(عەلی) بەم هەڵوێستەی (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ﷺ ڕازی نەبوو، هەروەکو لەوەوپێش لە هەڵوێستی (موعاویە)ﷺ و شامییەکان ڕازی نەبوو و، بە یاخیبون لە ئەمیری بڕواداران و دەرچوون لە فەرمانی و پەرتەوازەکردنی موسڵمانانی دانا.**

**پێی وابوو دەبێت ئەم یاخیبون و دەرچوونە لابرێت و جەنگ لەگەڵ ئەو هاوەڵانە بکرێت هەتا دەگەڕێنەوە بۆ گوێڕایەڵی و ڕیزی کۆمەڵ، دوای ئەوە یەکلا دەبێتەوە بۆ سزادانی بکوژانی (عوسمان)ﷺ.**

**بەهۆی دەرچوونی (طەڵحە) و (زوبەیر)و (عائیشە)ﷺ، (عەلی)ﷺ خۆی ناچاربوو جەنگی سەرپێچیکارانی لە شام دوابخات و، دەست بکات بە جەنگ لەگەڵ سوپای (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ بۆ گێڕانەوەیان بۆ ژێر فەرمانی خۆی.**

بەرەو جەنگیان دەچێت

**عەلی، (عبداللەی کوڕی عومەر)ی بانگ کردﷺ و هانیدا تا لەگەڵی دەربچێت بۆ جەنگی یاخیبوان، (عبداللە) ئەوەی ڕەت کردەوە و، پێی وت: بەڵکو من پیاوێکم لە خەڵکی مەدینە، لێیان دانابڕێم، ئەگەر دابنیشن دادەنیشم، ئەگەر دەرچن دەردەچم.**

ئیبن عومەر و زۆربەی هاوەڵان لەگەڵ جەنگدا نین، نە لەگەڵ عەلی و نە

**(عەلی)ﷺ هانی هاوەڵان دا لەگەڵیدا دەربچن و فەرمانی پێکردن**

دوابەدوای گوێڕایەڵی و بەیعەتپێدانی پێشوویان سەریشی بخەن، بە گوێڕایەڵییان رازی نابێ هەتا لەگەڵی هەڵنەستن و بەسەری نەخەن و، لەگەڵیدا جەنگی ئەوانە نەکەن کە دژی وەستاون و سوپایان بۆ جەنگ کردنی ئامادەکردوە!

بەڵام زۆربەی هاوەڵان بەچاکیان نەزانی لەگەڵی دەربچن بۆ جەنگی ئەو برایانەی کە لە بۆچون و ئیجتهاددا جیاواز بەیەکن، وەکو (طەڵحە) و (زوبەیر) و (موعاویە)ﷺ، بەباشیان نەزانی موسڵمانان خۆبەخۆ بجەنگێن، ئەو روداوە یەك لەدوای یەکانەی نێوان عەلی و سەرپێچیکارانیان بە فیتنە و ئاژاوە دانا، کە تێکەڵ بونی دروست نیە، ئەوەبوو خۆیان بەدوور گرت و بەشدارییان نەکرد.

(شەعبی) دەڵێت: سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك نیە ئەو نەبێت، لە هاوەڵانی بەدر تەنها شەش کەس لە فیتنەکەدا لەگەڵ (عەلی) دەرچوون و حەوتەمیان نەبوو، یان حەوت کەس بون و هەشتەمیان نەبوو.[1]

هاوەڵان سێ کۆمەڵ بون، زۆربەیان لەگەڵ دانیشتندا بون

موسڵمانان سەرسام و دوودڵ بوون، ئایا لەگەڵ (عەلی)داﷺ بجەنگن کە خاوەنی فەرمانە و سەرپێچیکاران بگەڕێننەوە ژێر فەرمان؟ یان جەنگی سەبەئیە تاوانبارەکانی بکوژانی (عوسمان)ﷺ بکەن کە لە ریزی سوپاکەی (عەلی)دان، بەمەش ئەوان جەنگی (عەلی) ئەمیری بڕواداران دەکەن؟ یان خۆیان لە هەردوو کۆمەڵ دابڕن و، بەشداری ئەو فیتنە و ئاژاوە کوێرانەیە نەکەن؟

هاوەڵان بون بە سێ کۆمەڵەوە" ئەگەریش زۆرینەیان ئەوانەبون کە سێیەمیان هەڵبژارد و خۆیان لە فیتنە و ئاژاوە دابڕی.

بۆ گێڕانەوەی سەرپێچیکارەکانی بەصرە بۆ ژێر فەرمانی خۆی، (عەلی)ﷺ بە سوپاکەیەوە لە مەدینە رووی کردە ئەوێ، لەگەڵ ئەویشدا هەموو خەواریجە سەبەئیەکان کە لە مەدینە بون لەگەڵی دەرچوون و، لە

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٤٧ .

سەرووی هەمووشیانەوە شەیتانی گەورەیان (عبداللەی کوڕی سەبەء).

عبداللەی کوڕی سەلام ئامۆژگاری عەلی دەکات کە دەرنەچێت

پێش دەرچوونی (عەلی)ﷺ لە مەدینە، (عبداللەی کوڕی سەلام)ﷺ پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران! لە مەدینە دەرمەچۆ، سوێند بەخوا ئەگەر لێی دەربچیت بۆی ناگەڕێیتەوە و، دەسەڵاتی موسڵمانانیش هەرگیز بۆی ناگەڕێتەوە.

(عەلی) کاری بە راوێژەکەی (ئیبن سەلام) نەکرد و رەتی کردەوە.[1]

حەسەنی کوڕی عەلی گلەیی لە باوکی دەکات

(عەلی)ﷺ سوپاکەی لە (رەبەذە) دامەزراند وەك خۆئامادەکردنێك بۆ رۆیشتن بەرەو بەصرە، لەوێ (حەسەن)ی کوڕی چووە لای و پێی وت: باوکەگیان! من پێم وتی بەڵام بەقسەت نەکردم، ئێستاش تۆ بەرەو عێراق دەردەچیت، بەیانی لە زەوی ونبوندا بەبێ پشتیوان دەکوژرێی!!

(عەلی)ﷺ پێی وت: چیت پێم وتوە و بەقسەم نەکردویت؟

(حەسەن)ﷺ وتی: کاتێ گەمارۆ خرایە سەر (عوسمان) پێم گوتی کە لە مەدینە دەربچی، تاوەکو لەکاتی کوشتنی (عوسمان)دا لە مەدینە نەبیت، تا بەوە تاوانبار نەکرێیت، پاشان ئەو رۆژەی (عوسمان) کوژرا پێم گوتی بەیعەت قەبووڵ نەکەیت هەتا نوێنەری هەموو شار و وڵاتەکان دێنە لات، دوای ئەوە کاتێك (طەڵحە) و (زوبەیر) لە فەرمانت دەرچوون پێم گوتی لەماڵی خۆت دانیشە هەتا چاك دەبنەوە، ئەوا ئەگەر خراپەکاریەك بکەوتایە نێوان موسڵمانان، لەسەر دەستی کەسێکی دیکە دەبوو!!

عەلی بۆچوونی خۆی بۆ دەخاتە روو

(عەلی)ﷺ وەڵامی دایەوە و وتی: بۆ ئەوکاتەی گەمارۆی (عوسمان) درابوو، ئێمەش وەك ئەو گەمارۆ درابووین، بۆ بەیعەتەکە، فەرمان فەرمانی خەڵکی مەدینەیە و، پێمان ناخۆش بوو کاروبارەکە بەزایەبچێ و موسڵمانان بێ پێشەوا بمێننەوە. بەڵام سەبارەت بە دەرچوونی (طەڵحە) و (زوبەیر)، چی بکەم لەوەی لەسەرم پێویست بووە، ئەی داوام لێنەکراوە موسڵمانان ملکەچ بکەم و دەرچوان بگەڕێنمەوە؟ دەتەوێ چۆن بم؟ ئایا دەتەوێ وەك ئەو کەمتیارە بم کە چواردەورەی دەگیرێت، پاشان پەلەکانی

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٤٧ .

دەکرێتەوە و دەردەکرێت و ڕاودەکرێت؟.

ئەگەر بە ئەرکی خۆم هەڵنەستم لەوانەی لەسەرم پێویست بووە لە فەرمانڕەوایەتی موسڵمانان، ئەی کێ پێی هەڵدەستێ.[1]

سەرسامی و دوودڵی تاریقی کوڕی شەهاب: لە فیتنەدا چی بکات

کاتێ (عەلی)ﷺ لە (ڕەبەذە) بوو، (تاریقی کوڕی شەهاب) بەلایدا تێپەڕی، کە سوپاکەی بینی وتی: ئەوە چی‌یە؟ وتیان: ئەوە ئەمیری بڕوادارانە!

وتی: چی دەوێت؟

وتیان: (طەڵحە) و (زوبەیر) لە فەرمانی دەرچوون، ئەویش دەیەوێت بیانگەڕێنێتەوە ژێر فەرمان!

ئەم کارە سەرسامی و دودڵیی زۆربەی موسڵمانانە

وتی: إنا لله وإنا إليه راجعون! ئایا بچمە پاڵ (عەلی) و جەنگی ئەو دوو پیاوە و دایکی ئیمانداران بکەم؟ یان لە (عەلی) جودا ببمەوە و لەگەڵی نەجەنگێم؟ سوێند بەخوا ئەمە زۆر سەختە و، ئەوەش هەر سەختە!!![2]

قسە و دودڵییەکەی (تاریقی کوڕی شەهاب) هەر ئەوەبوو کە زۆربەی موسڵمانان لە هەموو لایەك، لە هاوەڵ و شوێنکەوتوان دەیانبینی و هەستیان پێدەکرد! ئایا لەگەڵ عەلی بجەنگن؟ یان لە دژی (عەلی) بجەنگن؟ یان دانیشن و پشتیوانی (عەلی) نەکەن؟ هەموو ئەمانە شیرینترینیان تاڵە!

پێش گەیشتنی سوپای (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ بۆ بەصرە، (مەلیحی کوڕی عەوفی سەلەمی) بەلایاندا تێپەڕی و بە (زوبەیر)ی وتﷺ: ئەبو عبدالله! ئەوە چیە؟

زوبەیر ئامانجەکەیان بۆ مەلیحی سەلەمی ڕوون دەکاتەوە

(زوبەیر)ﷺ وتی: ستەمیان لە ئەمیری بڕواداران (عوسمان) کرد و، بەبێ هیچ تۆڵە و بیانوویەك کوشتیان.

وتی: ئەوانەی کوشتیان کێن؟

(زوبەیر)ﷺ وتی: ئاژاوەچییانی وڵاتەکان و ئەو هۆزانەی مەیلیان

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٥٦ .

٢ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٥٦ .

بەلای ئەواندا بوو، لەگەڵ دەشتەکیەکان و کۆیلەکان کە پشتیوانیان کردن و سەریانخستن.

وتی: ئەی ئێوە چیتان دەوێ؟

(زوبەیر) وتی: بۆ ئەم کارە خەڵك هەڵدەستێنین و هانیان دەدەین، بۆ ئەوەی داوای خوێنی (عوسمان) بکەن تا خوێنی بەزایە نەچێت و ون نەبێت، چونکە بەزایەدانی، سووککردنی دەسەلاتی خودایە لە ناومان، ئەگەر خەڵك لە نموونەی ئەمانە دانەبڕێن، ئەوا هیچ پێشەوایەکی موسڵمانان نامێنێ ئەو دەستە خەڵکە نەیکوژن.

(مەلیح) وتی: سوێند بەخوا وازهێنان لە خوێنی (عوسمان) شتێکی قورسە، بەڵام ئێوە نازانن ئەم کارە بەرەو کوێ دەڕوات!!![1]

کاتێ سوپای (طەڵحە)و (زوبەیر)ﷺ گەیشتنە دەوروبەری بەصرە، والی بەصرە (عوسمانی کوڕی حەنیف) بوو، (عوسمان) هاوەڵی بەڕێز (عەمرانی کوڕی حەصین)ی نارد تا هەواڵەکە بزانێ.

(عەمرانی کوڕی حەصین) دەربارەی هۆی هاتنی لەگەڵ ئەو سوپایەدا پرسیاری لە (عائیشە) کرد.

عائیشە کارەکە بۆ عەمرانی کوڕی حەصین روون دەکاتەوە

(عائیشە)-خوای لێ‌ڕازیبێ- وتی: ئاژاوەچییانی وڵاتان و لارو وێری هۆزەکان هێرشیان کردە سەر حەرەمی پێغەمبەری خواﷺ و، کارەساتی ترسناکیان تێدا ئەنجام دا، بیدعەچی و لەڕێ‌دەرچوویان تیادا جێگیر کرد، بەمە نەفرەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان لەسەر پێویست بوو، بە ناهەق پێشەوای موسڵمانانیان کوشت، بەمە خوێنی حەرامیان حەڵاڵ کرد و،ماڵی حەرامیان تالان کرد و، شاری حەرام و مانگی حەرامیان حەڵاڵ کرد و، ناموس و ئابڕوویان دڕاند و، لەناو خەڵکی مەدینە نیشتەجێ بون، ئەگەرچی خەڵکی مەدینە حەزیان بە مانەوەیان نەبوو و، ڕەتیان دەکردنەوە و، بەهۆی ئەوانەوە زیانیان لێکەوتبوو، بەڵام ناتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە و دەریان بکەن، منیش دەرچووم بۆ ناو موسڵمانان تا پێیان ڕابگەیەنم کە

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٦١ .

ئەو خەڵکە چی دەکەن و، چی پێویستە لەسەریان بۆ چاککردنی ئەم کارە بیکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لاَ خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلاَّ مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلاَحٍ بَيْنَ النَّاسِ: زۆربەی سرتەو چپەکەیان بەهرەی نیە، مەگەر باسی خێرات و کاری ڕەواو پێکهێنانەوەی مەردم بێ﴾النساء/١١٤.

جا ئێمە بە چاکسازی هەڵدەستین، و فەرمانی خوا و فەرمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەر گەورە و بچووك و، نێر و مێ جێبەجێ دەکەین. ئێمە فەرمانتان پێدەکەین بە چاکە و هانتان دەدەین لەسەری، یان ڕێگریتان لێ دەکەین لە خراپە و بۆ گۆڕینی هانتان دەدەین.

کاتێ (عیمرانی کوری حەصین) گوێبیستی بیانووی (عائیشە) بوو رووی کردە (طەڵحە) و پێی وت: چی تۆی هێناوەتە بەصرە؟

(طەڵحە)رضي الله عنه وتی: بۆ داواکردنی خوێنی (عوسمان).

وتی: ئەی بەیعەتت بە (عەلی) نەدا؟

(طەڵحە) وتی: بەڵێ بەیعەتم پێدا و شمشێر لەسەر گەردنم بوو، من بەیعەتەکەم بۆی ناشکێنم و، جەنگی لەگەڵ ناکەم ئەگەر ڕێگەی نێوان ئێمە و بکوژانی (عوسمان) نەگرێت، ئێمە هیچمان ناوێت تەنها تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان) نەبێت!

دوای ئەوە (عیمران) چووە لای (زوبەیر)رضي الله عنه هەمان پرسیاری (طەڵحە)ی لێکرد، (زوبەیر)یش هەمان وەڵامی (طەڵحە)ی دایەوە.

عیمران ئامۆژگاری عوسمانی کوڕی حەنیف بە دانیشتن دەکات

(عیمرانی کوڕی حەصین) گەڕایەوە بۆ لای والی (عوسمانی کوڕی حەنیف) و، ڕاپۆرتی خۆی دەربارەی ئامانجی (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ی رضي الله عنها پێشکەش کرد، پاشان پێی وت: سوێند بەخوا جەنگ هەڵتاندەتەکێنێ بە هەڵتەکاندنێکی دوورودرێژ، دوای جەنگەکە ئەوەی لەئێوە دەمێنێتەوە شتێکی زۆر ناهێنێت!!!

(عوسمان) پێی وت: عیمران! پێم بڵێ چی بکەم؟

وتی: من دانیشتووم، تۆش دانیشە!

(ئیبن حەنیف) وتی: بەڵکو ڕێیان لێدەگرم وجەنگیان لەگەڵ دەکەم هەتا فەرمانی ئەمیری بڕواداران دێت.

دابەش بونی خەڵکی بەصرە و بەیەك گەیشتنیان لە مەربەد

سوپاکەی (طەڵحە) و (زوبەیر)ﭭ گەیشتنە (مەربەد)ی تەنیشت بەصرە، (عوسمانی کوڕی حەنیف) بۆیان دەرچوو تا نەهێڵێ بچنە ناو بەصرەوە، ئەوانەی هاتبون قسەیان کرد و هەواڵی ئامانجەکانیان دا، (طەڵحە) قسەی کرد و، (زوبەیر) قسەی کرد و، (عائیشە) قسەی کردﭭ.

موسڵمانان جیاڕابوون، هەندێکیان پشتگیری (طەڵحە)یانﭬ کرد و ئەوانەش کە لەگەڵیدان چوونە ریزیانەوە، هەندێکیش پشتیوانی ئەوانیان نەکرد و لەگەڵ (عوسمانی کوڕی حەنیف) مانەوە و، هەندێکیش لەماڵی خۆیان دانیشتن!![1]

هەردوو کۆمەڵ لە بەرامبەر یەکتریدا

لایەنگرانی (طەڵحە) و (زوبەیر)ﭭ کۆبونەوە و، لایەنگرانی (عوسمانی کوڕی حەنیف)یش کۆبونەوە و، هەردولا بەرامبەر یەکتر وەستان و، (فم السکە) لە نێوانیاندا بوو، جا هیچ پێکدادانێك لەنێوانیان روی نەدا.

سەبەئیەکان جەنگ لەنێوان هەردوو لا هەڵدەگیرسێنن

سەبەئیە بکوژەکانی (عوسمان)ﭬ کە لە بەصرە بون بە سەرکردایەتی (حەکیمی کوڕی جەبەلە) بەمە رازی نەبون.

(حەکیمی کوڕی جەبەلە) و هەرچی لەگەڵیدا بوو لە سواری وڵاخەکانیان دەرچوون و لە (فم السکە) جەنگیان لەنێوان هەردوو لا هەڵگیرساند، (حەکیم) قسەی ناشیرینی بە دایکی ئیمانداران (عائیشە) دەوت و جوێنی پێدەدا، یەکێك لە موسڵمانان ڕێگری ئەوەی لێکرد، ئەویش یەکسەر کوشتی، ئافرەتێکی موسڵمانیش ڕێگری جوێندانی لێکرد ئەویشی کوشت.

بە دەستی سەبەئیەکان هەر لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ جەنگ لەنێوان هەردوو لا هەڵگیرسا، لە هەردوو لا کوژراو و بریندار هەبوو.

پاشان هەندێ لە دانایان هەوڵیان دا بۆ ڕاگرتنی جەنگ و ڕێکەوتنی

---

[1] تأريخ الطبري ٤ :٤٦١-٤٦٤.

ئەرکی کەعبی کوڕی سور لە

**کاتی لەنێوانیاندا، هەردوو لا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی هەرلایەیان لە شوێنی خۆی بمێنێ و شەڕ بە لایەکی تر نەفرۆشێت.**

**لەسەر ئەوە پێکهاتن کە (کەعبی کوڕی سور) بنێرن بۆ مەدینە، تا پرسیار دەربارەی بەیعەتی (طەڵحە) و (زوبەیر) بۆ (عەلی)ﷺ و، بارودۆخی خەڵکی مەدینە بکات، ئەگەر بە ڕەزامەندی خۆیان بەیعەتیان دابوو، ئەوە دەبێ لە بەصرە دەربچن، ئەگەر بەزۆر بەیعەتیان دابێت لە بەصرە دەمێننەوە و، (عوسمانی کوڕی حەنیف) لێی دەردەچێت.**

**قازی (کەعبی کوڕی سور) گەیشتە مەدینە و خەڵك لێی کۆبونەوە، وتی: ئەی خەڵکی مەدینە! من نێردراوی خەڵکی بەصرەم بۆ لای ئێوە، ئایە (طەڵحە) و (زوبەیر) بەزۆر بەیعەتیان داوە یان بە ئارەزووی خۆیان؟**

**خەڵك بێدەنگ بون، کەس وەڵامی نەدایەوە تەنها (ئوسامەی کوڕی زەید)ﷺ نەبێت، کە وتی: بەزۆر بەیعەتیان داوە و، زۆریان لێکرا بەیعەت بدەن!!**

**بەهۆی قسەکەی (ئوسامە)وە ناکۆکی کەوتە نێوان خەڵکی مەدینە.[1]**

**کاتێ (عەلی) بەوەی زانی کە لە مەدینە چی ڕوویداوە–و لەو کاتەدا لەڕێگە بوو بەرەو بەصرە– وتی: ئەوان زۆریان لێنەکراوە بۆ بەش بەش بون و ناکۆکی، بەڵکو زۆریان لێکراوە بۆ کۆمەڵبون و چاکە، بە ئامانجی یەکدەنگی موسڵمانان، ئەگەر ئەوان بیانەوێ بەیعەتەکەیان هەڵبوەشێننەوە، ئەوە هیچ بیانوویەکیان نیە، ئەگەر شتێکی تریشیان دەوێت ئەوا لێی دەکۆڵینەوە.![2]**

عوسمانی کوڕی حەنیف لە بەصرە دەرکرا

**دوای ئەوە پێکدادان لەنێوان هەردوو بەرە" سوپای (طەڵحە) و سوپای (عوسمانی کوڕی حەنیف) ڕوویدا، سوپای (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ والی بەصرە (عوسمانی کوڕی حەنیف)یان دەسگیر کرد و دەریان کرد بۆ لای**

---

١ تأريخ الطبري ٤ : ٤٦٦-٤٦٨ .

٢ تأريخ الطبري ٤ : ٤٦٨ .

(عەلی).

پاش دەرکردنی (عوسمانی کوڕی حەنیف) لە بەصرە، ئەو خەواریجە سەبەئیانەی تێدا مایەوە کە بەشداری کوشتنی (عوسمان)یانﷺ کردبوو.

جەنگ لەگەڵ سەبەئییەکانی بەصرە

(حەکیمی کوڕی جەبەلە)ی سەرکردەی سەبەئیەکانی بەصرە بە خۆی و سێسەد کەسەوە لەوانەی بۆ سەر (عوسمان) دەرچوون، لەگەڵ ئەو دەشتەکی و هەرچی و پەرچیانەی کە هاوڕایان بوون، دەرچوون بۆ جەنگی (طەڵحە) و (زوبەیر).

هەردوو بەرە لای (دار الرزق) لە (زابوقە)ی بەصرە پێکگەیشتن.

(عائیشە)-خوای لێڕازیبێ- وتی: تەنها ئەوانە بکوژن کە لەدژتان دەجەنگن.

بانگکەری (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ هاواری کرد: هەرکەس لە بکوژانی (عوسمان) نیە با وازمان لێبهێنێ، ئێمە تەنها دەمانەوێ بکوژانی (عوسمان) بکوژین.

کاتێ هەردوو سوپاکە ڕوبەڕوو بونەوە، (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ وتیان: سوپاس بۆ خوا کە تۆڵەی ئێمەی لە بکوژانی (عوسمان) لە بەصرە بۆ کۆکردوینەتەوە، خوایە پارچەپارچەیان بکە و بیانکوژە و کەسیان لێ مەهێڵەوە.

کوژرانی هەموو سەبەئیەکان تەنها یەکێکیان نەبێت

جەنگێکی توند ڕوویدا و بە کوژرانی تاوانباری سەبەئی (حەکیمی کوڕی جەبەلە) و هەرچی لەگەڵیدا بون کۆتایی هات، کەسیان لێ دەرباز نەبوو تەنها یەك پیاو نەبێت کە بەشداری کردبوو لە گەمارۆدانی (عوسمان)ﷺ، ئەویش (حورقوصی کوڕی زوهەیری سەعدی) بوو، کە لە بەصرە هەڵهات بۆ ناو هۆزەکەی خۆی کە (بەنی سەعد) بوو، لەوێ خۆی پەنا دا.

پاککردنەوەی بەصرە لە سەبەئیەکان

کاتێ (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ هەواڵیان نارد بۆ (بەنی سەعد) تا (حورقوص) بدەن بەدەستەوە، تا بەهۆی تاوانەکەی لە دژی (عوسمان)ﷺ بیکوژن، هۆزەکەی لەڕووی دەمارگیرییەوە پاراستیان و بۆ تۆڵەسەندنەوە

نەیاندا دەستەوە.

پاش شکست هێنانی سەبەئیەکانی بەصرە لە بەرامبەر (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ، بانگکەرێك لە بەصرە بانگی کرد: هەرکەسێ لەناو تیرەکەیدا کەسێك هەیە لەوانەی هێرشیان کردە سەر مەدینە و بەشداری گەمارۆی سەر (عوسمان) و کوشتنیان کردووە، با بۆمانی بهێنێ.

جا خەڵکی بەصرە هەر وەکو سەگ ئەو خەواریجە سەبەئیانەیان دەهێنا، هەموویان کوژران و کەسیان دەرباز نەبوو تەنها (حورقوص) نەبێت.

بەمە بەصرە لە سەبەئییەکان پاك بوویەوە و، (طەڵحە) و (زوبەیر) و (عائیشە)ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیاندا بون بەشێکی ئامانجەکەیان، لە تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)ﷺ و کوشتنیان، بەدەست هێنا.[1]

عەلی لە (ڕەبەذە)دا نەخشەی خۆی بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ سەرپێچیکارانی ڕوون دەکاتەوە

(عەلی)ﷺ کاتێ لەگەڵ سوپاکەیدا لە (ڕەبەذە)دا بون، نەخشەی خۆی بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ سەرپێچیکارانی ڕوونکردەوە، یەکێك لە سەربازەکان پرسیاری لێکرد: ئەی ئەمیری بڕواداران! دەتەوێ چی بکەیت؟

وتی: دەمانەوێ و نیەتمان چاکسازییە، ئەگەر ئەوەمان لێ وەرگرن و بەدەنگمانەوە بێن.

پێی وت: ئەگەر بە دەنگمانەوە نەهاتن؟

(عەلی)ﷺ وتی: لەگەڵ بیانوو و ئیجتهادی خۆیان لێیان دەگەڕێین و، هەقی خۆیان پێ دەدەین و ئارامیان لەسەر دەگرین.

وتی: ئەگەر بەوەشمان ڕازی نەبون؟

(عەلی) وتی: وازیان لێدەهێنین ئەگەر وازمان لێ بهێنن.

وتی: ئەگەر وازیان لێمان نەهێنا؟

(عەلی) وتی: خۆمان لێیان دەپارێزین و بەرگری لە خۆمان دەکەین.[2]

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٧٠ – ٤٧٢ .

٢ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٨١–٤٨٢ .

**(عەلی)ﷺ بە سوپاکەیەوە لە (ڕەبەذە)وە بەرەو بەصرە بەڕێکەوت، بەلای (فەید)دا تێپەڕی، پاشان بەلای (ثەعلەبیە)دا و، ئینجا بەلای (ذی قار)دا.**

دوو نوێنەرەکەی عەلی بۆ خەڵکی کوفە

**لە (ذی قار)دا (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) و (موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوطالب)ی نارد بۆ کوفە، تا خەڵکەکەی ڕاپەڕێنێت بۆ دەرچوون بۆ جەنگ لە دژی سەرپێچیکارانی (عەلی)، لە دوای ئەوانیش (ئەشتەری نەخەعی) نارد بۆ لایان.**

والی کوفە ئەبوموسای ئەشعەری لەگەڵ جەنگ نەکردنە

**ئەمیری کوفە (ئەبوموسای ئەشعەری)ﷺ بوو، کە لەگەڵ خۆدوورخستن لە فیتنەی نێوان موسڵمانان بوو، بۆیە ئامۆژگاری خەڵکی کوفەی کرد دابنیشن.**

**کاتێ هەردوو نوێنەرەکەی (عەلی) گفتوگۆیان لەگەڵدا کرد، پێی وتن: ئەگەر هەردەبێ بجەنگین، ئەوا لەگەڵ (عەلی) ناجەنگین هەتا تۆڵە لە بکوژانی (عوسمان) نەسەنێتەوە و حەدیان لەسەر جێبەجێ نەکات!!.[1]**

**هەردوو نێردراوەکەی (عەلی) لە کوفە بەبێ ئەنجام گەڕانەوە، (عەلی) لەجیاتی ئەوان (حەسەن)ی کوڕی و (عەمماری کوڕی یاسر)ی ناردﷺ بۆ ڕاپەڕاندنی خەڵکی کوفە.**

**(حەسەن)ﷺ هات و گفتوگۆی لەگەڵ (ئەبوموسا)ﷺ کرد.**

عەممار و حەسەن گفتوگۆ لەگەڵ ئەبوموسا دەکەن

**پێی وت: ئەبوموسا! بۆچی خەڵکی لەئێمە سارد دەکەیەوە؟ سوێند بەخوا ئێمە تەنها چاکسازیمان دەوێ و، ئەمیری بڕواداران ترسی لە هیچ نیە.**

**(ئەبوموسا)ﷺ وتی: دایك و باوکم بە قوربانت بێت، ڕاست دەکەی، بەڵام ڕاوێژپێکراو ئەمیندارە، منیش گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بووە دەیفەرموو: ((فیتنە و ئاژاوەیەك ڕوودەدات، دانیشتوو تیایدا چاکترە لەوەی بەپێوەیە، ئەوەی بەپێوەیە چاکترە لەوەی دەڕوا، ئەوەی دەڕوا چاکترە لەوەی بە سوارییە.)) خوای گەورە کردووینی بە برا، خوێن و ماڵمانی لێ حەرام کردوین، هەروەك دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٦٨ .

اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا: ئەی گەلی بڕواداران! ماڵ و دارایی یەکتری- لەخوت وخۆڕایی- مەخۆن مەگەر بە سەودا و مامەڵە و ڕازی بون لەنێوان خۆتان" کە ئەوسا پێتان ڕەوایە، بە هەق نەبێ نابێ یەکتریش بکوژن، خودا دەربارەی هەموتان دلۆڤانە﴾النساء/٢٩.

هەروا دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ: هەرکەسێك هەر لە ئانقەست بڕوادارێك بکوژێ، لەبری ئەوە لەناو دۆزەخ دایە﴾النساء/٩٣.

وتاری ئەبوموسا بۆخەڵکی کوفە

دوای ئەوە (ئەبوموسای ئەشعەری)ﷺ وتارێکی بۆ خەڵکی کوفە دا و تیایدا وتی: بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، ئەوانەی لە چەندین شوێن لەگەڵیدا بون، زاناترن بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی لەوانەی کە لەگەڵیدا نەبون، بێگومان ئێوە مافێکتان لەسەر من هەیە، و منیش ئەو مافەتان دەدەمێ، پێشتر بۆچونم وابوو کە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی خوا بە سوك نەگرن و، بێترس نەبن بەرامبەر خوا و، هەرکەس لە مەدینەوە هات بۆ لاتان بیگەڕێننەوە بۆ مەدینە، هەتا لەسەر پێشەوایەك کۆدەبنەوە، خەڵکی مەدینەش زاناترن بەوەی کێ لەئێوە بۆ پێشەوایەتی دەشێت، جا ئێوە خۆتان لەو کارە هەڵمەقورتێنن.

ئەبو موسا ئامۆژگاریان دەکات بە نەجەنگان لە کاتی فیتنەدا

خەڵکینە! گوێڕایەڵم بن، دەبنە بنەڕەتێك لە بنەڕەتەکانی عەرەب} واتە لەنێوان وڵاتەکانی تردا دەبنە بنەڕەتی ئاشتی و ئاسودەیی،{ستەم لێکراو پەناتان بۆ دێنێ، ترساو لەناوتان دڵنیا دەبێت، ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ زاناترین بەوەی کە بیستوومانە، فیتنە و ئاژاوە ئەگەر هات گوماناوی دەبێت و روون نابێت، ئەگەر ڕۆیشت ئینجا روون و ئاشکرا دەبێت.

ئەم فیتنە و ئاژاوەیەش وەك ژانەسك وایە، بای باکور و باشوور و بای (صەبا) و (دەبور) دەیهێنێ و دەیبات، هەندێك جاریش هێمن دەبێتەوە، کەس نازانێ لە کوێوە هەڵدەکات، مرۆڤی نەرم ونیان سەرسام دەکات.

شمشێرەکانتان بخەنە کێلان و، نوکی ڕمەکانتان لێبکەنەوە و، تیرەی کەوانەکان بپچڕێنن و، دالّدەی ستەملێکراو و چەوساوە بدەن، تاوەکو ئەم کارە چاك دەبێتەوە و ئەم فیتنەیە لادەچێت.

ئامۆژگاریەکانم لێوەربگرن و پشتگوێی مەخەن، گوێڕایەڵم بن، دین و دونیاتان سەلامەت دەبێت، ئەوکەسەش کە ئاژاوەکەی هەڵگیرساندوە یان جۆشی پێ دەدات، بە گەرمیەکەی ژیانی ناخۆش و تاڵ دەبێت.[1]

قەعقاعی کوڕی عەمر دەرچوون لەگەڵ عەلی بەچاك دەزانێ

(قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) هەستا و وتی: حەق و ڕاستی ئەوەیە کە پێشەوا (ئەبوموسا) وتی، ئەگەر ڕێگای جێبەجێکردنی هەبوایە، بەڵام دەبێ خەڵك ئەمیرێکیان هەبێت خەڵکەکە ڕێك بخات و ستەمکار بترسێنێ و پشتیوانی ستەملێکراو بکات، ئێستاش ئەمیری بڕواداران (عەلی)یە، لە بانگەوازدا لەگەڵ سەرپێچیکارانی دادگەرە، داوای چاکسازی دەکات، دە ڕاپەڕن و بەسەری بخەن![2]

ئەشتەر کۆشکی ئەمیرایەتی داگیر دەکات و ئەبوموسا بەتوڕەیی دەردەچێت

(ئەشتەری نەخەعی)، (ئەبوموسا)ی بەجێهێشت لە مزگەوتی کوفە وتار بدات و، ڕۆیشت کۆشکی ئەمیرایەتی داگیر کرد و، خزمەتکارەکانی (ئەبوموسا) هاتن و هەواڵی ئەوەیان پێدا کە (ئەشتەر) دەری کردوون، کاتێ (ئەبو موسا) قسەی لەگەڵ (ئەشتەر) کرد و ناڕەزایی لەسەر کارەکەی دەربڕی، (ئەشتەر) پێی وت: لە کۆشکەکەمان بچۆ دەرەوە.

زۆربەی خەڵکی کوفە لەگەڵ (ئەشتەر) ڕاپەڕین، (ئەبو موسا)ش بەجێی هێشتن و لە کوفە دەرچوو.

دەرچوونی نۆ هەزار کەسی کوفە لەگەڵ عەلی

داوایان لە خەڵکی کوفە کرد بۆ ڕاپەڕین لەگەڵ (عەلی)ﷺ، نۆ هەزار کەس دەرچوون و بەرەو سەربازگەی (عەلی) بەڕێکەوتن، کە لە (ذیقار) بوو.

لەوانەی کە دەرچوون بۆ پشتیوانی (عەلی) لە ناودارانی کوفە: (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) و (عەدی کوڕی حاتەمی طائی).

کاتێ لە (ذی قار) پەیوەندییان کرد بە سوپاکەی (عەلی)ﷺ، (عەلی)

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٨٣-٤٨٤ .

٢ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٨٣ .

ویستی دوا هەوڵی بۆ ئاشتبونەوە لەگەڵ (طەڵحە)و (زوبەیر)و (عائیشە)ﷺ لە بەصرە بدات، زۆریش سوور بوو لەسەر چاکسازی و ئاشتەوایی و، هەڵنەگیرسانی جەنگ و خوێن نەڕێشتن و، گێڕانەوەی سەرپێچیکارانی بۆ ژێر فەرمانی و، ڕێکەوتن لەگەڵیان.

عەلیﷺ (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی)ی جیهادکاری بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ (طەڵحە)و (زوبەیر)ﷺ نارد و، وتی: ئەو دوو پیاوە ببینە و بانگیان بکە بۆ پێکەوەگونجان و کۆمەڵ بون و، ئیختلاف و پەرتەوازەییان لەلا گەورە بکە.

(قەعقاع) چوو بۆ بەصرە، لە (عائیشە)وە-خوای لێ ڕازی بێ- دەستی پێکرد و پێی وت: دایکە! چی تۆی هێناوەتە بەصرە؟

ئەویش پێی وت: کوڕی خۆم! لەپێناوی چاکسازی نێوان خەڵکدا.

(قەعقاع) داوای لێکرد کە بنێری بەدوای (طەڵحە) و (زوبەیر)دا و بەئامادەبونی (عائیشە)ﷺ و لەبەردەمیدا قسەیان لەگەڵدا بکات.

گفتوگۆی قەعقاع لەگەڵ طەڵحە و زوبەیر

کە هاتن، دەربارەی هاتنیان پرسیاری لێکردن، وتیان-هەروەك (عائیشە) وتی-: لەپێناوی چاکسازی نێوان خەڵکدا.

پێی وتن: پێم بڵێن ڕووی ئەو چاکسازییە چییە؟ سوێند بەخوا ئەگەر بەچاکمان زانی ئەوە لەگەڵتان چاکسازی دەکەین، ئەگەریش بەخراپمان زانی ئەوە لەگەڵتان ڕێك ناکەوین!

پێیان وت: بکوژەکانی (عوسمان)ﷺ دەبێ هەر بکوژرێن، ئەگەر بەبێ تۆڵەسەندنەوە وازیان لێ بهێنرێت، ئەوە وازهێنانە لە قورئان و، لەکارخستنی حوکمەکانیەتی، بەڵام ئەگەر تۆڵەیان لێ بسەنرێتەوە، ئەوە زیندووکردنەوەی قورئانە!

(قەعقاع) وتی: لە بەصرە شەش سەد کەس لە بکوژانی (عوسمان) هەبون، ئێوە هەمووتان کوشت تەنها یەك پیاو نەبێت، ئەویش (حورقوصی کوڕی زوهەیری سەعدی)یە، کاتێ لەدەستتان هەڵهات پەنای بردە بەر

هۆزەکەی کە بەنی سەعدە، کاتێ ویستتان بیگێڕنەوە و بیکوژن، هۆزەکەی ڕێگەیان لێگرتن و شەش هەزار پیاو لەسەری تووڕە بون و خۆیان لەئێوە بەدوور گرت و بەرامبەرتان وەك یەك پیاو ڕاوەستان.

ئەگەر واز لە (حورقوص) بهێنن و نەیکوژن، ئەوە وازتان هێناوە لەوەی کە دەیڵێن و بانگەوازی بۆ دەکەن و، داواش لە (عەلی) دەکەن جێبەجێی بکات.

ئەگەر لەپێناو (حورقوص) شەڕ لەگەڵ بەنی سەعد بکەن و، بەسەرتاندا زاڵ بن و بتانشکێنن شانازیتان بەسەردا دەکەن، ئەوا دەکەونە حاڵێکەوە نەدەبوایە تێی بکەون و، ئەوانتان بەهێز دەکەن و تووشی ئەوە دەبن کە پێتان ناخۆشە، ئێوە بە داواکردنی (حورقوص) هۆزی (ربیعە) و (مضر)تان لەم ناوچانەدا لەخۆتان تووڕە کردوە، ئەوەتا بۆ بەسەرخستنی بەنی سەعد و جەنگ و شکاندنی ئێوە کۆبونەتەوە.

هەر ئەمەش لەگەڵ (عەلی) ڕوویدا، لەکاتێکدا بکوژانی (عوسمان) لەناو سوپاکەیدان!

ژیربێژیەکەی (قەعقاع) و بەڵگە پەسەندەکەی کاری لە دایکی ئیمانداران و ئەوانەی لەگەڵیدابون کرد.

پێی وت: قەعقاع! ئەدی تۆ چی دەڵێیت؟

چارەسەر لەلای ئەو ئارامگرتن و هێمن کردنەوەیە، پاشان تۆڵە

وتی: (دەڵێم: ئەمە کارێکە چارەسەرەکەی هێمن کردنەوەیە، پێویستە ئارام بگرین لە تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)، کە ناکۆکیەکان کۆتاییان پێهات و، ئوممەت یەك دەنگ بون لەسەر ئەمیری بڕواداران، ئەوا یەکلا دەبێتەوە بۆ بکوژانی (عوسمان).

ئێوە ئەگەر بەیعەت بە (عەلی) بدەن و لەگەڵی ڕێك بکەون، ئەوە نیشانەی چاکەیە و مژدەی ڕەحمەت و، بەتوانایيە لەسەر سەندنەوەی تۆڵەی (عوسمان).

بەڵام ئەگەر ئێوە ڕازی نەبون و سوور بون لەسەر کەللەڕەقی و جەنگ کردن، ئەوە نیشانەی شەڕ و خراپە و لەدەستدانی ئەم دەسەڵاتەیە.

سەلامەتیەك هەڵبژێرن کە پێتان دەدرێت و ببنە کلیلی خەیر و چاکە هەروەك یەکەمجار وابون، دووچاری کارەساتمان مەکەن و خۆشتان دووچاری بین و، خوداش هەردوولامان بمرێنێت.

سوێند بەخوا، من ئەمە دەڵێم و بانگتان دەکەم بۆی و، لە هەمان کاتدا دەترسم نەگاتە ئەنجام، هەتا خوای گەورە پێویستی خۆی لەم ئوممەتە وەرگرێتەوە، کە کەلوپەلەکانی کەم بونەتەوە و ئەم کارەساتەی بەسەر هاتووە، بێگومان ئەم کارەساتەی بەسەری هاتووە زۆر گەورەیە، وەك ئەوە نیە پیاوێك پیاوێك بکوژێت، کۆمەڵێك کەسێك بکوژن، هۆزێك هۆزێك بکوژن!!))

قەعقاع قەناعەت بە کهڵحە و زوبەیر و عائیشە دەهێنێ

ئەوانیش هاتنە سەر قسەی (قەعقاع)ی ڕاستگۆی دڵسۆز و، ڕازی بون لەسەر بانگەکەی بۆ ڕێکەوتن و، پێیان وت: بەڕاستی قسەکانت ڕاستن و پێکاوتە، بگەڕێوە، ئەگەر (عەلی) هات و لەسەر هەمان بۆچونەکەی تۆ بوو، ئەو کارە بەویستی خوا چاك دەبێتەوە.

دڵخۆشی عەلی بە سەرکەوتنی قەعقاع و وتارەکەی لە ذی قاردا

(قەعقاع) لە ئەرکەکەی بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ لای (عەلی) لە (ذیقار)، هەواڵی گفتوگۆیەکەی پێدا، (عەلی)ﷺ ئەمەی زۆر بەدڵ بوو، خەریك بوو هەموو ڕێك بکەون، جا ئەوەی پێی ناخۆش بوو پێی ناخۆش بوو و، ئەوەی پێی ڕازی بوو پێی ڕازی بوو.[1]

دوای ئەوە (عەلی)ﷺ هەستا و وتارێکی بۆ سوپاکەی دا و، لە وتارەکەیدا باسی نەفامی و ناخۆشییەکانیی و، ئیسلام و بەختەوەرییەکانی و، نیعمەت و چاکەکانی خوای گەورە لەسەر ئەم ئوممەتە و، بە یەك دەنگ بونیان لەسەر (ئەبوبەکر) و (عومەر)یﷺ کرد.

عەلی دەڕواتە بەصرە بۆ ئاشتبونەوە

دوای ئەوە لە وتارەکەیدا وتی: دواتر ئەوەبوو (عوسمان)یان کوشت و، کۆمەڵانێکی دونیاویست زیانی لەم ئوممەتە دا و ئێرەییان پێبردن لەبەر ئەوانەی خوای گەورە لە چاکەی خۆی بەسەریدا ڕشتون، ویستیان شتەکان بەرەودوا بگەڕێننەوە، خوای گەورەش فەرمانی خۆی دەگەیەنێتە جێ..

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٩٣-٤٩٤.

**پاشان وتی: ئەوا من بەیانی دەچمە بەصرە بۆ ئاشتبونەوە لەگەڵ (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ، ئێوەش وەرن، بەڵام با کەس لەوانەی بە هەرشتێك هاوکاری کوشتنی (عوسمان)یان کردووە لەگەڵم نەیەن، با نەزان و نەفامەکان خۆیانم لێ بەدوور بگرن.**

**بەم شێوەیە (عەلی) و (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ خەریك بوو ئاشت دەبونەوە، نزیك بوو موسڵمانان لە بەصرە و کوفە کۆبن و ببنە یەك.**

موسڵمانان بەمە دڵخۆش بون و سەبەئییەکان پیلانیان گێڕا

**بەڵام ئایە ئەو سەبەئییانەی ناو سوپاکەی (عەلی) لەسەر ئاشتی بێدەنگ دەبن؟ ئایە بە یەکدەنگی موسڵمانان رازی دەبن؟ لە کاتێکدا ئەوان دەزانن کە لەمەدا ئەوان خەسارەتمەند دەبن و، ئاشتبونەوە لەسەر حیسابی ئەوان دەبێت و، ئوممەت لەسەریان کۆدەبنەوە، ئەوەتا (عەلی) دەستی بەو کارە کردووە، کە ڕێگەی نەدا کەس لەوانەی هاوکاری کوشتنی (عوسمان)یان کردووە، دوای بکەون، ئەی ئەگەر بۆیان یەکلابێتەوە، دەبێ چییان لێبکات؟**

کۆبونەوەیەکی نهێنیی شەیتانە سەبەئییەکان بە سەرۆکایەتی ئیبن سەبەء

**سەرکردەکانی ئەو خەواریجە سەبەئییانە کۆبونەوە بۆ تاوتوێکردنی کاروبارەکە، سوپاس بۆ خوا هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو.[١]**

**ئەو سەرکردە سەبەئییانەی کە ئامادەبون ئەمانەبون: (عبداللەی کوڕی سەبەء-ابن السوداء-) و، (ئەشتەری نەخەعی) و، (عەلبائی کوڕی هەیثەم) و، (شورەیحی کوڕی ئەوفا).**

**وتیان: راتان چییە؟ بەخوا ئەوە (عەلی)یە، ئەو زاناترە بە کتێبی خودا لەوانەی داوای بکوژانی (عوسمان) دەکەن و، نزیکترە لەوەی کاری پێبکات، ئەوا دەربارەی ئێوە ئەوەی وت کە گوێتان لێبوو، سبەی خەڵکتان لەسەر کۆدەکاتەوە، خەڵکیش هەمووی ئێوەیان مەبەستە، جا ئەوکاتە چییان لێدەکەن، ژمارەتان کەمە و ئەوانیش ژمارەیان زۆرە، لەدەستیان رزگارتان نابێت.**

ئەشتەر کوشتنی عەلی بەباش دەزانێ و ئیبن سەبەو ڕەتی دەکاتەوە

**(ئەشتەری نەخەعی) وتی: دەربارەی (طەڵحە) و (زوبەیر)، پێشتر**

---

١ـ البداية والنهاية ٧ :٢٣٩.

دەمانزانی مەبەستیان چیە، بەڵام ڕای (عەلی) لەسەر ئێمە، نەمانزانی ئەمڕۆ نەبێ، ڕای هەموویان لەسەر ئێمە یەکە، ئەگەر ئاشت ببنەوە، ئەوان بێگومان لەسەر خوێنی ئێمە ئاشت دەبنەوە!.

وەرن با هەڵکوتینە سەر (عەلی) و بیکوژین و بیگەیەنینە (عوسمان)، ئاوا ئاژاوە و فیتنە و دووبەرەکی دەگەڕێتەوە و موسڵمانان پێوەی سەرقاڵ دەبن و ناپەرژێنە سەر ئێمە!!

بەڵام شەیتانی گەورەیان (عبدللەی کوڕی سەبەء)، وتەی (ئەشتەر)ی دەربارەی کوشتنی (عەلی) ڕەت کردەوە و پێی وت: ئەشتەر! تۆ خراپترین ڕات هەیە، ئێوەی بکوژانی (عوسمان) کە لەگەڵ (عەلی)دان لە (ذی قار) دووهەزار و پێنجسەد یان نزیکی ئەوەندەن، دوای ئەوەی (طەڵحە) و (زوبەیر) لە بەصرە نزیکەی شەش سەدی لێ کوشتن. ئەگەر بە ڕای (ئەشتەر)مان کرد و (عەلی)مان کوشت، ئەوا خەڵکی ئێرە دەمانکوژن، ئەوەتا (قەعقاعی کوڕی عەمر) پێنج هەزاری لەگەڵدایە و هەموویان تامەزرۆی جەنگ و کوشتنی ئێوەن و، ئێوە توانای ئەوانتان نیە.

ئیبن هەیپەم خۆدابڕین لەخەڵك بەباش دەزانێت و ئیبن سەبەئیش ڕەتی دەکاتەوە

(عەلبائی کوڕی هەیثەم) وتی: وازیان لێ بهێنن و بڕۆن بەرەو وڵاتێکی پارێزەر و خۆتانی تێدا بپارێزن، هەتا پاڵپشتێکتان بۆ دەبێت و بەهێزتان دەکات!!

(ئیبن سەبەء)ی شەیتانیان ڕەتی دایەوە و وتی: خراپترین قسە و بۆچونت وت، خەڵکی بە ئاواتی ئەوەن کە جودا و بە تەنها بن، دووربن لە خەڵکە بێتاوانەکان، تا هێرش بکەنە سەرتان و بتانکوژن، ئەگەر لە خەڵکە جودابونەوە لەناوبردنتان ئاسان دەبێت.

لە کۆتاییدا (ئیبن سەبەء)ی شەیتانیان ڕایە پیسەکەی خۆی وت کە ئەوانیش لەسەری یەکدەنگ بون.

پێی وتن: خەڵکینە! سەربەرزیتان لە تێکەڵبونی خەڵك و تاوانەوە لەناویاندایە، جا ڕووپاماییان بۆ بکەن و بێدڵییان مەکەن و لەگەڵیان

ئیبن سەبەو ئامازە بە هەڵگیرساندنی شەڕ لەنێوان هەردوو سوپا دەکا

**هەڵکەن تا هەڵیانخەڵەتێنن و لەخشتەیان بەرن.**

**دوای ئەوە (ئیبن سەبەء) فەرمانە نەفرین لێکراوەکەی پێکردن، کە ئاشتی لەناو دەبات و کێشە و دووبەرەکی دروست دەکات، پێی وتن: ئەگەر (عەلی) لەگەڵ (طەڵحە) و (زوبەیر) بەیەك گەیشتن و، هەردوو سوپا کەوتنە بەرامبەر یەك بۆ ئاشتبونەوە، ئەوا ئێوە دزە بکەنە ناو هەردوو سوپاکەوە و شەڕ لەنێوانیان هەڵگیرسێنن و هەوڵەکانی ئاشتی لەناوببەن، لێمەگەڕێن یەکلابنەوە بۆ تێڕوانین یان بیرکردنەوە یان ئاشتبونەوە، مەهێڵن کۆببنەوە یان ڕێککەون، ئەوەی ئێوە لەناو سوپاکەیدان-کە (عەلی)یە- ناچار دەبێت لێتان بێدەنگ بێت لەبەر ئەوەی پێویستی پێتانە، (طەڵحە) و (زوبەیر)یش، خوا لەئێوە سەرقاڵیان دەکات لێتان بێئاگا دەبن و دوچاری ئەوەدەبن کە پێیان ناخۆشە.**

ڕێکەوتنی سەبەئییەکان لەسەر تێکدانی ئاشتبونەوە

**خەواریجە سەبەئییەکان لەسەر رای (ئیبن سەبەء)ی شەیتانیان ڕێکەوتن و، جەختیان لەسەر جێبەجێکردنی کرد لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو سوپاکەدا.**

**پاشان لەناو خەڵك بڵاوەیان لێکرد و، کەس هەستی پێنەکردن و نەیانزانی بۆچی کۆبونەتەوە و لەسەرچی ڕێکەوتن.[1]**

**(عەلی)ﷺ بە پێشەنگی سوپاکەیەوە گەیشتە دەوروبەری بەصرە، (طەڵحە) و (زوبەیر)یشﷺ لە بەرامبەریدا سوپایان دامەزراند و، هەردوو سوپا کەوتنە بەرامبەر یەك، (عەلی) چاوەڕوانی گەیشتنی پشتیوانی ناوچە و هۆزەکانی تری دەکرد.**

وتەی زوبەیر دەربارەی سوپای عەلی

**(ئەبو جەرباء)-کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی سوپای بەصرە- هاتە لای (زوبەیر)ﷺ و پێی وت: من وادەبینم ئێستا، پێش ئەوەی هاوەڵانی لەدەوری کۆببنەوە، هەزار سوار بۆ لای (عەلی) بنێری، تا بۆیان شتێکی کتوپڕ و لەناکاو بێت.**

**(زوبەیر)ﷺ پێی وت: ئێمە کاروباری جەنگ دەزانین، دەزانین ئەمە**

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٩٣-٤٩٤، البداية والنهاية لأبن كثير ٧ : ٢٣٩.

بۆچـونێکە، بـەڵام ئەوانـە برامـانن و کەسـی بانگەوازەکـەمانن، بـەڵام ئـەم ناکۆکیە کارێکـە و ڕوویـداوە و، هـیچ دەقێکـی لەسـەر نیـە لـە ڕۆژی قیامـەت بیانوو ببڕێت.

پاشان ئێمە لەگەڵ (قەعقاع)ی نوێنەری (عەلی) لەسەر کارێك ڕێکەوتوین و، ئاواتەخوازم لەگەڵی ئاشت بینەوە، جا لەخوابترسن و ئارام بگرن.

زوبەیر دان بە سەرسامی و بەرچاو رون نەبوندا دەنێت

یەکێکی تـر ئامـاژەی بـە (زوبەیر)ﷺ دا کـە لـەناکاو هێـرش بکەنـە سـەر (عەلی)ﷺ، ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: ئەوانە برامـانن، ئەمـەش کـارێکی گوماناویـە لـە نێـوان ئێمـە و ئـەوان، سـوێند بـەخوا، لەوکاتـەوەی خـودا (موحەممـەد)یﷺ بـە پێغەمبـەر نـاردووە، هاوەڵـەکانی هـیچ ڕێگەیـەکیان نـەگرتووە بێئـەوەی شـوێن پێـی خۆیـان بزانن، هـەتا ئـەم ڕووداوە ڕویـدا و (عوسمـان)ﷺ کـوژرا، سـوێند بـەخوا ئـەوان نـازانن بـەرەو پـێش دەڕۆن یـان بەرەو دوا.

ئـەو شـتەی ئـەمڕۆ لای ئێمـە چاکە و لای براکانمـان دزێـوە، کـە سـبەی داهـات هـەمان شـت لای ئێمـە دزێـو دەبێـت و لای ئـەوان چاك دەبێـت، ئـەو بەڵگانەی ئێمە لەسەر ئەوانمان گرتووە، ئەوان بە بەڵگەی نازانن، کە سبەی هات ئەوان ئەو بەڵگانە لەسەر ئێمە دەگرن.

ئێمە ئومێدی ئاشتی لەگەڵ براکانمان دەخوازین، ئەگەر بە دەممانەوە بـێن، بـەڵام ئەگـەر ڕەتیـان کـردەوە ناچـارین لەگـەڵیان بجـەنگین، چـونکە دواچارەسەر داخکردنە.[1]

هاوەڵان سەرسامن لە ڕەفتارکردن لەگەڵ فیتنەدا

بـەم دان پیانانـە بوێرانەیـەی (زوبـەیری کـوڕی عـەوام)ﷺ، دەزانـرێ هاوەڵان بەرامبەر ئەم فیتنە و ئاژاوەیەی ڕوویدا چەندە سەرسام بون، کە لە تێگەیشتن و ئاراستەکردن و ڕەفتارلەگەڵداکردنیدا ناکۆك بون، ئەم ناکۆکیە بـوە هـۆی جـەنگ و کوشـتار و خوێنڕشـتن لـەنێوان خۆیـان، بـە نابـەدڵی و ناچاری دەجەنگان، بەڵکو بە سەرلێشێواوی و سەرسامییەوە دەجەنگان،

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٩٥.

ئـەم وتـە ئاشـكرایەی (زوبـەیر) لـەجیاتی خـۆی و هـەموو هـاوەڵانی تـری پێغەمبەری خواﷺ، سەرسامی و دوودڵییەكەیان تۆمار دەكات.

ئەمە لەلایەن سوپاكەی (طەڵحە) و (زوبەیر)، بەڵام لەلایەن سوپاكەی (عەلی)، وێنەكە گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو.

عەلی نەخشەی خۆی ڕوون دەكاتەوە بۆ ڕەفتاركردن لەگەڵ سوپای بەصرەدا

یەكێك لە سەربازەكانی (عەلی)-كە (ئەعوەری كوڕی بەنانی مینقەری) بوو- هات و پرسیاری سەبارەت بەرەوپێشچوون بەرەو سوپای بەصرە و نەخشەكەی بۆ ڕەفتار لەگەڵیاندا، لە (عەلی) كرد.

(عـەلی) پێـی وت: لەسـەر بنـەمای ئاشـتی و كوژاندنـەوەی ئـاگری فیتنـە لێیـان دەچینە پێشەوە، بەڵكو خـوای گـەورە بـە ئێمـە ئوممـەت یـەك بخاتەوە و جەنگی لەسەر لابدات.

گفتوگۆیەكی ئاشكرا لەنێوان عەلی و ئەعوەری مینقەری دا

(ئەعوەر) پێی وت: ئەی ئەگەر بۆ ئاشتی وەڵامیان نەداینەوە؟

(عـەلی) پێـی وت: هـەتا ئـەوان وازمـان لێ بێـنن وازیـان لێ دێـنین! دەستپێشخەری جەنگ نابین لە جەنگدا.

(ئـەعوەر) وتـی: ئـەی ئەگـەر وازیـان لێمـان نـەهێنا؟ و جـەنگیان لەگەڵـدا كردین؟

(عەلی) وتی: بەرگری لەخۆمان دەكەین.

(ئەعوەر) وتی: ئایا بۆ ئەوان پێویستە بەرگری لـەخۆیان بكـەن هـەروەك بۆ ئێمە دروستە؟

(عەلی) وتی: بەڵێ.

گفتوگۆیەكی تر لەنێوان عەلی و دەئلانی دا

(ئەبو سەلامەی دەئلانی) هەستا و پرسیاری لە (عەلی) كرد: ئایا تۆ وا دەبینـی كـە ئـەو خەڵكـە بەڵگـەیان بەدەسـتەوەبێ لـە داواكردنـی خـوێنی (عوسمان)دا، ئەگەر مەبەستیان لەمە بۆ خوا بێت؟

(عەلی) وتی: بەڵێ!

(دەئلانی) وتی: ئایا لـە دواخسـتنی سـزادانی بكـوژانی (عوسـمان) هـیچ بەڵگەت هەیە؟

(عەلی) وتی: بەڵێ!

وتی: ئەی دەبێ حاڵی ئێمە وئەوان چۆن بێت، ئەگەر بەیانی پێیانەوە گرفتار بووین و جەنگاین و لێیان کوشتین و لێمان کوشتن؟

(عەلی) وتی: من ئاواتەخوازم کەس لە ئێمە و لە ئەوان نەکوژرێ، کە دڵی بۆ خوا خاوێن کردبێتەوە، مەگەر خوای گەورە بیباتە بەهەشتەوە!!!.

دوای ئەوە هەستا و وتارێکی بۆ سوپاکەی دا و وتی: خەڵکینە! خۆتان بگرن، دەست و زمانتان لەو خەڵکە بپارێزن، چونکە ئەوان براتانن، هەروەها ئارام بگرن لەوەی لەوانەوە بۆتان دێ، وریابن وا نەکەن بەیانی لەلای خوای گەورە پێشمان بکەون، چونکە شەڕفرۆشی ڕۆژی قیامەت ئەو شەڕفرۆشەیە کە ئەمڕۆ بەڵگەی لەسەر چەسپاوە.[١]

تێڕوانینێکی دادوەرانەو بابەتیانەی هەر کۆمەڵێك بۆ ئەوی تر

ئەمەیە ئاکاری ئیسلامی کە باڵ بەسەر دوو سوپای موسڵماناندا دەکێشێت کە ناکۆکن و کێشەیان لەنێواندا هەیە و لەگەڵ یەکتر دەجەنگن، ئەمە ڕێز و پایەی کێشە و ئادابی ناکۆکییە، ئەمەیە تێڕوانینی هەر کۆمەڵێك بۆ کۆمەڵەکەی تر.

بەم ڕستە ڕونکەرەوانە، (عەلی) بناغەی بۆچونی خۆی بۆ (طەڵحە) و (زوبەیر)ﭬ و ئەوانەی لەگەڵیاندان پێشکەش دەکات، ئەوان لەلای خودا بەڵگە و بیانوویان هەیە، ئەوان ئەگەر لەسەر دەستی ئەم کوژران لەبەهەشتن!!

(عەلی)ﭬ نزیکەی بیست هەزاری لەگەڵدا بوو، بەڵام (طەڵحە) و (زوبەیر)ﭬ نزیکەی سی هەزاریان لەگەڵدابوو.

ڕوبەڕوبونەوەی نێوان هەردوو کۆمەڵ

ڕوبەڕوبونەوەی نێوان هەردوو کۆمەڵەکە لە مانگی (جومادی دووەم)ی ساڵی سی و شەش، دوای شەش مانگ لە جێنشینیایەتی (عەلی) بوو.[٢]

دوو نوێنەرەکەی عەلی بۆ سوپای بەصرە

کاتێ هەردوو کۆمەڵ کەوتنە بەرامبەر یەك، و هەردوولا پێك گەیشتن، (عەلی) (حەکیمی کوڕی سەلامە) و (مالیکی کوڕی حەبیب)ی نارد بۆ لای

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٢٩٥-٢٩٦ .

٢ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٤٠ .

(طەڵحە) و (زوبەیر)، پێیان وتن: ئەگەر ئێوە لەسەر ئەوە ماون کە لەگەڵ (قەعقاعی کوڕی عەمر) پێی گەیشتن کە ڕازیبون بە ئاشتبونەوە، ئەوا دەستمان لێ هەڵگرن و ڕێگەمان بدەن دابەزین، تاوەکو بەیەکەوە چارەسەری ئەم گیروگرفتە بکەین.

ئەحنەفی کوڕی قەیس لە دەهەزار کەسدا لەهەردو کۆمەڵ خۆی دووردەگرێت

وتیان: ئێمە هێشتا لەسەر ئەوەین کە لەگەڵ (قەعقاع) لەسەری ڕێکەوتین و، ئێمە سوورین لەسەر ئاشت بونەوەی نێوان خەڵك.

(ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی) لە دە هەزار کەسی (بەنی تەمیم)دا خۆدوورگرتنی لە جەنگ بەباش زانی، نە جەنگی (طەڵحە) و (زوبەیر) و، نە جەنگی (عەلی)ﷺ.

(ئەحنەف) بە بارێکی دەروونی توندا تێدەپەڕی، کە بەم وتەیە دەری بڕی: بەڕاستی پشت کردن لەوانەی کە (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران و، (زوبەیر)ی حەواریی پێغەمبەری خوایانﷺ لەگەڵدایە زۆر سەختە، هەروەها جەنگی کەسێك کە بەیعەتم پێداوە و، ئامۆزای پێغەمبەری خوایەﷺ ئەویش زۆر سەختە.

کاتێك (زوبەیر)ﷺ ناردی بەدوایدا تا پەیوەندی بە سوپاکەیانەوە بکات، (ئەحنەف) بەوە وەڵامی دایەوە کە یەکێك لەم سێ ڕێگایە هەڵبژێرێت:

یان پردەکەم بۆ بکەنەوە، تا خۆم بگەیەنمە زەوی عەجەم و لەوێ لەگەڵ نەتەوەکەم جیهاد بکەم، هەتا خوای گەورە بڕیاری خۆی جێبەجێ دەکات.

یان بچم بۆ مەککە، لەوێ هاوسێیەتی حەرەم بکەم، هەتا خوای گەورە بڕیاری خۆی جێبەجێ دەکات.

یان خۆم لە ئێوە و لە (عەلی)ش بەدوور دەگرم و، لە نزیکتان دەبم و، چاودێری ڕووداوەکانی نێوانتان دەکەم، هەتا خوای گەورە بڕیاری خۆی جێبەجێ دەکات.!

(ئەحنەف) خۆی لە هەردوو سوپاکە بەدوور گرت و بەشداری ئەو جەنگەی نەکرد کە لەنێوانیاندا ڕوویدا، کە (عەلی) بەسەر بەرامبەرەکەیدا

عیمرانی کوڕی حەصین بانگەوازی خۆدورگرتن لە

سەرکەوت، دوای ئەوە (ئەحنەف) چووە ریزی سوپاکەی (عەلی)یەوە.[١]

ڕای (عیمرانی کوڕی حەصین) خۆدورگرتن بوو لە هەردوو سوپاکە، جا نوێنەری خۆی نارد و بانگەوازی دەکرد و دەیوت: (ئەبو نوجەید عیمرانی کوڕی حەصین) هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺ، سڵاوتان لێدەکات و بانگتان دەکات بۆ نەجەنگان و، پێتان دەڵێت: سوێند بەخوا، ئەگەر لەسەر شاخێك لەگەڵ مەڕ و بزندا بم، خوریەکەی ببڕمەوە و شیرەکەی بخۆمەوە، لەلام خۆشەویسترە لەوەی تیرێك بگرمە یەکێك لەم دوو سوپایە و، یەکێك لە موسڵمانان بپێکم![٢]

کەعبی کوڕی سور ئامۆژگاری خۆدورگرتن لە فیتنە دەکات

قازی بەصرە (کەعبی کوڕی سور)یش خۆدورگرتن لە جەنگ بەباش دەزانێ، بە سەرداری هۆزەکەی (ئەزد)–کە لەگەڵ (طەڵحە) و (زوبەیر)دا بوو– وت: بەقسەم بکە و ئامادەی جەنگ مەبە و هۆزەکەت لەجەنگ بەدوربگرە، من دەترسم ئاشتی سەر نەگرێت، واز لە هەردوولا بهێنە، ئەوان بران، ئەگەر ئاشتبونەوە، ئەوا ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانەوێت، ئەگەریش جەنگان، ئەوا بەیانی ئێمە دەبینە دادوەر لەسەریان.

بەڵام ڕەتی کردەوە و بە قسەی نەکرد.

هەردوو سوپا سەردانی یەکتر دەکەن

لە ڕۆژی پێنج شەممە، پازدەی مانگی (جومادی دووەم)، هەردوو سوپا لەلای کۆشکی (عبداللەی کوڕی زیاد) لە (زابوقە) لە تەنیشت گوندی (ئەرزاق) دابەزین و، هیچ گومانێکیان لە ڕێکەوتن نەبوو.

هۆزەکانی هەردوو سوپا بەیەك دەگەیشتن و کۆدەبونەوە و سەردانی یەکتریان دەکرد، (مضر) بۆ لای (مضر) و، (ڕەبیعە) بۆ لای (ڕەبیعە) و، (یەمەن) بۆ لای (یەمەن)، کەسیش گومانی لە ڕێکەوتن نەبوو، تەنها دەربارەی ڕێکەوتن قسەیان دەکرد.

(عەلی)ﷺ لەلایەن خۆیەوە (عبداللەی کوڕی عەباس)ی نارد بۆ لای

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٤٩٨ .

٢ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٠٣ .

**(طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ و بە ڕاشکاوی قسەی لەگەڵدا کردن، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە (موحەممەدی کوڕی طەڵحەی کوڕی عبیدالله)یان بۆ لای (عەلی) نارد–کە ناسرابوو بە (موحەممەدی سەجاد) لەبەر زۆر خواپەرستی و پارێزکاریەکەی، ئەویش بە ڕاشکاوی قسەی لەگەڵدا کرد. خەڵکی لە ڕەزامەندی و دڵخۆشی و پێکەوەگونجان و ئاسودەییدا بون.**

بەیەك گەیشتنی عەلی لەگەڵ طەڵحە و زوبەیر

**(عەلی)ﷺ لە سەربازگەکەی دەرچوو، (طەڵحە) و (زوبەیر)یش ﷺ لە سەربازگەکەیان دەرچوون، دەرچوونی هەردوولا هاوکات بوو و بەیەك گەیشتن و هەرسێکیان بۆ ماوەیەکی درێژ کۆبونەوە و، دەربارەی ئەوانە قسەیان کرد کە لەسەری ناکۆك بون و، بە ڕاشکاوی لەگەڵ یەکتر گفتوگۆیان دەکرد، لە ڕێکەوتن و لابردنی جەنگ و شەڕنەکردن چاکتریان نەدۆزیەوە و، ناکۆکیەکانی نێوان خۆیان نەهێشت و، لەسەر ئاشتبونەوە و پاشەکشەی هەردوو سوپا و کۆتایی هێنان بە ناکۆکی ڕێکەوتن.**

**ئێوارە هەریەکەیان لەسەر ئەم نیازە گەڕایەوە سەربازگەکەی.**

**(عەلی)ﷺ هەواڵی بۆ سەرکردەکانی سوپاکەی نارد و ئاگاداری کردنەوە بەو ئاشتیەی کە لەسەری ڕێکەوتون، (طەڵحە) و (زوبەیر)یش ﷺ هەواڵیان نارد بۆ سەرکردەکانی سوپاکەیان و ئاگاداریان کردنەوە لەو ئاشتیەی کە لەسەری ڕێکەوتوون.[١]**

شادبونی موسڵمانان بە ئاشتی و تورەبونی سەبەئییەکان

**ئەو شەوە موسڵمانان لە هەردوو سوپادا لەسەر ئاشتی نوستن، لە چاکترین شەودا نوستن کە پێشتر لە شەوی وادا نەنوستون، بەهۆی ئەو سەلامەتی و ڕێکەوتن و ئاسودەییەی ئەوانی تێدابون، بەهۆی نەمانی ناکۆکی و ئاژاوەو فیتنە و جەنگ لە نێوانیاندا.**

**بەڵام خەواریجە شەیتانە سەبەئییەکان–کە نزیکەی دوو هەزار دەبون لە سوپای (عەلی)دا– ناخۆشترین شەویان بەسەردا هات کە هەرگیز شەوی وا ناخۆشیان نەبینیوە، دڵ پڕ لە قین بون بەهۆی نێزیکبونەوەی ئاشتی نێوان هەردوو سوپاکە، لەبەر قین و ئیرەییان لەسەر موسڵمانان نزیك بوو شەق**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ :٥٠٥–٥٠٦ .

بەرن.

نەخشەی سەبەئییەكان بۆ لەناوبردنی ئاشتی

سەركردەكانیان، بۆ نمونە (عبداللەی كوڕی سەبەء) و (ئەشتەری نەخەعی) و (شورەیحی كوڕی ئەوفا)، بەیەك گەیشتن و هەموو ئەو شەوەیان بە ڕاوێژەوە بردە سەر. لەسەر تێكدانی نەخشەی ئاشتی نێوان هەردوو سوپا و، لەناوبردنی دەرفەتی ڕێكەوتن و، هێشتنەوەی ئاژاوە و فیتنە و ناكۆكی لەنێوان موسڵمانان، بەڵكو كاركردنیش بۆ هەڵگیرسانی جەنگێكی دڕندانە لە نێوانیاندا ڕێكەوتن.

بەڵام جێبەجێكردنی ئەو پیلانە شەیتانییە بەوە دەبێت كە چەند تاكێك لەوانە دزە بكەنە ناو هەردو سوپاكە و لەناو هۆزەكاندا بڵاو ببنەوە، ئەمانەش لە شەودا بكرێت و بەبێ ئەوەی كەس پێیان بزانێت.

سەبەئییەكان ڕێكەوتن لەسەر ئەوەی هەردوو سوپا بخەنە تەڵەوە

لە بەرەبەیاندا، پێش دەركەوتنی ڕووناكی و ڕۆژ هەڵاتن، هەریەكەیان تیربارانی سوپاكەی دیكە دەكات و چەك دەخەنە ناویانەوە و بە شمشێر هێرش دەكەنە سەریان، جا هەر كۆمەڵە وا گومان دەبات كە بەرامبەرەكەی ڕێكەوتنەكەی شكاندووە و ئاشتی ڕەت كردۆتەوە و جەنگی هەڵگیرساندووە!!

بەڕاستی ئەوە نەخشەیەكی شەیتانی فێڵاوی سەبەئییە، كۆششەكانی ئاشتی نێوان موسڵمانانی لەناو برد و جیاوازی و ناكۆكی لەنێوانیان قووڵتر كردەوە.

لە هەڵگیرساندنی جەنگدا سەردەكەون

لەگەڵ بەرەبەیاندا، سەبەئییەكان لەگەڵ تاریكیدا دزەیان كرد بۆ شوێنەكانی هەردوو سوپاكە، لەژێر باڵی تاریكیدا دزەیان كرد، بێئەوەی كەس پێیان بزانێت، (مضر)یەكانیان چوون بۆ لای هۆزەكەیان لە (مضر)، (ڕەبیعە)ییەكانیان چوون بۆ لای هۆزەكەیان لە (ڕەبیعە)، یەمەنییەكانیان چوون بۆ لای هۆزەكەیان لە خەڵكی یەمەن، چەكیان لەناویان دانا و بە شمشێر هێرشیان كردە سەریان.

هەر كۆمەڵە و بۆ كۆمەڵەكەی بەرامبەری ڕاپەڕی بەو حیسابەی كە

بەرامبەرەکەی پەیمانی شکاندووە و جەنگی دەست پێکردووە.

(طـەڵحـە) و (زوبـەیر)ﭭ کاتێکیـان زانـی لـەکاتی بەرەبەیانـدا جـەنگ دەستی پێکرد، وتیان: ئەوە چیە؟

خەڵکەکە وتیان: سوپاکەی (عـەلی) لەگەڵ بەرەبەیانـدا هێرشیان کـردە سەرمان!

(طەڵحە) و (زوبەیر)ﭭ تورەبون و وتیان: (عەلی) ڕاناوەستێ هەتا خوێن نەڕێژێت و حەرام حەڵاڵ نەکات، بێگومان ئەو ئاشتی ناوێت!!

بـەڵام لای (عـەلی)ﭬ، سـەبەئییەکان پیاوێکیـان لـە نزیکیـەوە دانابوو، هـەتا ئەگـەر پرسیاری کـرد دەربـارەی ئـەوەی ڕوودەدات، ئـەو سـەبەئییە درۆی بۆ بکات و، ئەو هەواڵەی پێبدات کە خۆیـان دەیانـەوێت و ڕاستی لێ بشارێتەوە!! لەوانەیـە ئـەوەش (ئەشـتەری نەخـەعی) بێـت کـە سـەرکردەی سەبەئییەکانی کوفە و، لە گەورە سەرکردەکانی سوپاکەی (عەلی)یە.

سەبەئییەکان درۆ لەگەڵ عەلی دەکەن

(عەلی)ﭬ کاتێکی زانی جەنگ هەڵگیرسا، وتی: ئەوە چیە؟

سەبەئییەکە پێـی وت: لەگەڵ بەرەبەیانـدا سوپای (طەڵحە) و (زوبـەیر) لەناکاو هێرشیان کردە سەرمان! بەڵام بەرپەرچمان دانەوە.

(عەلی)ﭬ وتـی: (طـەڵحـە) و (زوبـەیر) ڕاناوەستن هـەتا خـوێن نەڕێـژن و حەرام حەڵاڵ نەکەن، ئەوان ئاشتیان ناوێت.

سـەبەئییەکان کۆشـشەکانیان زیـاتر کـرد بـۆ هەڵگیرسـاندنی جـەنگ و هێـرش کردنـە سـەر لایەکـەی تـر و، هانـدانی هـەر کۆمـەڵێك بـۆ سـەر بەرامبەرەکەی و وروژاندنی بۆ جەنگان لەگەڵیدا.

جا شەڕێکی توندوتیژ و گەرم و گوڕ و دڕندانە هەڵگیرسا، کە ئـەویش شەڕی (حوشترەکە- الجمل) بوو.

جەنگی حوشترەکە (الجمل) ڕوویدا

ناونرا شەڕی (حوشترەکە-الجمل) چونکە دایکی ئیمانداران (عائیشە)- خوای لێ ڕازی بێ- لەناو شـەڕەکەدا و لـە ناوەڕاستی سوپای بەصـرەدا بوو، سـواری حوشـترێك بـوو بـەناوی (عەسـکەر)، کـە (یـەعلی کـوڕی ئومەییـە) لـە یەمەن کڕیبووی و لە مەککە پێشکەشی کردبوو، (عائیشە) لەسەر پشتی ئـەو

بۆچی ناونرا جەنگی حوشترەکە

حوشترە لە مەککەوە بەرەو بەصرە دەرچوو، پاشان لەکاتی شەڕەکەدا سواری بوو.

شەڕەکە لە ڕۆژی هەینی شازدەی (جومادی دووەم)ی ساڵی سی و شەش، لە ناوچەی (زابوقە)ی نزیك بەصرە بوو.

ئا بەم شێوەیە خەواریجە سەبەئییەکان لە نەخشەکەیان بۆ تێکدانی ئاشتی و، پارچەپارچەکردنی ئوممەت و، ڕشتنی خوێنی موسڵمانان، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

(عەلی)ﷺ بەوەی ڕوویدا زۆر خەمبار بوو، بانگکەرەکەی بانگی کرد: خەڵکینە دەست لە جەنگ هەڵگرن، کەس گوێی لە بانگەوازەکەی نەبوو، هەرکەسە و بە جەنگی بەرامبەرەکەی سەرقاڵ بوو.[1]

جەولەی یەکەمی جەنگی الجمل

شەڕی (الجمل) بە دوو جەولە ڕوویدا، جەولەی یەکەمیان سەرکردەی سوپای بەصرە (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ بون، لە بەرەبەیانەوە تا نزیك نیوەڕۆ بەردەوام بوو، شەڕێکی توندوتیژ بوو، لە هەردوو سوپا خەڵکێکی زۆری تیادا کوژرا.

(عەلی)ﷺ بانگی هێزەکەی خۆی کرد، هەروەك (طەڵحە) و (زوبەیر)یش ﷺ بانگی سوپاکەی خۆیان دەکرد: ئەوکەسەی پشت هەڵدەکات مەیکوژن، بریندار مەکوژن، دوای ئەوانە مەکەون کە شەڕ بەجێدێڵن و وازدێنن.

کەعبی کوڕی سور ئامۆژگاری عائیشە دەکات بۆ ئاشتی دەربچێ

(کەعبی کوڕی سوری ئەزدی) کە قازی بەصرە بوو، یەکێك بوو لەوانەی خۆدوورگرتن لە شەڕ و نەڕشتنی خوێنی موسڵمانانی بەچاك دەزانی، چووە لای (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران، کە لە ماڵەکەی خۆیدا بوو ئامادەی جەنگەکە نەبوو.

بە (عائیشە)ی وت: بگەرە ئەو خەڵکە، هیچیان ناوێ جەنگ نەبێ، شەڕەکەش لەنێوانیان زۆر توندە، بەڵکو خوا بە هۆی تۆ ئاشتیان بکاتەوە،

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٠٦-٥٠٧ .

**بەڵکو خەڵکەکەش کە تۆیان دیت بەرەو ئاشتی بچن و دەست لە جەنگ هەڵگرن.**

**حوشترەکەیان بۆ ئامادە کرد کە ناوی (عەسکەر) بوو، زرێپۆشیان دا بەسەر کەژاوەکەیدا، بۆ ئەوەی رم و تیر نەیگاتێ، ئەویش سواری حوشترەکەی بوو و بە نیازی ئاشتی لەنێوان هەردوو لا چووە ناو گۆڕەپانی جەنگەوە.[1]**

**(زوبەیر) و (عەمماری کوڕی یاسر)ﷺ کەوتنە بەرامبەر، (زوبەیر) وتی: (ئەبو یەقظان)! ئەوە دەمکوژی!**

**(عەممار)ﷺ پێی وت: نەخێر (ئەبو عبدالله)!!**

**جا هەریەکەیان گەڕایەوە بۆ سوپاکەی خۆی.**

چاوپێکەوتنی عەلی بۆ زوبەیر لەکاتی جەنگدا و بیرخستنەوەی بە وتەی پێغەمبەر

**(عەلی)ﷺ لە جەولەی یەکەم و لەکاتی توندبونی شەڕەکەدا داوای (زوبەیر)ی کرد تا قسەی لەگەڵدا بکات، ئەویش لەنێوان ریزەکانەوە بۆی دەرچوو، بەسەر ئەسپەکانیانەوە کەوتنە بەرامبەر یەك.**

**(عەلی)ﷺ بە (زوبەیر)ی وت: ئێوە سوار و پیاوی زۆرتان بۆ جەنگ کۆکردۆتەوە، ئایە بەڵگەیەکتان ئامادەکردووە بۆ لای خوا لە رۆژی قیامەتدا؟**

**زوبەیر! سوێندت دەدەم بەخوا، ئایا گوێت لە پێغەمبەری خواﷺ نەبوو کە دەیفەرموو: شەڕی لەگەڵدا دەکەیت و تۆ ستەمی لێ دەکەیت؟**

زوبەیر پەشیمان دەبێتەوە و شەڕەکە بەجێ دەهێڵێت

**(زوبەیر)ﷺ ئەو وتەیەی بەبیر هاتەوە کە لە پێغەمبەری خوایﷺ بیستبوو دەربارەی شەڕکردنی لەدژی (عەلی) و، لەو شەڕەشدا ستەم لە (عەلی) دەکات.**

**(زوبەیر)ﷺ پەشیمان بوویەوە و پێی وت: بەڵێ، بەخوا ئێستا بەبیرم هاتەوە، بەخوا ئەگەر لەبیرم بوایە ئەم رێیەم بۆ لای تۆ نەدەبڕی، بەخوا لەئێستە بەدواوە شەڕ لەدژت ناکەم!!!.[2]**

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٠٧ .

٢ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٤١-٢٤٢.

**(زوبەیر)ﷺ ڕۆیشت و وازی لە شەڕ هێنا و ملکەچی حەق بوو و بۆ لای حەق گەڕایەوە و، یەقینی هەبوو کە لەم شەڕەدا ستەمی لە (عەلی) کردووە و حەق لەگەڵ (عەلی)یەﷺ.**

عەمری کوڕی جرموز، لەکاتی خەودا زوبەیر دەكوژێت

**(زوبەیر)ﷺ سواری ئەسپەکەی بوو، هەردوو سوپاکەی بەجێهێشت، جەنگەکە هێشتا هەر توند بوو، بە دۆڵێکدا تێپەڕی پێی دەوترێ (وادی السباع) و خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو، یەکێك لە بەدبەختەکان-کە (عەمری کوڕی جورموز) بوو- دیتی وا بەتەنیا دەڕوات، شوێنی کەوت.**

**(زوبەیر)ﷺ لەژێر سێبەری دارێکدا بە هێمنی و دڵنیاییەوە نوست، دەروونیشی ئاسودە بوو چونکە وازی لە شەڕکردنی (عەلی)ﷺ هێنابوو.**

**(ئیبن جرموز)ی بەدبەخت لەکاتی خەودا هێرشی کردە سەری و بە نامەردی و ستەم کوشتی و سەری لێکردەوە، پاشان شمشێر و ئەسپ و ئەنگوستیلەکەی برد.**

**خزمەتکارەکەشی نوێژی لەسەرکرد و پاشان لەو شوێنە نادیارە لە (وادی السباع) ناشتی.**

**(عەمری کوڕی جرموز)ی بکوژ بە دڵخۆشییەوە هات بۆ لای (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ تا مزگێنی کوشتنی دژەکەی پێبدا و بەخششی لێ وەدەست بکەوێت!!.**

**کاتێ (عەلی)ﷺ گوێبیستی کوژرانی (زوبەیر)ﷺ بوو گریا، پاشان داوای ڕەحمەت و ڕازیبونی خودای بۆ کرد، دوای ئەوە شمشێرەکەی (زوبەیر)ی هەڵگرت و وتی: ئای ئەم شمشێرە چەند تەنگی و ناخۆشی لەسەر پێغەمبەری خواﷺ لابردووە.**

**ئینجا وتی: گوێبیستی پێغەمبەری خواﷺ بووم دەیفەرموو: موژدەی ئاگر بدە بە بکوژی کوڕی (صەفیە).**

**(زوبەیر)ﷺ کوڕی (صەفیەی کچی عبدالمطلب)ی پوری پێغەمبەری خواﷺ بوو.**

عەلی نەفرەت لە ئیبن جرموز دەکات و مزگێنی ئاگری پێ دەدات

**پاشان جنێوی بە (ئیبن جرموز) دا و نەفرەتی لێکرد و دەریکرد.**

**(عەمری کوڕی جەرموز) لە عێراق بە زیندوویی مایەوە، تا ئەو کاتەی (عبداللەی کوڕی زوبەیر) هەستا و بانگەشەی جێنشینایەتی کرد و (موصعەبی کوڕی زوبەیر)ی برای کردە والی لەسەر عێراق.**

**(ئیبن جەرموز) ترسا لەوەی (موصعەب) بیگرێ و لە تۆڵەی باوکی بیکوژێ.**

**(موصعەبی کوڕی زوبەیر) وتی: فەرمانی پێبکەن با دەرچێت، ئەو ئەمین و پارێزراوە، لە تۆڵەشدا نایکوژمەوە، بەخوا ئەو لەلای من زۆر لەوە کەمترە کە بیکەمە هاوتا و یەکسانی (زوبەیر) و لە جیاتی ئەو بیکوژم!! سزاکەی واز لێدێنم بۆ ڕۆژی قیامەت.[1]**

بریندداربونی طەڵحەو مردنی لە بەصرە

**بەڵام (طەڵحەی کوڕی عبیداللە)ﷺ دووەم سەرکردەی سوپای بەصرە، لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا دەهات و دەچوو، لە کاتێکدا کە لەسەر ئەسپەکەی بوو تیرێکی وێڵ کە نەزانرا کێ هاویشتویەتی، ڕاستەوخۆ بەری کەوت، خوێنی زۆر لێهات.**

**پێیان وت: ئەبو موحەممەد! تۆ بریندداری، بڕۆماڵەکانەوە تا چارەسەر بکرێی.**

**(طەڵحە) بە خزمەتکارەکەی وت: هەڵمگرە و شوێنێکی گونجاوم بۆ بدۆزەوە.**

کۆتایی پێهاتنی جەولەی یەکەمی جەنگەکە بە مردنی طەڵحە و زوبەیر

**جا بردرایە بەصرە و بۆ چارەسەرکردن لە ماڵێك دانرا، بەڵام برینەکەی بە بەردەوامی خوێنی لەبەر دەڕۆیی، تا لە ماڵەکەدا کۆچی دوایی کرد، پاشان لە بەصرە ئەسپەردە کرا.**

**بە دەرچوونی (زوبەیر)ﷺ لە گۆڕەپانی جەنگ و پەشیمان بونەوەی لە شەڕکردن و، بە مردنی (طەڵحە)ﷺ و کەوتنی هەزاران کوژراو و بریندار لە هەردوولا، جەولەی یەکەمی جەنگی (جەمەل) کۆتایی پێهات و، زاڵبونیش لەو جەنگەدا بۆ سوپای (عەلی)ﷺ بوو بەسەر سوپای بەصرەدا.**

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٤٩-٢٥٠ .

**(عـەلی)ﷺ چـاودێری ڕێـڕەوی جەنگەکـەی دەکـرد و، زۆری کـوژراو و برینـدارەکانی لـە هـەردوو لای دەبینـی، بەمـەش ئـازاری پێدەگەیـشت و خەفەتبار دەبوو.**

عەلی بەراشکاوی خەفەتباری خۆی بۆ حەسەنی کوڕی دەردەبڕێ

**(عـەلی)ﷺ ڕووی کـردە (حەسـەن)ی کـوڕی و بـە سـینگیەوە گوشـی و دەستی کرد بە گریان و وتی: کوڕەکەم، خۆزگە باوکت بیست ساڵ بەر لە ئەمڕۆ بمردبایە!!.**

**(حەسەن)ﷺ وتی: باوکەگیان! من ڕێگری ئەمەم لێکردی!!!.**

**(عەلی) وتی: من وا گومانم نەدەبرد کە کارەکە بگاتە ئەم ئاستە!، ئەبێ دوای ئەمە ژیان تامی چی بێ؟ دوای ئەمە هیوای چ چاکەیەك بخوازین؟.[1]**

جەولەی دووەمی جەنگی جەمەل

**دوای ئەوەی ڕۆژ نیوە بوو، جەولەی دووەمی جەنگی (جەمەل) دەستی پێکردەوە، دوای ئەوەی کە هەردوو سەرکردەی سوپای بەصرە (طەڵحە) و (زوبەیر)ی تێدا نەمان.**

**سـوپای (بەصـرە) لـە جەولـەی دووەمـی جەنگەکـەدا لـە دەوری (عائیشە)دا-خوای لێ ڕازی بێ- کۆبونەوە کە سواری حوشتر بووبوو، هەر بۆیـەش بـە جـەنگی (حوشـترەکە: الجمـل) نـاونرا، وەك ئـەوەی ئـەو لـەو جەولەیەدا سەرکردەی جەنگەکە بێت.**

**(عائیـشە)-خـوای لێ ڕازی بـێ- سـوور بـوو لەسـەر کۆتـایی پێهێنـانی جەنگەکە و ئاشتەوایی کـردن، سەبەئییەکانیش لەناو سوپاکەی (عـەلی)دا بـون -بـەڵکو لـە پێـشەوەی سـوپاکەدا بـون، ڕووبـەڕووی سـوپای بەصـرە- سووربون لەسەر جەنگ و کوشتار و، بوار نەدان بـە هـەلی ئاشـتی و کۆتـایی پێهێنانی جەنگەکە.**

**هەرکەسـێك لـە سـوپای بەصـرە ڕوبـەڕویان ببوایەتـەوە دەیانکوشـت، بەتایبەتی کە ئەوان پێشەنگی سوپای (عەلی) و بەرامبەر سوپای بەصرە بون.**

**قـازی بەصـرە (کـەعبی کـوڕی سـور) پێـشکەوت و حوشـترەکەی**

---

عائیشە داوا لە ئیبن سور دەکات قورئان هەڵگرێت و بانگەشەی بۆ بکات

[1] ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٤١ .

(عائیشە)ی رادەکێشا و، سوور بوو لەسەر کۆتایی پێهێنانی جەنگ و جێگرتنەوەی بە ئاشتەوایی.

(عائیشە)-خوای لێ ڕازی بێ- پێی وت: کەعب! واز لە حوشترەکە بێنەو ، قورئانێك هەڵگرە و بە کتێبی خواوە لێیان بچۆ پێشەوە و بانگیان بکە بۆ ئاشتەوایی و کارکردن بەوەی تێیدایە، بەڵکو خوا بەتۆ ئاشتی بهێنێت و جەنگ کۆتایی پێبهێنێت.

(کەعبی کوڕی سور) قورئانەکەی هەڵگرت و کەوتە پێشەوەی سوپای بەصرە و هاواری لە سوپای (عەلی) کرد و وتی: خەڵکینە! من (کەعبی کوڕی سور)ی قازی بەصرەم، بانگتان دەکەم بۆ کتێبی خودا و کارپێکردنی و، ئاشتەوایی کردن لەسەر بنەمای کتێبی خوا.

سەبەئییەکان کەعبی کوڕی سور دەکوژن

سەبەئییەکانی پێشەوەی سوپاکەی (عەلی) ترسان لەوەی هەوڵەکەی (کەعب) سەربگرێت، بۆیە هەموویان پێکەوە تیربارانیان کرد، ئەوەبوو بە دیداری خوا گەیشت و گیانی سپارد و قورئانەکەش هەر لە دەستیدابوو!

تیری سەبەئییەکان حوشتر و کەژاوەکەی (عائیشە)یان پێکا، جا دەستی کرد بە بانگ کردن و دەیوت: کوڕەکانم، خودا خودا، یادی خودا و ڕۆژی لێپرسینەوە بکەن و، واز لە جەنگ بێنن.

سەبەئییەکان بەقسەیان نەدەکرد و بەردەوام بون لە لێدانی سوپای بەصرە.

عائیشە دوعا لە بکوژانی عوسمان دەکات

(عەلی)ش ﷺ لە پشتەوە فەرمانی دەدا بە دەستهەڵگرتن لە جەنگ و هێرش نەکردنە سەر بەصراییەکان، بەڵام سەبەئییەکان لە پێشەوەی سوپاکەی بەقسەیان نەدەکرد و تەنها دەیانویست بچنە پێشەوە و هێرش بەرن و بجەنگن!!.

کاتێ (عائیشە)-خوای لێ‌ڕازی بێ- بینی وەڵامی بانگەوازەکەی نادەنەوە و (کەعبی کوڕی سور)یشیان لەبەردەمیدا کوشت، وتی: خەڵکینە! نەفرین لە بکوژانی (عوسمان) و شوێنکەوتەکانیان بکەن!!.

(عائیشە)-خوای لێ‌ڕازی بێ- دەستی کرد بە دوعا و نەفرەت کردن لە

بکوژانی (عوسمان)ﷺ و، خەڵکی بەصرەش دەنگیان بەرزکردەوە بە دوعا و نەفرەت کردن لە بکوژانی (عوسمان) و شوێنکەوتەکانیان!.

(عەلی)ﷺ گوێبیستی دوعاکەی خەڵکی بەصرە بوو، وتی: ئەوە چیە؟

وتیان: (عائیشە) دوعا لە بکوژانی (عوسمان) دەکات و، خەڵکیش لەگەڵیدا دوعا دەکەن.

(عەلی)ﷺ وتی: لەگەڵمدا دوعا و نەفرەت لە بکوژانی (عوسمان) و شوێنکەوتەکانیان بکەن.

سوپای (عەلی)ش دەنگیان بەرزبوویەوە بە دوعا و نەفرەت کردن لە بکوژانی (عوسمان)ﷺ.[١]

بەمە هەردوو سوپا –سەرەڕای هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوانیاندا– لەسەر ئەو ئامانجە هاوبەشە یەکدەنگ بوون، ئەویش دوعاکردنە لە بکوژانی (عوسمان)ﷺ.

هەردوو سوپا سەبەئییە بکوژەکانی (عوسمان)یان خۆشنەدەویست و رقیان لێیان دەبۆوە، بەڵام نەیاندەزانی چۆن دەستیان بەسەردا بگرن و لەناویان بەرن، چونکە ئەوان خۆیان بەسەر (عەلی)دا سەپاندبوو و، لە پێشەوەی سوپاکەی بون، خێرایی ڕووداوەکان و لە فەرمان دەرچوونی دژەکانی، بواری خۆ رزگارکردنی پێ نەدا!!.

سەبەئییەکان دەیانەوێت عائیشە و حوشترەکەی بکوژن

سەبەئییەکان هەوڵ و کۆششیان ئاراستەی کوشتنی حوشترەکە و کوشتنی دایکی ئیمانداران (عائیشە) –خوای لێ رازی بێ– کرد، سوپای بەصرە بەخێرایی کەوتنە پاراستنی (عائیشە) و حوشترەکەی، لەبەردەم حوشترەکەیدا دەجەنگان، هەرکەسێ جڵەوی حوشترەکەی بگرتبایە دەکوژرا، کە شەڕەکە لەبەردەم حوشترەکە لە ئەوپەڕی توندوتیژی و هێز و گەرمیدا بوو.

جەنگێکی سەخت لە دەوروبەری حوشترەکە

جەنگ لە دەوروبەری حوشترەکە چەندین کاتژمێر درێژەی هەبوو و، نۆرە بەنۆرە بوو، لە نێوان هێرش و پاشەکشەدا بون، جارێك سوپای (عەلی)

---

١ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥١٣ .

زاڵ دەبون، جارێکیش بەلای سوپای بەصرەدا لاردەبوەوە.

لە جەنگی دەوروبەری حوشترەکەدا دەست و پێی زۆر لە هەردوو لا بڕرا، لە هیچ جەنگێکی پێشتر و پاشتریش بەقەد ئەم جەنگە دەست و قاچ نەبڕراوە.

(عبدالرحمنی کوڕی عەتتابی کوڕی ئوسەید) پێشنوێژی سوپاکەی (عائیشە)، جڵەوی حوشترەکەی گرتبوو کوژرا، پاشان (ئەسوەدی کوڕی ئەبو بوختوری) گرتی و ئەویش کوژرا.

پاشان (عبداللەی کوڕی زوبەیر)ﷺ پێشکەوت تا جڵەوی حوشترەکە بگرێت، (عائیشە) پێی وت: تۆ کێیت؟

وتی: (عبداللەی کوڕی زوبەیر)!

کوڕی (ئەسما)ی خوشکی بوو، ترسا بکوژرێت، وتی: هاوار بۆ (ئەسما)!!.

شەڕکردنی ئیبن زوبەیر و ئەشتەری نەخەعی

(ئەشتەری نەخەعی)-کە ناوی (مالیکی کوڕی حارس) بوو- و سەرکردەیەکی سەبەئییەکان و، لە گەورەسەرکردەکانی سوپای (عەلی) بوو، هێرشی بردە سەر (ئیبن زوبەیر).

(ئەشتەر) و (ئیبن زوبەیر) شەڕێکی توندوتیژیان کرد، هەردووکیان پاڵەوانێکی شەڕکەری ئازا بون!، (ئەشتەر) لێدانێکی لە سەری (ئیبن زوبەیر)ﷺ دا و بەخەستی برینداری کرد، (ئیبن زوبەیر)یش لێدانێکی توندی لە ئەشتەر دا، پاشان زۆرانبازیەکی بەهێز لەنێوانیاندا روویدا، هەردووکیان کەوتن و هەر شەڕیشیان دەکرد، (ئیبن زوبەیر) سوور بوو لەسەر کوشتنی (ئەشتەر)، چونکە لە سەرکردەی سەبەئییەکان و گەورە بکوژانی (عوسمان) بوو.

من و مالیك بکوژن

لەوکاتەی دەجەنگان، کەسیان نەیتوانی ئەوی تر لەناو ببات، (ئیبن زوبەیر) بە ئەوپەڕی دەنگی بانگی سوپای بەصرەی کرد و وتی:

من و (مالیك) بکوژن، (مالیك)یش لەگەڵمدا بکوژن.

خەڵکەکە گوێبیستی قسەکەی (ئیبن زوبەیر) بون، بەڵام نەیاندەزانی

ئەو (مالیك)ەی کە (ئیبن زوبەیر) فەرمانی کوشتنی دەدات کێیە، چونکە ئەوان تەنها بە ناوی (ئەشتەر) دەیانناسی، ئەگەر (ئیبن زوبەیر) بیوتایە: (ئەشتەر) بکوژن، ئەوا (ئەشتەر) لە دەستیان ڕزگار نەدەبوو.

خەڵکی (ئیبن زوبەیر) و (ئەشتەر)یان لێك جودا کردەوە و کەسیان نەکوژران!![1]

کوژرانی موحەممەدی کوڕی طەڵحە لەبەردەم حوشترەکەدا

(موحەممەدی کوڕی طەڵحەی کوڕی عبیداللە) کە بە هۆی خواپەرستی و خۆپارێزیەکەیەوە بە (موحەممەدی سەجاد) ناسرابوو، هاتە پێشەوە و جڵەوی حوشترەکەی گرت.

بە (عائیشە)ی وت: دایکە! فەرمانم پێبکە.

پێی وت: فەرمانت پێ دەکەم کە وەك باشترینی دوو کوڕەکەی ئادەم بیت!.

(موحەممەدی کوڕی طەڵحە) هەرکەسێك لێی دەهاتە پێشەوە پێی دەوت: لەبەر خاتری خوا و خزمایەتی دەستم لێ هەڵگرە، پاشان ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەی بەسەردا دەخوێندەوە کە لە سورەتی (شورا)دایە:

﴿قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى: ئەمن پاداشتم لەنگۆ ناوێ، مەگەر خۆشویستنی خزمە نزیکەکان نەبێت.﴾الشوری/٢٣.

بەڵام سەبەئییەکان و ئەو ئاژاوەگێڕ و دەشتەکیانەی لەگەڵیاندا بون خاتری خوایان نەدەزانی، یەکێکیان بە ڕمەکەی هەڵیکوتایە سەری و لێیداو کوشتی.

بکوژەکەی شانازی بە تاوانەکەی دەکا

ئەو بکوژە دەربارەی کوشتنەکەی (موحەممەدی سەجاد) وتی:

وَأَشْعَثَ قَوَّامٍ بِآيَاتِ رَبِّهِ قَلِيلِ الأَذَى فِيمَا تَرَى العَيْنُ مُسْلِمِ
شَكَكْتُ لَهُ بِالرُّمْحِ جَيْبَ قَمِيصِهِ فَخَرَّ صَرِيعاً لِلْيَدَيْنِ وَلِلْفَمِ
يُذَكِّرُنِي (حم) وَالرُّمْحُ شَاجِرٌ فَهَلاَّ تَلا (حم) قَبْلَ التَّقَدُّمِ

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥١٩. والبداية والنهاية لأبن كثير ٧ :٢٤٣-٣٤٤.

**عَلى غَيْرِ شَيْء، غَيْرَ أَنْ لَيْسَ تابِعاً عَلِيّاً، وَمَنْ لا يَتْبَعِ الحَقَّ يَنْدَمْ**[١]

**لە دەوروبەری حوشترەکەدا بە هەزاران لە سوپای بەصرە کوژران، تەنها لە قورەیش حەفتا پیاو کوژران، هەریەکەیان دەهاتنە پێشەوە و جڵەوی حوشترەکەیان دەگرت.**

کەژاوەکەی عائیشە لەبەر تیر بەرکەوتنی وەکو ژیژك وابوو

**تیرەکان بە حوشترەکە و بە کەژاوەکەی (عائیشە)وە دەنوسان و ئەویشی تێدابوو، تیرەکان بە کەژاوەکەوە نووسابون، لەبەر زۆری تیرەکان وەکو ژیژکی لێهاتبوو.**

قەعقاع فەرمان دەکا بەکوشتنی حوشترەکە و عائیشە رزگار دەکات

**(قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) کە لە سوپای (عەلی)دا بوو، زۆر ئازاری دەچەشت بە هۆی زۆری کوژراو و بریندار لەبەردەم حوشترەکە و دەوروبەریدا.**

**وتی: مادەم ئەو حوشترە بەپێوە بێت جەنگ هەر بەردەوام دەبێ، جا ئەگەر بمانەوێت جەنگەکە کۆتایی بێت پێویستە حوشترەکە بکوژین!.**

**پاشانیش (قەعقاع) لەوە ترسا دایکی ئیمانداران (عائیشە) بپێکرێ یان بکوژرێ!.**

**لەو کاتەدا (زوفەری کوڕی حارس) لە سوپای بەصرە جڵەوی حوشترەکەی بەدەستەوە بوو، (قەعقاع) داوای لێکرد کاربکا بۆ کۆتایی پێهێنانی جەنگەکە، ئەوەش بە کوشتنی حوشترەکەوە دێتە دی.**

**(زوفەری کوڕی حارس) دای لە پەلەکانی حوشترەکە و برینداری کرد و، کەوتە سەر زەوی و هاوارێکی ایبیسترا کە لەوە توند و بەهێزتر نەبیستراوە.**

**(قەعقاع) و (زوفەر) لە کەژاوەکە چونە پێش و (عائیشە)یان لەسەر پشتی حوشترەکە داگرت و لەلایەکەوە دایاننا.**

**کاتێك سوپای بەصرە مردنی حوشترەکەیان بینی، پشتیان لە جەنگ کرد و گۆڕەپانەکەیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە بۆ بەصرە.**

---

١ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٢٦ .

لەکاتی داهاتنی شەودا جەنگەکە کۆتایی پێهات.

قوربانیانی جەنگی جەمەل

بەم شێوەیە جەنگی (جەمەل) ڕۆژێکی تەواو بەردەوام بوو، کە ڕۆژی پێنج شەممەی دەی (جومادی دووەم)ی ساڵی سی و شەش بوو.[1]

جەنگی (جەمەل) بووە هۆی کەوتنی دە هەزار کوژراو، پێنج هەزار لە سوپای بەصرە و پێنج هەزار لە سوپای (عەلی)، بەڵام بریندارەکان لە هەردوولا چەندانەی ئەو ژمارەیە بوو.[2]

لە پێشەوەی کوژراوەکانیش: (زوبەیری کوڕی عەوام) و (طەڵحەی کوڕی عبیداللە) و (موحەممەدی کوڕی طەڵحە) و (کەعبی کوڕی سور)ﷺ.

دایکی بڕواداران (عائیشە) -خوای لێ ڕازی بێ- بەڕێزەوە لە کەژاوەکە هێنرایە دەرەوە و، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) برای -کە لە گەورە سەرکردەکانی سوپای (عەلی) بوو- هات بۆ لای، پاشان (عەلی) خۆیشی هات بۆ لای و سەلامی لێکرد، ئینجا پێی وت: دایکەگیان! خودا لە ئێمە و ئێوەش خۆش بێ!

عائیشە لە بەصرە، پاشان بەرەو مەککە

(عائیشە) -خوای لێ ڕازی بێ- وەڵامی دایەوە و وتی: بەڵێ کوڕەکەم" خودا لە ئێمە و ئێوەش خۆش بێ!!.

کە کۆتایی شەو داهات، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر)ی برای بردی و لەماڵی (عبداللەی کوڕی خەلەفی خوزاعی) لە بەصرە داینا، دوای چەند ڕۆژێك لە کاروانێکی شکۆداردا ئامادەی کرد و بەوپەڕی ڕێزەوە ناردیەوە بۆ مەککە!.[3]

گفتوگۆیەکی ئیمانی لەنێوان عائیشە و قەعقاعدا

کاتێك (عائیشە) -خوای لێ ڕازی بێ- لە گۆڕەپانی جەنگدا لەناو کەژاوەکەیدا بوو، (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) بەلایدا تێپەڕی، پێی وت: قەعقاع! لەکاتی شەڕدا گوێبیستی یەکێك بووم لە سوپای کوفە پێمی دەوت:

---

۱ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٣٣-٥٣٤.

۲ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٣٩. والبداية والنهاية ٧ : ٢٤٥ .

۳ ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٣٤.

**یـا أُمَّنــا أَعَــقَّ أم نَعْلَـمُ  وَالأُمُّ تَغْــدو وَلَــداً وَ تَــرْحَمُ**
**ألا تَرَيْنَ كَــمْ شُجاعٍ يُكْلَمُ وَتُخْتَلـى مِنْـهُ يَـدٌ ومِعْـصَمُ**[١]

قەعقاع! ئەم قسەیە ئازاری دام و گریاندمی.

(قەعقاع) پێی وت: بەخوا درۆی کرد، لە ڕاستیدا تۆ باشترین دایکێکی کە ئێمە زانیبێتمان، هەوڵی ئاشتەواییت دا، بەڵام گوێڕایەڵت نەبون!.

پێـی وت: بـەخوا کوڕەکـەم، خوازیـاربووم بیـست سـاڵ بـەر لـەم ڕۆژە بمردمایە!.

عائیشە و عەلی خەفەتی خۆیان لەلای قەعقاع دەردەبڕن

(قـەعقاع) چـوو بـۆ لای (عـەلی)-کـە لـەناو سـوپاکەیدا بـوو-، ئـەوەی گوێبیستی بوو بۆی گێڕایەوە، (عەلی)ش ﷺ پێی وت: بـەخوا، خوازیـاربووم بیست ساڵ بەر لەم ڕۆژە بمردمایە!!.

سـەبارەت بـەوەی لـە جەنگەکـەدا ڕوویـدا، قـسە و ئـازاری هەریـەك لـە (عەلی)و (عائیشە) ﷺ یەك بووا!.

عائیشە داوای ڕەحمەت بۆ کوژراوانی هەردوو سوپا دەکا

(عائیـشە) -خـوای لێ ڕازی بـێ- پرسـیاری هەنـدێ پیـاوی کـرد کـە لـە سوپاکەیدا بون، پێی وترا: کوژراون. وتـی: خودا ڕەحمیان پێ بکات!.

پاشـان پرسـیاری هەنـدێ پیـاوی کـرد کـە لـە سـوپاکەی (عـەلی)دا بـون، وترا: کوژراون. وتـی: خودا ڕەحمیان پێ بکات!.

خـەڵکی بەصـرە سـەریان سـوڕما لـە ڕەحمـەت نـاردنی (عائیـشە) بـۆ دژەکانی، هەمان قسەکەی (عەلی) وتەوە: من هیـوام وایـە ئـەوەی بە دڵپاکی لەم دوو سوپایەدا کوژرابێ، بەهەشتی بێ!.[٢]

(عـەلی) ﷺ سـێ ڕۆژ لـە گۆڕەپـانی جەنگـدا مایـەوە، کـوژراوانی سـوپای بەصـرەی بینـی، خەفـەتی بـۆ خـواردن و داوای ڕەحمـەتی بـۆ کـردن، لـەنێو کوژراوەکاندا (کەعبی کوڕی سور)ی قازی بەصـرە و چـەندان لـە پیاوماقوڵ

---

١ـ واتە: ئەی دایکمان، خراپترین دایکێکی زانیبێتمان، دایك ڕۆڵەی بەخێو دەکا و بـەزەیی پێدا دێتەوە، ئایا نابینی چەندان کەڵەپیاوی ئازا خـوێنی دەڕژێ و چـەندانی تـر دەسـت و مەچەکیان دەپەڕێ؟

٢ـ تأريخ الطبري ٤ : ٥٣٧.

و پیاوچاكانی شارەكەی بینی، وتی: چۆن هەڵیاندەبەستا كە تەنها ئاژاوەگێڕ و گێلەكانی بەصرە بەرەو رومان هاتوون؟.

عەلی نوێژ لەسەر كوژراوانی هەردوو سوپا دەكا

(عەلی)ﷺ نوێژی مردوی لەسەر كوژراوانی هەردوو سوپاكە كرد، پاشان فەرمانی دا هەرچی چەك و شتومەكی بەجێماوی بەصرە هەیە كۆیكەنەوە، ئینجا فەرمانی دا هەمووی بنێرنەوە بۆ مزگەوتی بەصرە، هەركەسێك شتێكی خۆی ناسیەوە با بێت و بیباتەوە.

واتە ئەو شتانەی دژەكانی بەجێیان هێشتبوو، وەكو دەستكەوتی جەنگی نەیبرد بۆ سوپاكەی و دابەشی نەكرد بەسەریاندا، بەڵكو گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەكانی.

سەبەئییەكان لەم رەفتارەی (عەلی)ﷺ تورەبون و ویستیان سامانی (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ-كە بە مەلایین بوو- دابەشی كەن، هەموو ئەو شتانەش دابەش كەن كە بەصراییەكان لەدوای خۆیان بەجێیان هێشتبوو.

(عەلی)ﷺ وەڵامی دانەوەو وتی: كێتان حەز دەكا دایكی ئیماندااران (عائیشە) لە پشكەكەی ئەودا بێ و، بیكاتە بەندە و كەنیزەك لەلای خۆی؟.[1]

بەیعەتی خەڵكی بەصرە بۆ عەلی

پاشان (عەلی)ﷺ چووە بەصرەوە و سەرجەم خەڵكەكەی بەیعەتیان پێی دا، (عبداللەی كوڕی عەباس)یﷺ كردە والییان.

سەبارەت بەوەی لەنێوان (عەلی) و، (طەڵحە) و (زوبەیر)ﷺ روویدا، یەكێك قسەی لەگەڵ (عەلی)كرد، ئەویش وتی: تەنها چاكە بڵێن، لە راستیدا هیوام وایە من و (عوسمان) و (طەڵحە) و (زوبەیر) لە رۆژی قیامەتدا لەوانە بین كە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ: هەر كینەیەك لە سینەیان بوو، دامانماڵی، دەبنە برا و لەبان تەختان هەمویان بەرامبەر یەكن.﴾الحجر/٤٧.

عەلی كوفە دەكاتە پایتەختی خۆی

پاش ئەوەی (عەلی)ﷺ چەند رۆژێك لە بەصرەدا مایەوە، بارودۆخەكە ئارام بویەوە، ڕووی لە كوفە كرد، لە رۆژی دووشەممەی دوانزەی مانگی

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٥٤٥.

**ڕەجەب سالّی سی و شەش چووە ناویەوە و کردی بە پایتەختی جێنشینایەتیەکەی کە درێژەی نەخایاند.**

عەلی بانگی موعاویە دەکا بۆ گوێڕایەڵ بوون

**(عەلی)رضي الله عنه، (جەریری کوڕی عبداللەی بەجەلی)ی هاوەڵی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم نارد بۆ لای (موعاویە)رضي الله عنه لە شام و داوای بەیعەت پێدان و گوێڕایەڵی و هاتنە ناو ئەوەی لێکرد کە خەڵك هاتونەتە ناویەوە.**

**(موعاویە)رضي الله عنه ڕاوێژی بە خەڵکی شام کرد، ئەوانیش ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە بەیعەتی پێنادەن هەتا ئەو بکوژانەی (عوسمان) نەکوژێت کە لەگەڵیدا لە سوپاکەیدان، یان ئەوانە بداتە دەست (موعاویە) و بیانکوژێت، چونکە ئەو شایانە بەسەندنەوەی خوێنی (عوسمان).[١]**

دید و بۆچونی عەلی و موعاویە

**لەڕاستیدا (موعاویە)رضي الله عنه و خەڵکی شام ئەوانەی لەگەڵیدابون، لە داواکردنی جێبەجێکردنی حەد بەسەر بکوژانی (عوسمان)رضي الله عنه و کوشتنیان لە تۆڵەی ئەودا کۆششیان کردووە و بیانویان هەبوە، (موعاویە)رضي الله عنه شایانی سەندنەوەی خوێنی (عوسمان) بوو، چونکە خزمی بوو لە (بەنی ئومەییە) بوو، بۆچونی خۆیان هەبوو لە هەڵپەساردنی بەیعەتدان بە ئەمیری بڕواداران تا تۆڵە لە بکوژانی (عوسمان) دەسێنێتەوە!.**

**کاتێکیش دەڕوانینە هەڵوێستی (عەلی)رضي الله عنه بەلای بەرامبەردا، دەبینین کۆششی کردووە و عوزر و بیانووی خۆی هەیە لە دواخستنی تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی (عوسمان)، تا ئەو کاتەی کاروبارەکان دێنەوە سەر باری خۆی و، بارودۆخەکە جێگیر دەبێت و، هەموو موسڵمانان بەیعەتی پێدەدەن!.**

دەرچوون لە فەرمانی عەلی، سزادانی بکوژانی دواخست

**کەس نکوڵی ئەوە ناکات کە لە سوپای (عەلی)دا زیاد لە دوو هەزار لە بکوژانی (عوسمان) هەبون، هەندێکیشیان لە گەورە سەرکردەکانی بون وەك (ئەشتەری نەخەعی)، (عەلی)رضي الله عنه ڕقی لێیان بوو، بەدوای هەلێکی گونجاودا دەگەڕا تا لێیان ڕزگار بێت و لەناویان ببات و، سوور بوو لەسەر**

---

١ ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٥٤ .

ئەوەی کاتێك بارودۆخەکە هێمن دەبێتەوە حەدیان لەسەر جێبەجێ بکات.

ئەوانەی داوای پەلەکردن لە پیادەکردنی حەد لەسەر بکوژانی (عوسمان)یان دەکرد، (عەلی)یان سەرقاڵ کرد، کە ناچار بوو ڕوو بکاتە ئەوان و لێپرسینەوەی بکوژەکان دوابخات، ئاژاوەکانیان لە دژی و پاشان ڕوودانی شەڕ لە نێوان ئەو و ئەواندا لە جەنگی (جەمەل)، ئینجا (صفین)، دادگایی کردنی بکوژانی دواخست.

ئەگەر ئەوانەی داوای ئەو مافەیان دەکرد، دژ بە (عەلی) لە بەصرە پاشان لە شام دەرنەچوونایە-کە بیانوویان هەبوو و کۆششیان کردبوو و، بەلای کەمەوە بۆچونێکی بیستراویان هەبوو-، ئەوا (عەلی) یەکلا دەبویەوە بۆ لێپرسینەوەی بکوژان و لەناوبردنیان!.

گرفتی عەلی بونی بکوژان لە سوپاکەیدا بوو

لە ڕاستیدا دواخستنی دادگایی کردنی (عەلی)ﷺ بۆ بکوژانی (عوسمان)ﷺ بەپێی کۆشش و لەبەر زەرورەت بوو، بونی بکوژانیش لە سوپاکەیدا هەر لەبەر زەرورەت بوو!!.

ئەوە قەدەری (عەلی)ﷺ بوو، ئا ئەمەش ئەو گرفتە ترسناکە بوو کە ڕوبەڕوی خەلافەتەکەی بوویەوە و لەناوی برد، پاشانیش بە شەهیدبونی کۆتایی هات.

ئەمەش قەدەری خوا بوو بۆ ئەم ئوممەتە و هەردەبوو ڕوی بدایە و جێبەجێ بوایە.[1]

عەلی ڕوو لە شام دەکا بۆ ملکەچ پێکردنیان

(عەلی)ﷺ لە کوفەوە ڕووەو شام ڕۆیی، بۆ مل پێ کەچکردنی (موعاویە)ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بون، (موعاویە)ش خۆی ئامادەکردبوو بۆ ڕوبەڕوبونەوەو شەڕ لەگەڵ کردنی.

ئەگەر (عەلی)ﷺ بەرەو شام نەڕۆیشتایە، (موعاویە)ﷺ نیازی شەڕ لەگەڵکردنی نەبوو و، سوپاشی بۆ شەڕکردنی نەدەنارد.

---

١- سەیری (العواصم من القواصم)ی (ئیبن العربی):١٦٢-١٧٢ بکە لەگەڵ پەراوێزەکانی (محب الدین الخطیب).

بەڵام چۆن (عەلی) ئەمیری بڕواداران بێدەنگ بێت لەسەر دژایەتی و بەیعەت نەدان؟. ئەو بە یاخیبون و هەڵگەڕانەوە و سەرپێچیکردنی خەلیفەی دادەنا!.

سوپای عەلی و سوپای موعاویە

سوپای (عەلی) ژمارەیان سەد و بیست هەزار کەس بون، ژمارەی سوپای (موعاویە)ش نەوەد هەزار کەس بون.

(ئەشتەری نەخەعی)، (قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە)، (عەمماری کوڕی یاسر) و (عبداللەی کوڕی عەباس) لە سەرکردەکانی سوپای (عەلی) بون.

(عەمری کوڕی عاص)، (عەمری کوڕی سوفیانی سولەمی-ئەبو ئەعوەر-)، (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) و (عبدالرحمنی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید) لە سەرکردەکانی سوپای موعاویە بوون.

جەنگی صفین لە جەولەی یەکەمیدا و پاشان شەڕ ڕاگرتن

هەردوو سوپاکە لە (صفین) لەسەر روباری فورات پێك گەیشتن، لەوێدا جەنگی (صفین)ی ئازار و خەفەت هێنەر روویدا، کە چەند هەفتەیەکی خایاند و دەیەها هەزار کوژراو لە هەردوولا کەوتن.

جەنگ لەنێوان هەردوو سوپاکە لە مانگی (ذو الحجة)ی ساڵی سی و شەش دەستی پێکرد، جەنگەکە لەنێوانیان پێکدادان و زۆرانبازی بوو، بە درێژایی مانگی (ذو الحجة) جەنگ لە نێوانیان بەردەوام بوو، لەوانەیە لە رۆژێکدا دوو جار بەشەر بهاتنایە.[1]

کاتێك مانگی موحەڕەمی ساڵی سی و حەوت هات، هەردوو سوپا بەربەستیان دانا و بەدرێژایی ئەو مانگە شەڕیان ڕاگرت، بەو هیوایەی رێکەوتن و سازش لە نێوانیان روو بدا و کۆتاییەکەی بە ئاشتەوایی و کۆتایی هێنان بە گیروگرفتەکان و خوێنڕشتن بێت.

لە مانگی موحەڕەمدا (عەلی)ﷺ وەفدێکی نارد بۆ لای (موعاویە)ﷺ کە سوپاکەی لە (صفین) مۆڵ دابوو، وەفدەکەش بە سەرۆکایەتی (عەدی کوڕی

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٥٦-٢٥٨ .

حاتەمی طائی) بوو.

(عەدی كوڕی حاتەم) وەفدی عەلی بۆ لای موعاویە

(عەدی) بانگی (موعاویە)ی كرد بۆ بەیعەت دان بە (عەلی)، تا خودا دەنگی موسڵمانان یەكبخا و خوێن نەڕێژرێ و ئاشتەوایی ڕووبدا.

(موعاویە)ش‌ﷺ بەم شێوەیە وەڵامی داواكەی (عەدی) دایەوە: ئێمە (عەلی) ڕەت ناكەینەوە، لە سەر كارەكەیدا كێشەی لەگەڵ ناكەین، بە كوشتنی (عوسمان) تاوانباری ناكەین، بەڵام پەنای بكوژانی داوە، تەنها ئەوەندەمان لەو دەوێ كە بكوژانمان بداتە دەست تا بیانكوژینەوە، دوای ئەوە وەك ئەمیری بڕواداران بەیعەتی پێدەدەین و، گوێڕایەڵی دەبین.[1]

مەنتیقی (موعاویە)ﷺ ڕوونە، بۆچونەكەشی ئاشكرایە، بەڵام (عەلی)ﷺ لەو جۆرە بارودۆخەدا دەستەوسان بوو لە جێبەجێكردنی ئەوەی (موعاویە) داوای دەكات، لەبەر ئەو هۆیانەی كە لەپێشەوە باسمان كرد.

حەبیبی كوڕی مەسلەمە، وەفدی موعاویەیە بۆ لای عەلی

ئەركی (عەدی كوڕی حاتەم) لەلای (موعاویە) سەرنەكەوت.

پاشان (موعاویە)ﷺ لەلای خۆیەوە وەفدێكی نارد بۆ لای (عەلی) تا هەوڵبدەن قەناعەتی پێبكەن بە دانەدەستی بكوژانی (عوسمان)ﷺ و، كۆتایی هێنان بە جەنگ، وەفدەكەش بە سەرۆكایەتی (حەبیبی كوڕی مەسلەمەی فیهری) بوو، بەڵام هیچ سەرەنجامێكی نەبوو.[2]

مانگی موحەڕەم تێپەڕی و، هەوڵەكانی ئاشتەوایی نێوان هەردوولا سەركەوتوو نەبوو، مانگی صەفەر هات، دەبوایە جەولەی دووەمی زۆر توند و دڕندانە و دڵڕەقانەی جەنگی (صفین) ڕووبدات.

جەنگێكی وێرانكەر لە صفین

لە ڕۆژی چوارشەممەی یەكی مانگی صەفەر، جەنگێكی وێرانكەر دەستی پێكرد و هەتا ڕۆژی هەینی (دە)ی صەفەر بەردەوام بوو.

جەنگەكە لە (صفین)دا دە ڕۆژی تەواو بوو، توند و تیژ و وێرانكەر بوو، هەردوو سوپاكە چوونە پێش و كەوتنە ناو یەك و تێكگیر بون، تیایدا

---

١ ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٥٨ .

٢ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٥٦-٢٥٨ .

دەیان هەزار کوژراو کەوتن و، چەندانەی ئەوەش بریندار بون!!.

جەنگی (دە) ڕۆژی توندوتیژ

توندوتیژترین شەڕیش لە ڕۆژی پێنج شەممە (نۆ)ی صەفەر و شەوی هەینی (دە)ی صەفەردا بوو، کە بە (ليلة الهرير: شەوی هەسکەهەسك) ناونرا، چونکە جگە لە هەسکەهەسك و هانکەهانك نەبێ، هیچ دەنگ و قسەیەکی جەنگاوەرانی هەردوو سوپا نەدەبیسترا، ئەوەش بەهۆی ماندووبون و داهێزران و، بەجەرگی نواندن و جەنگانەوە بوو.

لەو شەوەدا بە ڕم شەڕیان دەکرد هەتا شکان و، بە تیر هەتا دوایی هات و، بە شمشێر هەتا تێکشکان[١]...

لە عەصری ڕۆژی هەینی (دە)ی صەفەردا، خەڵکی شام قورئانەکانیان بەسەر ڕمەکانیانەوە بەرزکردەوە و، کێشەی نێوان (عەلی) و (موعاویە)ﷺ چووە قۆناغێکی نوێوە.

کوژرانی عەمماری کوڕی یاسر لە (صفين)

لە جەنگی (صفين)دا (عەمماری کوڕی یاسر)ﷺ کوژرا، کە لەگەڵ (عەلی)دا بوو دژی خەڵکی شام.

(عبداللەی کوڕی سەلەمە) وتویەتی: لە ڕۆژی (صفين)دا (عەممار)م دیت، پیاوێکی پیری باڵابەرز بوو، حەربەکەی بەدەستەوە گرتبوو، دەستیشی دەلەرزی و، دەیوت: سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، بەم ئاڵایە سێجار لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ جەنگاوم، ئەمە چوارەمە! بەخوا ئەگەر لێمان بدەن هەتا دەمانگەیەننە (هوجەر-لە بەحرەین-)، گومانم لەوە نابێت کە ئێمە لەسەر هەقین و ئەوان لەسەر ناهەق.

لەو جەنگەدا (قەیسی کوڕی عوبادە) پرسیاری لە (عەمماری کوڕی یاسر) کرد و پێی وت: ئایا جەنگ کردنتان لەپاڵ (عەلی)، ڕایەکە و بۆی چوون، کە ڕا و بۆچونیش هەڵەدەکا و دەشپێکێ، یان سپاردە و پەیمانێکە پێغەمبەری خواﷺ پێی سپاردوون؟

(عەممار) وتی: پێغەمبەری خواﷺ هیچ ڕاسپاردەیەکی پێ نەداوین کە

---

١ـ بۆ باسکردنی هەر (دە) ڕۆژەکەی جەنگی (صەفین) سەیری (البداية والنهاية) ٧ : ٢٦٢-٢٧٣بکە.

بە سەرجەم خەڵکی نەدابێ.[١]

(عەممار) دان بەوەدا دەنێ کە جەنگانیان لەگەڵ (عەلی)دا بەهۆی ڕا و ئیجتهادەوە بووە، ڕا و ئیجتهادیش دەکرێ بپێکێ و دەشێ نەیپێکێ.

دەستەیەکی یاخیبوو عەممار دەکوژن

پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵمان پێدەدا کە دەستە و کۆمەڵێکی یاخیبوو (عەممار) دەکوژن.

(بوخاری) و (موسلیم) لە (ئەبوسەعیدی خودری)یەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عەممار)ی فەرموو: ((دەستەیەکی یاخیبوو دەتکوژن)).

(عبدالرحمنی سولەمی) کوژرانی (عەممار)مان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە (صفین)دا لەگەڵ (عەلی) بووین.. (عەممار)م بینی، بەهەر شیوێك لە شیوەکانی (صفین)دا بڕۆیشتایە، ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەوێ بون دوای دەکەوتن.

(عەممار)م بینی هات بۆ لای (هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبووەقاص)-برازای (سەعدی کوڕی ئەبووەقاص)- کە لە (صفین)دا هەڵگری ئالآی (عەلی) بوو.

(عەممار) بە (هاشم)ی وت: (هاشم) پێشکەوە! بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێراندایە، بەهەشت کراوەتەوە و حۆریەکان خۆیان ڕازاندۆتەوە.

اليَوْمَ أَلْقَى الأَحِبّه مُحَمَّداً وَصَحْبَهْ

ئەمڕۆ دەگەم بە خۆشەویستان، موحەممەد و هاوەڵان.

(هاشم) و (عەممار) هەڵمەتێکی بەهێزیان برد و سوپایان بڕی و، کوژران، ڕەحمەتی خوایان لێبێ.

بکوژی (عەممار)-کە (ئیبن جەوی سەکسەکی) بوو- هات بۆ لای (عەمری کوڕی عاص) و پێی وت: من (عەممار)م کوشت.

(عەمر) پێی وت: بەڵام بەخوا دەستت قازانجی نەکرد و، خودات تووڕە

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٦٧-٢٦٨.

**کرد!!**[١]

**(عبدالرحمنی سولەمی) وتویەتی: پاش ئەوەی (عەممار) کوژرا و، شەو داهات، وتم: دەبێ ئەمشەو بچمە سەربازگەی شامییەکانەوە، تا کاریگەری کوژرانی (عەممار) لەسەریان ببینم.**

چوار لە سەرکردەکانی سوپای شام لە کوژرانی عەممار دەکۆڵنەوە

**چوومە سەربازگەکەیانەوە، دیتم چوارکەس بەو شەوە قسە و گفتوگۆ دەکەن:**

**(موعاویە) و، (ئەبوئەعوەری سولەمی) و، (عەمری کوڕی عاص) و (عبداللەی کوڕی عەمر)ی کوڕی-چاکترین چوارکەس-، ئەسپەکەم هێنایە نێوانیانەوە، تا لێیان نزیك بم و گوێبیستی قسەکانیان بم و هیچ قسەیەکم لەدەست نەچێ.**

**(عبداللەی کوڕی عەمر) وتی: لەم ڕۆژەتاندا ئەو پیاوەتان کوشت، پێغەمبەری خوداشﷺ ئەوەی لەبارەوە فەرمووە کە فەرمویەتی؟**

عبدالله ی کوڕی عەمر فەرمودەی پێغەمبەر لەبارەی کوژرانی عەممار دەگێڕێتەوە

**(عەمر)ی باوکی وتی: چی فەرمووە؟**

**(عبداللەی کوڕی عەمر) وتی: کاتێك موسڵمانان مزگەوتی پێغەمبەری خوایانﷺ بنیات دەنا، خەڵکی یەك یەك بەرد و خشتیان دەگواستەوە، (عەممار)یش دوو دوو خشت و بەردی دەگواستەوە.**

**پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ لای و پێی فەرموو: ((بێبەلابی (عەممار)، دەستەیەکی یاخیبوو دەتکوژن))!!**

**(عەمر) ڕووی لە (موعاویە) کرد و پێی وت: ئایا نابیستی (عبدالله) چی دەڵێ؟**

**فەرموودەکەی بە (موعاویە) ڕاگەیاند، (موعاویە) وتی: بەڵێ، دەستەیەکی یاخیبوو (عەممار) دەکوژێ، ئایا ئێمە (عەممار)مان کوشتووە؟ بەڵکو ئەوانە کوشتویانە کە دەریانهێناوە و هێناویانە!!!.**

**ئیتر خەڵکی شام دەیانوت: بەڵکو ئەوانە (عەممار)یان کوشت کە**

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٦٨-٢٦٩.

**دەریانهێناوە و هێناویانە!!!.[١]**

**ئەم فەرموودە صەحیحە لەسەر کوژرانی (عەممار) لەسەر دەستی دەستەیەکی یاخیبوو، لە بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی (موحەممەد)ەﷺ، کە پێغەمبەری خواﷺ هەواڵی کوژرانی (عەممار) مان پێ ڕادەگەیەنێ، ئەو هەواڵەش دوای سی و حەوت ساڵ دێتەدی!.**

سوپای شام لە عەلی یاخیبون

**هەروەك ئەم فەرموودە (صحیح)ە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (عەلی) لە (موعاویە)ﷺ لە حەق نزیکترە و، خەڵکی شامیش دەستەیەکی یاخیبون، کە لە (عەلی) یاخی بون و لە فەرمانی دەرچون، وێڕای ئەوەی کە ئەهلی (حەل و عەقد) لە هاوەڵان وەك ئەمیری بڕواداران بەیعەتیان پێداوە، کەواتە بەیعەت و خەلیفایەتیەکەی شەرعی یە، کاتێکیش خەڵکی شام بەیعەتیان پێ نەدا و لە فەرمانی دەرچوون و لە دژی جەنگان -ئەگەریش بە ئیجتهاد و تەئویلکاری بوو و بیانوویان هەبوو-، ئەوا ئەوانە بونە دەستەیەکی یاخیبو لە ئەمیری بڕواداران.**

**بەڵام ئەو تەئویلەی (موعاویە)، بەوەی کە ئەوانەی (عەممار)یان کوشت سوپای (عەلی)ن، چونکە ئەوان هێناویانە بۆ (صفین)، ئەوە تەئویلێکی دوورە و لێی وەرناگیرێ!!.**

سەرکەوتن لە (صفین)دا بۆ سوپای عەلی یە

**لە ساتەکانی کۆتایی جەنگی (صفین)دا سوپای (عەلی) زاڵ ببون، کەوا ریزەکانی سوپای (موعاویە)یان بڕی و چونە ناویانەوە، نزیك بوو خەڵکی شام تێك بشکێن.**

**ئا لەو ساتانەدا (عەمری کوڕی عاص) چووە لای (موعاویە) و پێی وت: من ڕا و بۆچونێکم هەیە کە دەبێتە هۆی پتەوبون ویەك ڕیزی خۆمان و پەرتەوازەیی و لاوازی ئەوان، وادەبینم مەصحەفەکان بەرزکەینەوە و داوایان لێ بکەین کە قورئان بکەینە حەکەم، ئەگەر وەڵامیان داینەوە ئەوە**

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٧٠-٢٧١.

جەنگ كۆتایی پێدیٚ، ئەگەریش لە نێوان خۆیاندا ناكۆك بون، هەندیٚ ڕازی دەبن و هەندێك ناڕازی، ئەوا هەڵ دەوەشێن و هێز و پێزیان نامێنیٚ.

هەنگاوەكەی عەمری كوڕی عاص لە بەرزكردنەوەی (مصحف)ەكاندا

ئەبو وائل- برای دایكیی كوڕی سەلەمەی ئەسەدی تابعی-وتویەتی:- ئێمە لە (صفین)دا بووین، كاتێك كوشتارێكی زۆر لە خەڵكی شام كرا و زۆریان بۆ هات، پەنایان بردە پاڵ تەپۆڵكەیەك، (عەمری كوڕی عاص) بە (موعاویە)ی وت: (مصحف)ێك بنێرە بۆ عەلی، بانگەشەی بكە بۆ كتێبی خوا، چونكە ڕێگریت ناكات:

پیاوێك (مصحف)ێكی هێنا و، وتی: با كتێبی خوا لە نێوانماندا هەبیٚ، كێشەكەمان دەبەینە لای كتێبی خوا، پاشان ئەم فەرموودەی خوای خوێندەوە:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ: خۆ تۆ دیت، ئەو كەسانەی كە لە كتێبی ئێمەدا بەشێكیان پیٚ گەیشتبوو، خۆیان گوتیان بە هەرحوكمیٚ خودا بیدا ئێمە ڕازین، كەچی هێندێك لەوانە پێی ڕازی نەبوون.﴾ ال عمران:٢٣.

عەلی گوتی: بۆ ئەوە ئێمە لەئێوە لەپێشترین، با كتێبی خوا لە نێوانماندابیٚ.

ئا لێرەدا خەواریج لە فەرمانی دەرچوون، شمشێرەكانیان كردبووە ملیان و هاتن بۆ لای عەلی، ڕەتی داواكەی خەڵكی شامیان كرد لەوەی قورئان بكرێتە حەكەم، وتیان پێویستە بە شمشێرەكانمانەوە بچین بۆ لایان، تا خوای گەورە لە نێوانماندا بڕیاری خۆی دەدا.

پەرت بونی سوپای عەلی و بانگەوازی سەهلی كوڕی حەنیف

لێرەدا سەهلی كوڕی حەنیفی ئەنصاری رضي الله عنه وەستا و وتی: خەڵكینە! ڕاو بۆچونی خۆتان بەسەر دین دا هەڵبەست، لە ڕۆژی حودەیبیەدا منتان بینی، ئەگەر بمتوانیایە فەرمانەكەی پێغەمبەری خوام ﷺ ڕەت دەكردەوە.

پاشان سەهلی كوڕی حەنیف ئەو سەرسوڕمانە توندەی ڕوون كردەوە كە موسڵمانان لە كاتی وەفاتی عوسمانەوە تێی كەوتوون و، وتی: بەخوا لەوەتەی موسڵمان بووین شمشێرمان لە شان نەكردووە، مەگەر زانیبێتمان

بۆ چ کاروبارێك ئاڕاستەمان دەکا، جگە لەمەی ئێستا نەبێ تێی کەوتووین، لەمەدا هەر کون و کەلەبەرێك دەگرین، لە لایەکی ترەوە لێمان دەکرێتەوە، ناشزانین چۆن هەڵسوکەوتی تێدا بکەین.!!![1]

شامی و عێراقی یەکان حەزیان لە (تەحکیم) و ئاشتەوایی یەکە دەکرد، بەڵکو ئەمە ببێتە مایەی نەڕشتنی خوێنی موسڵمانان و کۆتایی هێنان بە ناکۆکیەکانیان.

تەنها خەواریج حەزیان بە (تحکیم) و ئاشتەوایی نەکرد، ئەوە بوو لە پاشان گرفتەکانیان لەگەڵ عەلی دا چەندانە بویەوە. بەم بانگەشەی (حوکم بردن بۆ لای قورئان)، جەنگی (صفین) کۆتایی پێهات.

لە ڕۆژی هەینی (دە)ی مانگی صەفەری ساڵی سی و حەوت کۆتایی پێهات.

قوربانیانی جەنگی (صفین) حەفتا هەزار بوو

کوژراوی موسڵمانان لە جەنگی (صفین)دا حەفتا هەزار کەس بوو.

ژمارەی کوژراوانی سوپای (موعاویە) چل و پێنج هەزار کوژراو بوو.!!

ژمارەی کوژراوانی سوپای (عەلی)ش بیست و پێنج هەزار کوژراو بوو!![2]

ئەمە جگە لە ژمارەی بریندار و پێکراوەکان.

دەزانین ئەمە ژمارەیەکی گەورەیە، ڕەقەمێکی بەرزە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ قوڵی ئەو کارەساتەی کە لەو ڕۆژانەدا تووشی موسڵمانان هات!!*

پێغەمبەر هەواڵی جەنگی (صفین) دەدات

پێغەمبەری خواش ﷺ پێش ڕودانی ئەم جەنگە بە چەندەها ساڵ

---

١ـ البداية و النهاية٧: ٢٦٨،٢٧٣.

٢ـ البداية و النهاية٧:٢٧٥.

* د.إبراهيم لە کتێبی (أباطيل يجب ان تمحو من التأريخ) ئاماژە بەوە دەکا کە مێژوو نوسە موسڵمانەکان لە دیاری کردنی ژمارەدا بە شێوەیەکی گشتی ورد نەبون، هەر بۆیە دەبینین لە هێنانی ژمارەی کوژراوانی جەنگەکاندا زیادەڕەوییان کردووە.. دەکرێ هەر لەم ڕوانگەیەشەوە سەیری ئەم جەنگانەش بکرێ.. کە دەکرێ عاملی گۆترەکاریش ڕۆڵی خۆی بینیبێ.. هەر چۆنێك بێ ئەم ژمارانە ئاماژەیە بۆ ترسناکی و زۆری ژمارەی کوژراوەکان.—وەرگێڕ—

هەواڵی ڕوودانی پێداوین.

ئەوەتانێ بوخاری و موسلم لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: ((لا تَقُومُ السّاعَةُ، حَتّى تَقْتَتِلَ فِئتانِ عَظيمَتانِ، مَقْتَلَةً عَظيمَةً، دَعْواهُما واحِدَة: قیامەت هەڵناستێ، تا دوو كۆمەڵی گەورە بەشەڕ دێن و كوژراوێكی زۆر لە یەكتری دەخەن، بانگەوازیشیان یەكە))[١].

لە ڕاستی دا هەردوو دەستەكە لە (صفین) گەورە و زۆر بون، سوپای عەلی سەد و بیست هەزار بوو، موعاویەش نەوەد هەزار بوو، كۆی هەردوو سوپاكەش دووسەد و دە هەزار كەس بوو، حەفتا هەزاریان كوژران! واتە سێیەكی موسڵمانان لە (صفین)دا كوژران!! كە ئەمەش كوشتارێكی گەورە و زۆرە!

بانگەوازی هەردوو دەستەكەش یەك بوو، كە ئەویش سەر خستنی حەق و بەرگری لێكردنی، لە ڕێی ئیجتهاد و تەئویلەوە بوو.!

ڕێكەوتنی هەردوولا لەسەر داوەری(تحكیم) كردن

پاش بەرزكردنەوەی (مصحف)ەكان و كۆتایی هاتنی جەنگی (صفین) بەو شێوەیەی كۆتایی پێهات، دوای چەندین نوسین و هاتوچۆكردن لەنێوان سوپای عەلی و موعاویەدا، هەردوولا لەسەر داوەری(تحكیم)ەكە ڕێكەوتن.

ئەوەش بەوەی كە عەلی لەلایەن خۆیەوە ناوبژیكارێك هەڵبژێرێت و، معاویەش لەلایەن خۆیەوە ناوبژیكارێك هەڵبژێرێ.

پاشان هەردوو ناوبژیكارەكە پێك بگەن و مشت ومڕ لەسەر چارەسەركردنی گرفتەكە بكەن، دوای ئەوە لەسەر ئەوە ڕێك دەكەون كە بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدایە و بڕیاری گونجاویان دەردەكەن و، پێویستە هەردوو لاش پابەندی بڕیار و حوكمەكانیان بن.

عەمری كوڕی عاص لەلایەن موعاویەوە

موعاویە لەلایەن خۆیەوە (عەمری كوڕی عاص)ی هەڵبژارد بۆ ناوبژیكاری، لە سوپای موعاویەدا هیچ گرفتێك نەبوو، هەمویان شوێنكەوتە و گوێبیست و گوێڕایەڵی موعاویە بون، ئەمەیش

---

١ـ البداية و النهاية ٧:٢٧٥.

تایبەتمەندیەکی تێبینیکراوی خەڵکی شام بوو!!

بەڵکو گرفت لە سوپای عەلیدا بوو، کە زۆرینەیان لە بیابان نشین و دەشتەکی و ئاژاوەچیەکان بون، کوفەش لەو ماوەیەدا بنکەی ئاژاوەچیەتی و یاخیبون بوو.

عەلی ویستی (عبداللەی کوڕی عەباس) هەڵبژێرێ، بۆ ئەوەی نوێنەر و جێگری ئەو بێت، بەڵام خەڵکی کوفە گێچەڵیان بە (عەلی) کرد و ئەمەیان ڕەت کردەوە و، وتیان: (عبداللەی کوڕی عەباس) کوڕی مامتە و، لەگەڵ خۆتدا ئەویشت نوقمی ئاژاوە کردووە.

زۆر کردن لە عەلی لەسەر بەوەفد ناردنی ئەبوموسای ئەشعەری

دەمانەوێ (ئەبوموسای ئەشعەری-عبداللەی کوڕی قەیس-) بکەیتە ناوبژیکار، چونکە ئەو بەربەستیی خەڵکی دەکرد لە ئاژاوە و جەنگ کردن، خۆی دورگرتوە لەسەرجەم ئەم روداوانە و، لە زەویەکیدا لە حیجازدا نیشتەجێ بووە، ئەو ساز و گونجاوە بۆ ئەوەی ببێتە ناوبژیکار!!

(عەلی) وتی: ئەگەر رازی نین (ئیبن عەباس) ناوبژیکار بێ، ئەوا (ئەشتەر) بکەنە ناوبژیکار!

وتیان: ئایا هەر (ئەشتەر) نەبوو جەنگی هەڵگیرساند و کاروباری تێکدا!!

خەڵکی کوفە لەسەر (ئەبوموسای ئەشعەری) سور بون، (عەلی)یش نەیدەویست بیکا بە ناوبژیکار، نەك وەك تانەدانێك لێی، ئەو هاوەڵێکی پایەبەرزە، بەڵام سەبارەت بە فیتنە هەمان رای ئەوی نەبوو، لە رووداوەکاندا شوێنی نەکەوتبوو، قەناعەتی بە بەڵگە و بیروبۆچونەکانی نەبوو، ئەی چۆن دەبێتە نوێنەر و نمایندەی ئەو؟؟

بەڵام (عەلی) زۆری لێکرا لەسەر (ئەبو موسای ئەشعەری)، سوپاکەشی بەسەر ڕایەکانیدا زاڵ بون و دەستیان بەسەر بڕیارەکانیدا گرتبوو، چونکە ئەوان لەگەڵ هۆز و کۆمەڵەکەیاندا بون و، (عەلی)یش هێز و کۆمەڵێکی خۆی لەگەڵیان نەبوو، بۆیە لە ئاستیاندا دەستەوسان بوو، ئەمەش قەدەری

ئەوبوو.

چوون بۆ لای (ئەبوموسای ئەشعەری) و، پێیان ڕاگەیاند کە خەڵکی ئاشت بونەتەوە و جەنگیان لە (صفین) ڕاگرتووە و، لەسەر داوەری(تحکیم) ڕێکەوتون. ئەویش وتی: (الحمد لله رب العالمین: سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان..

پاشان پێیان وت: لەلایەن (عەلی)یەوە تۆ کراویت بە ناوبژیکار. وتی: إنا لله وإنا إلیه راجعون.

دەقی نوسراوی تەحکیم لەنێوان هەردوولا و شاهێدەکانی

نوسراوی (تەحکیم)یان لەنێوان هەردوولادا نووسی، لە نوسراوەکەدا هاتووە: ئەمە ئەوەیە کە (عەلی کوڕی ئەبوطالب) و (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) لەسەری پێکهاتوون، (عەلی) لە بریی خەڵکی عێراق و ئەوانەی لەگەڵیدان و شوێنکەوتەی ئەون و، (موعاویە)ش لە بریی خەڵکی شام و ئەوەی لەگەڵیدایە لە موسڵمانان و بڕواداران:

ئێمە لە ئاست حوکمی خوا و کیتابەکەیدا ملکەچ دەبین، ئەوەی خوا دەیەوێ زیندووی دەکەینەوە و ئەوەشی نایەوێ دەیمرێنین.

هەردوو ناوبژیکار–کە (ئەبوموسای ئەشعەری) و (عەمری کوڕی عاص) بون– ئەوەی لە کیتابی خودا بەدییان کرد کاری پێدەکەن، ئەوەی لە کیتابی خوداشدا نەیانبینی، ئەوە پێویستە لەسەریان کار بە سوننەتی دادگەری گشتگیری کۆکەرەوە بکەن.[1]

هەردوو ناوبژیکار پەیمانیان لە هەردوو لا وەرگرت، کە خۆیان و ماڵ و منداڵیان پارێزراوە و، هەردوولاش پابەندن بەو حوکمەی دەری دەکەن.

لەسەر نوسراوی داوەری(تحکیم)ەکەش گەورە سەرکردەکانی سوپای (عەلی) وەك (عبداللەی کوڕی عەباس) و (ئەشعەسی کوڕی قەیس) و، گەورە سەرکردەکانی سوپای (موعاویە) وێنەی (ئەعوەری سولەیمی) و (عبدالرحمنی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید) و (حەبیبی کوڕی مەسلەمە) شاهێد بون.

---

١ـ البدایة والنهایة ٧ : ٢٧٦-٢٧٧.

پێککەیشتن لە مانگی ڕەمەزان لە(ئەزروح)دا

**هەردوو ناوبژیکارەکە ڕێکەوتن کە لە مانگی ڕەمەزان لە (ئەزروح)دا پێك بگەن.[١]**

**(ئەزروح) دێیەکە لە سەر چیاکانی (شەرات)، لە خوارووی ئوردون.**

**دوای ڕێکەوتن لەسەر داوەری(تحکیم) و سپاردنی کاروباری ئوممەت بە هەردوو ناوبژیکارەکە، هەردوو سوپاکە لە (صفین) کشانەوەو، هەریەکەیان گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.**

**(معاویە) گەڕایەوە بۆ شام، کە وڵاتێکە شوێنکەوتەی ئەون و گوێڕایەڵی فەرمانەکانین، (موعاویە) هیچ گرفت و گێچەڵێك یان هەڵگەڕانەوەو یاخیبونێکی تووش نەهات.**

عەلی ڕوبەڕوی خەواریجەکان دەبێتەوە کە (تحکیم) ڕەت دەکەنەوە

**(عەلی)ش (صفین)ی بەجێهێشت و گەڕایەوە کوفە، بەڵام ڕوبەڕوی ترسناکترین گرفت بوویەوە، کە ئەویش گرفتی (خەواریج) بوو، ئەوانەی لە (صفین)دا بەهۆی پەسەندکردنی (تحکیم)ەوە لە ژێر فەرمانی دەرچوون، پاشان گرفتەکەیان چەندانە بویەوەو لە دواتردا پەرەی سەند.**

**سەرەتا گرفتی (خەواریج) لەناو جەنگی (صفین)دا دروست بوو، کاتێك (عەلی) لەنێو جەنگەکەدا بە داوەری(تەحکیم) ڕازی بوو، (ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی) چوو بۆ لای (بەنی تەمیم) تا هەواڵی داوەری(تەحکیم)یان پێ ڕابگەیەنێ، (عوروەی کوڕی جەریری تەمیمی) هەستا بۆ لای و وتەیەکی دەربڕی کە دواتر بووە دەستوور و دروشمێك بۆیان.**

**وتی: لە دینی خوادا مرۆڤ دەکەنە ناوبژیکار؟**

خەواریجەکان عەلی کافر دەکەن ولێی جیادەبنەوە

**دوای ئەوە خەواریجەکان دەیانوت: حوکم تەنها بۆ خوایە.. ئەم وتەیە ڕەوابوو، بەڵام مەبەستیان پێی شتێکی ناڕەوا بوو.[٢]**

ودەچن بۆ حەرورا،

**کاتێ عەلی گەیشتە کوفە، دوانزە هەزار لە سوپاکەی لێی جیابونەوەو، لە فەرمانی دەرچوون، چونکە بە (تەحکیم) ڕازی بووە و، بەمەش مرۆڤی لە**

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٧٧-٢٧٨.

٢ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٨٨-٢٨٩.

دینی خوادا کردووە بە ناوبژیکار، لەگەڵ ئەوەشدا کە حوکم تەنها بۆ خوایە، بەمەش کوفری کردووە و لە دینی خوا دەرچووە، جا بەهۆی ئەم کوفر و هەڵگەڕانەوەیەی پێویستە جەنگ لەدژیدا بکرێ!!!

ئەم خەواریجانە لە گەڵ عەلی نەهاتنە ناو کوفەوە، بەڵکو چوون بۆ دێیەك کە پێی دەوترا (حەروراء)، هەر بەم ناوەشەوە ناونران (حەروری‌یەکان)، هەروەك بە (خەواریج) و (موحەکیمە)ش ناودەبران، خۆیشیان ناوی خۆیان ناو دەنا بە (الشُّراة) واتە ئەوانەی خۆیان بەخوا فرۆشتووە.

پێغەمبەر هەواڵی دەرچوونی خەواریجەکان دەدات

پێغەمبەرﷺ هەواڵی دەرچوونی ئەم خەواریجانەی ڕاگەیاندووە، ئەوەتا (موسلیم) لە (ئەبوسەعیدی خودری)یەوە دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوەﷺ، فەرمویەتی: ((تَمرقُ مَارِقَة،عِنْدَ فُرْقَةٍ مِنَ المُسلِمِين، تَقْتُلُهُم أوْلَى الطائِفَتَين بالحَق: لەکاتی پەرتەوازەیی موسڵماناندا، هەندێ لە ڕێ دەردەچن، یەکێ لەو دوو کۆمەڵە دەیانکوژن کە لە حەقەوە نزیکترن)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە فەرمویەتی: ((تَكُنُ أُمَّتِي فِرْقَتَين، تَخْرُجُ بَيْنَهُما مارِقَة، تَلي قَتْلَها أولاهُما: ئوممەتەکەم دەبن بە دوو دەستەوە، لەنێوانیاندا هەندێ لەڕێ دەردەچن، ئەوانەی لە حەقەوە نزیکترن لەڕێدەرچوەکان دەکوژن)).

چەند ئاماژەیەکی گرنگی ئەم فەرمودەیە

(ئەبوسەعیدی خودری) دەربارەی ئەم فەرمودەیە دەدوێت و بە خەڵکی عێراق دەڵێت: ئەی خەڵکی عێراق! ئێوە ئەوانەتان کوشت..

ئەم فەرمووده صەحیحە ئاماژە بە چەندین بەڵگە دەکات:

لەوانە: سەلماندنی پێغەمبەرایەتی، بەوەی پێغەمبەری خواﷺ هەواڵی لە ڕێدەرچوونەکەیان ڕادەگەیەنێ و، هەر واش بوو، ئەوەبوو پاش چەندەها ساڵ لەڕێدەرچوون.

لەوانە: لەڕێدەچوونیان لەکاتی پەرتەوازەیی و جیاوازی موسڵماناندا، هەروەك لە ڕۆژی (صفین) ڕوویدا.

لەوانە: بڕیاردانی موسڵمانێتی هەردوو دەستە ناکۆکەکە" سوپای عەلی

عەلی لە معاویە لە هەقەوە نزیکتر

و سوپای موعاویە.

لەوانە: بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ئەو دەستەیەی لەگەڵ خەواریجەکان دەجەنگێت لەسەر هەقن. ئەمەش مانای وایە (عەلی) و هاوەڵانی لە (موعاویە) و هاوەڵانی لە هەقەوە نزیکترن، لەگەڵ ئەوەی (موعاویە) و هاوەڵانی لەسەر هەقن، بەڵام (عەلی) و هاوەڵانی لەهەق لەپێشتر و نزیکترن: ((تَقْتُلُهُم أَوْلَى الطائِفَتَين بِالحَق)).[1]

ئیبن عەباس لەگەڵ خەواریجەکان گفتوگۆ دەکات و نیوەیان دەگێڕێتەوە

کاتێك خەواریجەکان لە فەرمانی (عەلی) دەرچوون و چوون بۆ (حەروراء)، (عبداللەی کوڕی وەهەبی راسبی)یان کردە سەرکردەی خۆیان.

(عەلی) ویستی ئاژاوە و فیتنەکەیان لەناو ببات و، بیانگێڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵی موسڵمانان، ئەوەبوو کاتێك لە (حەروراء)دا بون، (عبداللەی کوڕی عەباس)ی نارد بۆ لایان، تا گفتوگۆیان لەگەڵ بکا و بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنێ.

(ئیبن عەباس) سێ ڕۆژ لایان مایەوە، گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و گومانەکانیانی دەڕەواندەوە، لە کۆتاییدا توانی قەناعەت بە نیوەیان بکا، ئەوەبوو پەشیمانیان ڕاگەیاند و، وازیان لە دەرچوون لە فەرمانی (عەلی) هێنا و، گەڕانەوە ناو کۆمەڵی موسڵمانان، (ئیبن عەباس)یش هێنایانیەوە لای (عەلی) لە کوفە.

بەڵام نیوەکەی تریان لەسەر ڕاکەی خۆیان سوور بون.

عەلی هەڵوێستی خۆی بە خەواریجەکان ڕادەگەیەنێ

(عەلی) نێرراوێکی بۆ لای ئەمانە نارد و پێی وتن: با لەنێوان ئێمە و ئێوەدا بەڵێن بێت کە خوێنی حەرام نەڕێژن و ڕێگری نەکەن و، ستەم لە پەنادراو(ذمی) نەکەن، ئێمەش لە مزگەوتەکانی خوا بەربەستیتان لێ ناکەین و لە شەڕکردنتان دەستپێشخەری ناکەین تا ئێوە دەستپێشخەری نەکەن.[2]

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٧٩-٢٨٠.

٢ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٨١.

دروشمیان: حوکم تەنها بۆ خوایە. وتەیەکی ڕەوایە مەبەستیان پێی ناڕەوایە

ڕۆژێك (عەلی) لە کوفەدا وتاری دەدا، یەکێك لە خەواریجەکان بۆی هەستا و پێی وت: عەلی! لە ڕاستی دا تۆ مرۆڤت کردووە بە هاوبەش لە دینی خوادا، حوکمیش تەنها بۆ خوایە.

هەندێ خەواریجی تر لە دەوروبەری مزگەوتدا بون، هاواریان کرد: حوکم تەنها بۆ خوایە، حوکم تەنها بۆ خوایە.

(عەلی)یش وەڵامی دانەوە و وتی: ئەمە وتەیەکی ڕەوایە، بەڵام بۆ مەبەستێکی ناڕەوا بەکاری دەهێنن.

ئەمە وتەیەکی پێکراوی (عەلی) بوو، ئەوەی کە خەواریجەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، لەو وتەیەی کە دەڵێن: حوکم تەنها بۆ خوایە، لە خودی خۆیدا وتەیەکی ڕەوایە، شتێکی ئاشکرایە لە ئیسلامدا کە فەرمانڕەوا خوایە، فەرمان و حوکمیش هەر فەرمان و حوکمی ئەوە، فەرمانڕەوایەتی(حاكمية)ش یەك لە تایبەتمەندیەکانی خوایەتی‌یە، ئەمەش هەرهەمووی تەواو و دروستە.

بەڵام خەواریجەکان بەم ڕەوایە ناڕەوایان مەبەست بوو، دەیاونیست ئەم ڕەوایە بۆ ئاژاوەگێڕی و هەڵگەڕانەوە و دەرچوون لە فەرمانی خەلیفە، بەڵکو بە کافر کردنیشی وەگەڕخەن. وتەکەش ئاماژە بەوە ناکات و ئەو ناڕەوایەی لێ دەرناهێنرێ.

عەلی لەگەڵ ئەو خەواریجانەی بە کافریان داناوە بەویژدان دەبێت

لە شوێنێکی تردا، (عەلی) لەگەڵ ئەو خەواریجانەی بەکافریان دانا و خوێنیان حەڵاڵ کرد بەویژدان بوو.

لە (عەلقەمەی کوڕی عامر)ەوە کە وتویەتی: دەربارەی خەواریج پرسیاریان لە (عەلی) کرد: ئایا ئەوانە هاوبەش پەرست(مشرك)ن؟

عەلی وتی: نەخێر، هاوبەش پەرست نین، بەڵکو لە هاوبەش پەرستی و بێبڕوایی هەڵاتوون!

پێیان وت: ئایا ئەوانە دووڕوون؟

وتی: نەخێر، دووڕووەکان بەکەمی نەبێ یادی خوا ناکەن، ئەمانە یادی خوا زۆر دەکەن.

پێیان وت: کەواتە ئەی ئەمیری بڕواداران! ئەوانە چین؟

وتی: برامانن، غەدر و ناهەقیان بەرامبەر کردوین، بەهۆی غەدر و ناهەقیانەوە لەدژیان جەنگاوین!![1]

کۆبونەوەی هەردوو ناوبژیکارەکە لە (ئەزروح)

لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی سی وحەوتدا، کاتی کۆبونەوەی دوو ناوبژیکارەکە هات هەروەك لە (صفین) لەسەری ڕێکەوتبون.

(عەلی) لەلایەن خۆیەوە چوارسەد پیاوی نارد، تا شاهێد و ئاگاداری داوەرییەکە بن، لەناویاندا (عبداللەی کوڕی عەباس) بوو، (موعاویە)ش لەلایەن خۆیەوە چوارسەد پیاوی نارد، کە (عبداللەی کوڕی عومەر) لەناویاندا بوو.

هەردوو ناوبژیکارەکە (ئەبوموسای ئەشعەری) و ( عەمری کوڕی عاص) لە (ئەزروح) پێك گەیشتن، کە لەو کاتەدا سەر بە (دومة الجندل) بوو.

چاو برابووە سەعدی کوڕی ئەبووەقاص

هەندێ موسڵمان ویستیان (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) بەشداری داوەرییەکە بکا و، داوای لێبکەن تا ببێتە ئەمیری بڕواداران، تا دەنگی موسڵمانان یەك بخات.

(سەعد)یش لە سەردەمی (عومەر) و (عوسمان)دا لە ڕاوێژکاران بوو، یەکێك بوو لەو (دە) کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێدرابوو، کە لە ساڵی سی و حەوتدا تەنها سیانیان بە زیندوویی مابونەوە: (عەلی) ئەمیری بڕواداران کە دژی نەیارەکانی دەجەنگا و، (سەعد) و (سەعیدی کوڕی زەید)، کە خۆیان دوورگرتبوو لە ئاژاوە و جەنگان و، هەریەکەیان لە زەویەکەی خۆی لە دەوروبەری مەدینە نیشتەجێ ببون.

هەندێ لە لە خەڵکی چاویان بڕیبوە (سەعد) و، هیواخوازبون کە خەلافەت بگرێتە دەست و دەنگی موسڵمانان یەك بخات، بەڵام ئەو خۆی لەو کارە بەدەرکرد و خۆ دوورگرتن لە فیتنەی هەڵبژارد.

عومەری کوڕی سەعد داوا لەباوکی دەکات هەوڵ بۆ خەلیفایەتی بدات

ئیمام (موسلیم) لە صەحیحەکەیدا لە (عامری کوڕی سەعدی کوڕی

[1] ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٩.

**ئەبووەقاص)ەوە دەگێڕێتەوە، کە (عومەری کوڕی سەعد)ی برای چوو بۆ لای (سەعد)ی باوکی کە لەو کاتەدا لە دەرەوەی مەدینە لەناو مەڕەکانی خۆی بوو.**

**کاتێك (سەعد) (عومەر)ی کوڕی بینی بەرەو لای دێت، وتی: پەنا بەخوا لەشەڕی ئەو سوارە!.**

**کوڕەکەی هاتە لای و پێی وت: باوکەگیان! ئایا ڕازیت تۆ وەکو کۆچەرییەك لەنێو مێگەلەکەتدا بیت، خەڵکیش لەسەر دەسەڵات و خەلافەت پەلکێشیانە؟ هەستە ئامادەیان بە، ئاگادار بە، تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺ و ئەهلی ڕاوێژیت، بەشداری شتێکت نەکردووە ئوممەت پێی ناخۆش بێت، تۆ بۆ خەلافەت لە هەموو کەس شیاوتری!!.**

**(سەعد) کێشای بە سینگی (عومەر)دا و پێی وت: بێدەنگ بە، من گوێبیستی پێغەمبەری خواﷺ بووم دەیفەرموو: ((إنَّ اللهَ يُحِبُّ العَبْدَ التَقيَّ الغَنيَّ الخَفيَّ: لەڕاستیدا خوا بەندەیەکی خۆپارێزی بێنیازی شاراوەی خۆش دەوێ)).**

عومەر بۆ قەناعەت پێکردنی باوکی پەنا دەباتە بەر عامری برای

**جا کاتێ (سەعد) بەدەم داواکەی (عومەر)ی کوڕی نەچوو، (عومەر) پەنای بردە بەر (عامر)ی برای تا قەناعەت بە باوکی بکا تا بچێت بۆ لای خەڵکەکە و ببێتە ئەمیری بڕواداران.**

**(عامر) هات بۆ لای باوکی و پێی وت: باوکەگیان، خەڵکی لەسەر دونیا بەشەڕ دێن و تۆش لێرەی؟**

سەعد شمشێرێکی قسەکەری دەوێت!

**پێی وت: کوڕی خۆم! دەتەوێ ببمە سەری ئاژاوە و فیتنە؟ نە بەخوا دەرناچم تا شمشێرێکم پێنەدەن کە جیاوازی بکات لەنێوان ئەوانەی لەگەڵیدا دەجەنگێم، ئەگەر لە گەردنی بڕوادارێکم دا، نەیبڕێ و کاری تێنەکا، ئەگەریش لە گەردنی بێبڕوایەکم دا، بیبڕێ و بیکوژێ!!!.**

**پاشا پێی وت: کوڕی خۆم! من گوێبیستی پێغەمبەری خواﷺ بووم دەیفەرموو: ((لەڕاستیدا خوا بەندەیەکی خۆپارێزی بێنیازی شاراوەی**

بارودۆخی
طشتی لة
کاتی

خۆش دەوێ)).[١]

لەبیرمان نەچێ لەکاتی کۆبونەوەی هەردوو ناوبژێکارەکە لە (ئەزروح)دا تەنها یەك خەلیفە هەبوو، کە ئەویش (عەلی کوڕی ئەبوطالب) بوو، هەر ئەو شوێنکەوتەکانی و هاوەڵانی و ئەوانەی لەگەڵیدا بون بە ئەمیری بڕوادارانیان دادەنا.

تەنها عەلی ئەمیری بڕواداران بوو، موعاویەش والی شام

بەڵام (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) بانگەشەی خەلافەتی نەدەکرد، خۆی بە ئەمیری بڕواداران دانەدەنا، شوێنکەوتەکانی و هاوەڵەکانی بەیعەتی ئەوەیان پێنەدابوو کە ئەو ئەمیری بڕواداران بێ.

واتە جیاوازی و ناکۆکی و جەنگەکە لەنێوان دوو خەلیفە و ئەمیری بڕواداران-عەلی و موعاویە- نەبوو، بەڵکو لەنێوان ئەمیرێکی بڕواداران کە زۆرینەی موسڵمانان بەیعەتیان پێدابوو و، هەندێکیشیان-کە خەڵکی شام بون بە سەرکردایەتی موعاویە- رەتی بەیعەت پێدانیان کردبوو، مەگەر دوای تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمان و کوشتنیان.

موعاویە لەسەر خەلافەت کێشەی لەگەڵ عەلی نەبوو

واتە (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) خۆی وا راگەیاندبوو کە تۆڵەستێنی خوێنی شەهید (عوسمان)ە و، والی شامی سەردەمی (عومەر) و (عوسمان)ە و، لەکارخرانیشی لەلایەن (عەلی)یەوە شتێکی دروست و تەواو نیە، چونکە (عەلی) لە دیدی ئەودا ئەمیری بڕواداران نیە تا ئەو لەکار بخا، ئەو هەر بە والیەتی شام دەمێنێتەوە، تا ئەمیرێك بۆ بڕواداران پەیدا دەبێت و تۆڵە لە بکوژرانی (عوسمان) دەسێنێتەوە و، سەرجەم موسڵمانانیش بەیعەتی پێدەدەن، گرنگ نیە ئەگەر (عەلی) بێ، یان هەر هاوەڵێکی تر.

(موعاویە) لەسەر خەلافەت کێشەی لەگەڵ (عەلی)دا نەبوو، لەو پێناوەشدا لەدژی نەجەنگا، وەهاش خۆی پیشان نەدەدا کە ئەو لە عەلی بۆ خەلافەت شیاو تر بێ، بەڵکو لەسەر ئەوە بوو عەلی داوای بەیعەت پێدان و گوێڕایەڵی کردنی لێدەکرد، موعاویە تانەی لە شیاوێتی عەلی بۆ خەلافەت

---

١ـ البداية والنهاية ٧ : ٢٨٣.

نەدەدا، خۆیشی وەك بەدیل و جێگرەوەیەکی عەلی بۆ خەلافەت پیشان نەدەدا، بەڵکو تانەی لە پەلەکردنی عەلی بۆ خەلافەت دەدا و، تانەی لەوە دەدا کە سەرجەم موسڵمانان بەیعەتیان پێی نەداوە و، خاوێتی نواندووە لە سزادانی بکوژانی عوسمان دا.

ئەم مەسەلەیە لەگەڵ خۆمان هەڵ دەگرین و چاوەڕێی کۆبونەوەی هەردوو ناوبژیکارەکە –ئەبو موسا و عەمر– دەکەین تا ڕاستێتی مەسەلەکە بزانین.

دید و بۆچونی موعاویە و ئەوانەی لەگەڵی بون لە بەیعەت نەدانیان بە عەلی

وێنەکە لەبەر دەم هەردوو ناوبژیکارەکەدا بەم شێوەیە بوو: دەستەیەکی گەورەی موسڵمانان بەیعەتیان بە عەلی کوڕی ئەبوطالب دابوو وەك ئەمیریْ بۆ بڕواداران و گوێڕایەڵی بوون، دەستەیەکی تری موسڵمانان –موعاویە و خەڵکی شام– ئەم مەسەلەیان پەسەند نەدەکرد و ڕەتیان کردەوە، نەك وەك تانەدانێك لە شیاوێتی عەلی، یا بەربەرەکانی کردنی لەسەر خەلافەت، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە دیدی ئەواندا – جێنشینیەتی‌یەکەی بەپێی بنەما ئیسلامیە دروستەکان نەبوەو، سەرجەم هاوەڵان بەیعەتیان پێی نەداوە.

پاشان تاوەکو ئێستاش نەیتوانیوە پیادەی یاسا و فەرمانەکانی خوا بکا و حەد بەسەر بکوژانی عوسماندا جێبەجێ بکا، پاشانیش بکوژانی عوسمان لەناو سوپاکەیدا هاوشانی دەجەنگێن، لە کاتێکدا ئەوان تاوانکار و یاخی و بکوژن، دوای ئەوە خەلافەتی عەلی بووەتە هۆی پەرتەوازەیی لە نێوان موسڵماناندا، ئەوەتانێ چەندان جەنگ لە نێوانیاندا هەڵگیرسا، جەنگی جەمەل (دە) هەزار کەسی تێدا کوژرا و بە زیادەی ئەوەندەی تری بریندار، جەنگی (صفین) حەفتا هەزاری تێدا کوژرا، بەزیادەی ئەوەندەی تر بریندار.

بۆچی عەلی لە خەلافەت دانابەزێ

ئایا گونجاوە لەگەڵ هەموو ئەمانەدا عەلی کوڕی ئەبوطالب بە خەلیفە و ئەمیرێتی بڕواداران بمێنێتەوە؟ لەگەڵ ئەوەی هەموو بڕواداران پێی ڕازی نین؟ جا ئەگەر درێژە بە خەلافەت بدا ئەوە جەنگەکانی نێوان موسڵمانان

بەردەوام دەبێ؟ یا واز لەو كارە بێنێ و كاروبارەكە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكانی؟ كە ئەوانیش ئەهلی حەل و عەقدن لە هاوەڵان، تا كەسێكی شیاو بۆ ئەمیرێتی بڕواداران دەست نیشان بكەن، كە سەرجەم موسڵمانان لەسەری یەك دەنگ دەبن!!

جا ناوبژیكارەكان لە (ئەزروح)دا لەمەیان كۆڵیەوە.

ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری كوڕی عاص ڕێكەوتن لەسەر ئەوەی كاروباری خەلافەت بگێڕنەوە بۆ خاوەنەكانی، كە ئەهلی حەل و عەقدن لە هاوەڵان، ئەو هاوەڵانە دەگرێتەوە كە لە ژیاندان و پێش وەفاتی، پێغەمبەری خواﷺ لێیان ڕازی بووە.

وێنەی: عەلی كوڕی ئەبوطالب، سەعدی كوری ئەبی وەقاص، سەعیدی كوڕی زەید، عبداللەی كوڕی عومەر، ئەمانە لەو ڕاوێژەدابون كە عوسمانی تێدا دەست نیشان كرا- هەردوو ناوبژیكارەكە لە (ئەزروح) ڕێكەوتن كە ئەو گەورە هاوەڵانە پێك بگەن و لە نێوان خۆیاندا كەسێك بۆ ئەمیرێتی بڕواداران دەست نیشان كەن و، بەڕەزامەندی خۆیان بەیعەتی پێ بدەن، پاشان موسڵمانانی هەموو شار و وڵاتان بەیعەتی پێ بدەن.

ڕێكەوتنیان لەسەر ئەمە، مانای وازهێنانی ئێستای (عەلی)یە لە خەلافەت، چونكە سەرجەم موسڵمانان بە جێنشینیەتی ئەو ڕازی نین، جا گەر لەلایەن ئەهلی حەل و عەقدەوە هەڵبژێررا ئەوا باشتریش، ئەگینا ئەویش بەیعەت بەو كەسە دەدا كە بڕواداران ڕازین ئەمیریان بێت.

موعاویە نە لەكار لادرا و نە جێگیریشیان كرد

بەڵام موعاویە نە لە كارەكە لادرا، نە جێگیریشیان كرد، ئەبو موسا لە كاری نەخست تا عەمر دایبنێتەوە، چونكە موعاویە لە كاتی تەحكیمەكەدا ئەمیری بڕواداران نەبووە، ئەمەش داوانەكراوە و لەسەر ئەوەش بەیعەتی پێ نەدراوە.

موعاویە تەنها لە دوای شەهید كردنی عەلی، پاش وازهێنانی حەسەنی كوڕی لە خەلافەت لەساڵی كۆمەڵ(الجماعة)دا وەك ئەمیری بڕواداران

**بەیعەتی پێدراوە.**

وەستاندنی جەنگ تا کاتی هەڵبژاردنی خەلیفە

**هەردوو ناوبژیکارەکە ڕێکەوتن لەسەر ئەوە تا ئەو کاتەی ئەهلی حەل و عەقد لە گەورە هاوەڵان کۆ دەبنەوە بۆ دەستنیشان کردنی ئەمیری بڕواداران، عەلی سەروکاری ئەو وڵاتانە دەکات کە لە ژێر دەستی دان، کە عێراق و حیجاز و یەمەنە، موعاویەش سەروکاری ئەو وڵاتانە دەکات لە ژێر دەستی دان، کە شام و میصر و ئەفریقیایە، ڕێکەوتنیش لە نێوانیاندا دەبێ بەرپا بێ.**

ئیبن عاص ڕووداوەکانی نێوان خۆی و ئەبی موسا دەگێڕێتەوە

**عەمری کوڕی عاص ﷺ هەندێ لە ڕووداوەکانی نێوان خۆی و ئەبو موسا لە کاتی (تەحکیم)ەکەدا دەگێڕێتەوە.**

**(حەضینی کوڕی منذر) –کە لە پیاوەکانی عەلی بوو– هاتە لای عەمر و پرسیاری لێ کرد: سەبارەت بەو کارەی کە بە تۆ و ئەبو موسا سپێردراوە، چیتان تێدا کردوە؟ هەواڵم بدەرێ. عەمر وتی: خەڵکی زۆریان لەسەری وت، بەخوا کارەکە بەو شێوەیە نەبوو کە خەڵکی دەیانوت.**

**بەڵام من بە ئەبو موسام وت: ڕات لەم کاروباری خەلافەتەدا چۆنە؟**

**ئەبو موسا وتی: من وای دەبینم لەناو ئەو کەسانەدا بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ تا وەفاتی کرد لێیان ڕازی بووە، تا لە نێوان خۆیاندا کەسێك بە ئەمیر هەڵبژێرن.**

**پێیم وت: ئەی من و موعاویە لە کوێ دادەنێی؟ ئەبو موسا وتی: ئەگەر ئەمیری بڕواداران پشتتان پێ ببەستێ ئەوا ئێوە هاوکاریتان لێ دەوەشێتەوە، خۆ ئەگەر بێنیاز بێ لێتان، ئەوا ئێوە بڕیار و فەرمانی خوایی بێ نیازی کردوون!!**

ئەبو موسا هەندێ لەوتەکانی (ئیبن عاص)مان بۆ دەگێڕێتەوە

**ئەبو موسا سەبارەت بە وەرعی عەمر لێپرسینەوەی نەفسی خۆی و وەبیرهێنانەوەی ڕێژین(سیرة)ی ئەبوبەکر و عومەر و ترسانی لە داهێنانی شتی ناشایستە لە دوای ئەوانمان بۆ دەگێڕێتەوە.**

**ئەبو موسا وتویەتی: عەمری کوڕی عاص پێی وتم: بەخوا ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر ئەم ماڵ و سامانەیان بەجێ هێشت لە کاتێکا بۆیان ڕەوا**

و دروست بوو بەکاری بێنن، ئەوا زەرەمەند و هەڵە بون و، ڕایەکەیان کەم و کورت بوە لە ڕایەکانیاندا.

بەخوا زەرەرمەند و هەڵەکار نەبون و لە راوبۆچونیاندا کەم و کورت نەبون.

بەخوا هەرچی خەیاڵ و بێهێزی و لاوازیەك کە توشمان هاتبێ بەهۆی خۆمانەوە بووە.[١]

بەڵام ئەو هەنگاوە جێبەجێکاریە کرداریەی هەر دوو ناوبژیکارەکە لەسەری ڕێکەوتن کە ئەنجامی بدەن تەواو نەکرا.

ئەو سەرەنجامەی هەردوکیان پێی گەیشتن هەردوو لای ڕازی نەکرد، گەورە هاوەڵانیش بۆ دەستنیشان کردنی ئەمیری بڕواداران کۆنەبونەوە، کارەکەی نێوان عەلی و موعاویەش بەشێوەی خۆی مایەوە.

عەلی سەروکاری ئەو وڵاتانەی دەکرد کە لەگەڵیدا بون، خەڵکەکەشی وەك ئەمیرێکی بڕواداران بەیعەتیان پێی دەدا، موعاویەش سەروکاری ئەو وڵاتانەی دەکرد کە لە گەڵیدا بون، بەو پێیەی والیە نەك ئەمیری بڕواداران، لە نێوانیانیش دا تا ماوەیەك ڕێکەوتن هەبوو.

بەم شێوەیە کاروباری داوەریی‌کردن(تحکیم) کۆتایی پێهات و گرفتەکەش چارەسەر نەکرا[٢]. کاتێك کاروباری (تحکیم) بەبێ ڕێکەوتن کۆتایی پێهات، شام هێمن و ئارام بوو، کە سەر بە موعاویە بو، بەڵام عەلی لەلای خۆیەوە گرفتی خەواریجەکانی لەسەر گەورە بوو.

خەواریج بە سەرکردایەتی (ڕاسبی)

خەواریجەکان بەرە و، نەهرەوان دەرچوون، لە وێش سوپایەکی چەکداریان پێك هێنا، یەکەم کەسێکیان کرد بە ئەمیری خۆیان عبداللەی

١ـ (العواصم من القواصم)ی إبن العربي ١٧٨-١٨٠.

٢ ـ سەیری ئاراستە و بۆچونی هەر یەکە لە ابن العرب و محی الدین الخطیب بکە سەبارەت بەوەی لە نێوان ئەبو موسا و عەمر لە تەحکیم دا ڕوویدا لە (العواصم و القواصم) ١٧٢-١٨٠ لەگەڵ پەراوێزی لاپەڕەکاندا.

کوڕی وەهەبی ڕاسبیی بوو.

لەو ناوچەیەدا دەستیان کرد بە خراپەکاری، خوێنی موسڵمانانیان ڕشت، ڕێیان لێ دەگرتن و خوێن و سامانیان حەڵاڵ دەکردن.

خەواریج عبدالله ی کوڕی خەباب و ژنەکەی دەکوژن

یەکەم تاوانێکی کوشتن کە لە دەستیان ڕوویدا، ئەوە بوو یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بەلایاندا تێپەڕی کە ئەویش ((عبداللهی کوڕی خەبابی کوڕی ئەرەت)) بووﷺ ئافرەتەکەشی لەگەڵ دا بوو کە دووگیان بوو.

پێیانوت: تۆ کێی؟

ووتی: عبداللهی کوڕی خەباب، هاوڕێی پێغەمبەرﷺ .

ووتیان: فەرموودەیەکمان پێ بڵێ لە باوکتەوە بیستبێتت.

ووتی: گوێبیستی خەبابی کوڕی ئەرەت بووم دەیگوت: پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی: ((لەمەولا فیتنە و ئاژاوە ڕوو دەدا، ئەوەی لێ ی دانیشتووە باشترە لەوەی بە پێوەیە، ئەوەشی بە پێوەیە باشترە لەوەی تیایدا دەڕوا، ئەوەشی ئاسایی دەڕوا باشترە لەوەی بەپەلەیە تیایدا)).

دایان لەبەر، پاشان سەریان بڕی، دوای ئەوە ژنەکەشیان سەر بڕی و سکیشیان هەڵ دڕی[١].

گفتوگۆی عەلی لەگەڵ خەواریج پێش جەنگانیان

عەلیﷺ بۆ شەڕی خەواریج لە نەهرەواندا دەرچوو، کاتێك پێیان گەیشت قسەیەکی دوور و درێژ لە نێوانیاندا ئەنجام درا، هەر وەك هەر یەکە لە (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری) و (قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە) قسەی لەگەڵ کردن، بەلام هەر نەگەڕانەوەو گوێڕایەڵ نەبون.

جەنگی نەهرەوان و کوژرانی سەرکردەی خەواریجەکان

پاش ئەوە (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری)ﷺ ئالای دڵنیایی و پاراستنی بەرزکردەوە.

بانگکەرێك لە لایەن عەلیەوە بانگی کرد:

هەر کەسێ بێتە ژێر ئەم ئالایە ئەوە پارێزراوە، هەر کەسێکیش بچێت بۆ کوفە و مەدائن هەر پارێزراوە، ئێمە پێویستیمان بە جەنگ و کوشتاری

---

١ـ البداية و النهاية ٧: ٢٨٨.

ئێوە نیە، بەڵام ئەوانەمان دەوێ کە براکانمانیان کوشتووە.

جا زۆرینەیان ڕۆیشتن و، نزیکەی هەزار کەسیان لەگەڵ (راسبی) ئەمیریان مانەوە، جەنگی (نەهرەوان)یش لەنێوان عەلی و ئەواندا روویدا، کە یەکەم جەنگ بوو لەدژی خەواریجەکان و، بە کوژرانی زۆرینەی سەرکردەکانیان کۆتایی پێهات.

عەلی (ذو الثدیە المخدج) دەکوژێ

لەم جەنگەدا (عبداللەی کوڕی وەهەبی ڕاسبی)ی ئەمیریان کوژرا، هەروەها هەر یەکە لە (حورقوصی زوهەیری سەعدی) و (شورەیحی کوڕی ئەوفا)ش کوژران، کە دوو سەبەئی بون بەشداریان لە کوشتنی عوسمان کردبو.[1]

لە نێوان کوژراوەکانی خەواریج لەم جەنگەدا (ذوالثدیة) یا (مُخَدَّج) هەبوو.

فەرمودەی یەکەم دەربارەی جەنگ کردنی عەلی لەدژی خەواریج

ئیمام موسلیم لە (صحیحە)کەیدا لە زەیدی کوڕی وەهەبی جوهەنی یەوە دەگێڕێتەوە-کە لەو سوپایەی عەلیدا بوو کە بۆ جەنگی خەواریج دەرچوو بون- کە گوتویەتی: عەلی کوڕی ئەبوطالبؓ گوتویەتی: لە پێغەمبەری خوامﷺ بیستووە دەیفەرموو:

((یَخرُجُ قَومُ مِن أُمَّتي، یَقْرَؤونَ القُرآن، لیس قِراءَتُکُم إلی قِراءَتِهِم بِشَيْءٍ، وَلا صَلاتُکُم إلی صَلاتِهِمْ بشَيء، وَلا صِیامُکُم إلی صِیامِهِم بِشَيء، یَقْرَؤونَ القُرآنَ وَیَحْسَبُونَ أَنَّهُ لَهُم، وَهُوَ عَلَیْهِم: کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبێ، قورئان دەخوێنن، قورئان خوێندنی ئێوە لە چاو ئەواندا هیچ نیە، نوێژ کردنتان لەچاو نوێژ کردنیان هیچ نیە، ڕۆژو گرتنتان لە چاو ڕۆژو گرتنیاندا هیچ نیە، قورئان دەخوێنن وا دەزانن قورئان لە سودی ئەوانە، بەڵام لەڕاستیدا قورئان لە دژی ئەوانە)).

پاشان عەلیؓ وتی: ئەگەر ئەم سوپایە بەو کەسانەیان بزانیبایە کە توشیان دێن، چەندە پاداشتیان بۆ دەنوسرێ کە لەسەر زمانی

---

١ـ البدایة و النهایة ٧ :٢٨٨-٢٨٩ .

پێغەمبەرەكەیانەوەﷺ هاتوە، ئەوا ئیتر كاروكردەوەی تریان نەدەكرد، نیشانەی ئەمەش ئەوەیە پیاوێكیان تێدایە دەستی باسكی نیە، لەسەری قۆڵیدا شتێكی وێنەی سەر گۆی مەمك هەیە، كە چەند موویەكی سپی پێوەیە!

زەیدی كوڕی وەهەب گوتویەتی: كاتێك جەنگەكە بە تێكشكانی ئەوان كۆتایی پێهات عەلیؓ وتی: لە نێوانیاندا بۆ (مخدج)* بگەڕێن!

بە دوایدا گەڕان، بەڵام نەیاندۆزیەوە!

عەلیؓ خۆی هەستا، چووە لای هەندێ لە كوژراویان، كە بەسەریەكدا كەوتبون، لێرەدا پێی‌وتن:

لەسەر یەك لایان بەن، ئەوانیش لەسەر یەك لایان بردن، بینیان (مخدج) بە كوژراوی لەسەر زەویەكە كەوتووە، كاتێك عەلی بە كوژراوی بینیی، گوتی: الله اكبر، پاشان وتی: خوا ڕاستی فەرمووە و پێغەمبەرەكەشی گەیاندویەتی.

عوبەیدەی سەلمانی هەستایە پێ و وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران: تو ئەو خوایەی كە جگە لەو هیچ پەرستراوێكی دی نیە، تۆ ئەمەت لە پێغەمبەری خواﷺ بیستووە.؟

عەلی وتی: بەو خوایەی كە جگە لەو هیچ پەرستراوێكی دی نیە، لەپێغەمبەری خواﷺ گوێبیستی ئەمە بووم.[1]

فەرمودەی دووەم

موسلیم لە عبیداللەی كوڕی ئەبی ڕافعەوە دەگێڕێتەوە كەوتویەتی: كاتێك لەگەڵ عەلی‌دا بۆ جەنگی حەروریەكان -خەواریج- دەرچووم، وتیان: حوكم تەنها بۆ خوایە.

عەلیؓ گوتی: ئەمە وتەیەكی ڕەوایە بەڵام مەبەستیان پێی ناڕەوایە، پێغەمبەری خواﷺ وەسفی خەڵكێكی كردووە، لە ڕاستی‌دا من سیفەتەكانیان لەمانەدا دەبینم، هەق و ڕەوا دەڵێن، بەڵام لەمەیان

---

* (مخدج) بە مانای كەسێك دێ كە كەم و كورت و نا تەواوبێ- (وەرگێڕ).

١ـ البداية و النهاية ٧:٢٩١.

تێناپەڕێ-ئاماژەی بۆ قوڕگی کرد- لەلای خوا خراپترین دروستکراون، کەسێکی ڕەشیان تێدایە یەکێ لە دەستەکانی وەك گوانی مەڕ یا وەك گۆی مەمك وایە.

کاتێ عەلی کوشتاریانی کرد، وتی: بۆ ئەو پیاوە ڕەشە بگەڕێن.

سەیریان کرد بەڵام نەیانبینی.

عەلیﷺ وتی: بگەڕێنەوە سەیر کەن، هەر دەبێ بیدۆزنەوە، بەخوا نە درۆم کردووە و نە درۆشم لەگەڵ کراوە.!!

گەڕانەوە و ڕوانیان، بینیان لە شوێنێکی ڕوخاودایە، بردیان بۆ لای عەلی، ئەویش وتی: الله اکبر!

بوخاری و موسلیم لە (سوەیدی کوڕی غەفلەوە) دەگێڕنەوە کەفەرمودەی سێ یەم وتویەتی: عەلی کوڕی ئەبوطالبﷺ وتویەتی: ئەگەر لە پێغەمبەری خواوەﷺ فەرموودەیەکم باس کرد، گەر لە ئاسمانەوە هەڵدێرێم پێم خۆشترە لەوەی درۆ بە دەمیەوە بکەم، ئەگەر لە نێوان خۆم و ئێوەدا قسەم کرد ئەوا جەنگ فرۆفێڵە.

گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووومﷺ دەیفەرموو: ((يَخرُجُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّتي، في آخِرِ الزَمانِ، أحْداثُ الأسْنانِ، سُفَهاءُ الأحْلامِ، يَقُولُونَ مِن قَوْلِ خَيرِ البَرِيَّة، يَقْرَؤُونَ القُرآنَ لا يُجاوِزُ حَناجِرَهُم، يَمْرَقُونَ مِنَ الدِّين كَما يَمرقُ السَهمُ من الرَميَة. فإذا لَقيتُمُوهُم فاقتُلُوهُم، فإنَّ في قَتْلِهِم أجراً لِمَنْ قاتَلَهُم عِنْدَالله يَومَ القِيامَة: کۆمەڵێك خەڵك لە ئاخری زەماندا لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبن، تازە پێگەیشتوون، نەفام و ناتێگەیشتوون، فەرموودەی چاکترین خەڵك کە پێغەمبەری خوایەﷺ دەڵێن، قورئان دەخوێنن بەڵام لە قوڕگیان تێناپەڕێ، لە دین دەردەچن هەر وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ. ئەگەر پێیان گەیشتن بیانکوژن، بە کوشتنیان لە ڕۆژی دواییدا خودا پاداشتی بکوژانیان دەداتەوە[١]..

---

١ـ البداية و النهاية٧: ٢٩١.

موسلیم لە جابری کوڕی عبداللهوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە جەعرانە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم، کە زیوی لە ناو جلەکەی بیلال دا بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد.

جابری کوڕی عبدالله ڕەخنەی پیاوە تەمیمیەکە لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دادگەر بە! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوار بۆت، ئەگەر من دادگەر نەبم ئەبێ کێ دادگەر بێ؟ زیان لێ کەوتووم ئەگەر دادگەر نەبم.

عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا با ئەم دووڕووە بکوژم!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (( پەنا بە خوا لەوەی خەڵکی بڵێن من هاوەڵی خۆم دەکوژم، ئەمە و هاوەڵانی" قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێناپەڕێ، لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت))[1].

ئەبو سەعیدی خودری بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە

بوخاری و موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە ﷺ کە گوتویەتی:

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی دابەش دەکرد، لەو کاتەدا (ذوالخویصرة)ی تەمیمی هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دادگەر بە! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوار بۆت! کێ هەیە دادگەر بێ ئەگەر من دادگەر نەبم؟

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ : مۆڵەتم ئەدەی لە گەردنی بدەم؟

فەرمووی: وازی لێ بێنە: ئەمە هەندێ هاوەڵی هەیە هەر یەکێك لەئێوە نوێژکردنەکەی خۆی لەلا سوکە لە ئاست نوێژکردنەکەیاندا، ڕۆژوەکەی لەگەڵ ڕۆژویاندا، ئەوانە لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ..

نیشانەکەیان پیاوێکی ڕەشە، یەکێك لە دەستەکانی وێنەی مەمکی ئافرەتە، یا وێنەی پارچە گۆشتێکە و ئەلەرێتەوە، لە وەختێکدا پەیدادەبن کە خەڵك پەرتەوازەن.

---

[1] ـ البداية و النهاية ٧:٢٩٧.

(عەلی)ش لە ڕۆژی نەهرەواندا کوشتی

ئەبو سەعیدی خودری گوتی: من شایەتی دەدەم ئەمەم لە پێغەمبەری خواﷺ بیست، هەم شایەتیش دەدەم کاتێ عەلی ئەوانەی کوشت من لەگەڵیدا بووم، ئەو پیاوەیان هێنا بەو وەسف و سیفەتە بوو کە پێغەمبەری خواﷺ وەسفی کردبوو[1].

هەروەها موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێڕێتەوە τ کە گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((تَمرُقُ مارِقَة، عِنْدَ فُرقَـةٍ مِـنَ المُسلِمين، تَقْتُلُهُم أولَى الطائِفَتَين بـالحَقّ: لە ڕێ دەرچوانێك لەڕێ دەردەچن، لە کاتێکدا موسڵمانان لە پەرتەوازەییدان، نزیکترین یەك لەو دوو دەستەیەی لە هەقەوە نزیکە شەڕیان لەگەڵ دەکەن))[2]

سەهلی کوڕی حەنیف جەنگی عەلی دژ بە خەواریجەکان دەگێڕێتەوە

بوخاری و موسلیم لە بوسری کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: چوومە خزمەت سەهلی کوڕی حەنیف و، وتم: لە پێغەمبەری خواوەﷺ لە بارەی حەروری(خەواریج)ەوە چیت بیستووە پێمی بڵێ.

گوتی: ئەوەی لە پێغەمبەری خواوەﷺ بیستومە بۆتی باس دەکەم، هیچ شتێکی لێ زیاد ناکەم.

گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺباسی خەڵکێکی دەکرد ئا لێرەوە پەیدادەبن—بەدەستی ئاماژەی بەرە و عێراق کرد– قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێناپەڕێ، لە دین دەردەچن هەروەك تیر لە نێچیر دەردەچێ.

وتم: ئایا باسی هیچ نیشانەکیانی کرد؟

حەوت فەرمودە داوای کوشتاری خەواریج دەکا

سەهل وتی: من هەر ئەوەم بیست، زیاترت بۆ ناخەمە سەری[3].

ئەم حەوت فەرموودە صەحیحە و جگە لەمانەش[4] بە بەڵگەکانی

---

١ـ البداية و النهاية ٧: ٣٠٠-٣٠١.

٢ـ البداية و النهاية: ٧ :٢٧٩

٣ـ البداية و النهاية : ٧: ٣٠٢.

٤ ـ سەیری زۆر فەرموودەی تر بکە، بەچەند گێڕانەوەیەك کە ابن الكثير لە البداية و النهاية ٧: ٢٩٠-٣٠٧ هێناویێتی.

**پێغەمبەرایەتی دادەنرێن، ئەوەتانێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دەرچوونی خەواریجمان پێ ڕادەگەیەنێ، کە لە قورئان تێناگەن و گوێڕایەڵی ئیمام ناکەن و موسڵمانان دەکوژن، بانگەشەی کوشتنیان دەکات، ستایشی بکوژانیان دەکا و بە نزیکترینیان دادەنێ لە هەقەوە.**

عەلی ئەشتەری نەخەعی دەکاتە والی میصر

**لە ساڵی سی و هەشت دا عەلی کوڕی ئەبوطالب﷛ (ئەشتەری نەخەعی –مالکی کوڕی حارث–) دەکاتە والی میصر، ئەشتەر لەسەرکردەکانی کوفە بووە، بەو پێیە خۆی سەپاند بەسەر عەلی دا و بووە یەکێك لە گەورە سەرکردەکانی، ئەشتەر یەکێك بوو لەو سەبەئیانەی بەشداری کوشتنی عوسمانی کرد بوو.**

**ئەشتەر لە عێراقەوە بەرەو میصر کەوتە ڕێ، بەلاّم خوا دامەزراوی نەکرد و دەست ڕۆیشتوی نەکرد و نەیهێشت خۆشی والیەتی میصر بچێژێ.**

ئەشتەر پێش گەیشتنی بەژەهر دەمرێت

**کاتێ گەیشتە (قەلزەم)ی دەوروبەری شام، یەکێك لە ئەهلی (ذمة)ی ئەوێ خواردنی پێشکەش کرد، پاشان هەنگوینی ژەهراوی دەرخوارد دا، ئەشتەر بەو ژەهرە مرد، موعاویە و عەمر بە مردنی ئەشتەر دڵخۆش بون کە بە هۆی هەنگوینە ژەهراوییەکەوە مرد، وتیان: خوا سەربازی لە هەنگوینیش هەیە.[١]**

**عەلی﷛ لە دوای مردنی ئەشتەر، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق)ی کردە والی میصر، ئەویش هەروەها یەکێك بوو لەوانەی هاوکاری گەمارۆدانی عوسمانی کردبوو.**

ئیبن عاص موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر دەشکێنێ و میصر بۆ معاویە دەگێڕێتەوە

**موعاویە﷛ عەمری کوڕی عاصی ناردە میصر، تا جەنگی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بکات، بەو پێیەی لە بکوژانی عوسمانە.**

**ڕوبەڕوبونەوە لە نێوان (عەمری کوڕی عاص) و (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) ڕوویدا، عەمر شانزە هەزار کەسی لەگەڵ بوو، موحەممەدی**

---

١ـ البداية و النهاية ٧:٣١٣.

کوڕی ئەبوبەکر کە دەهەزار کەسی لەگەڵ بوو، لەم ڕووبەڕووبونەوەیەدا بکوژانی عوسمان ئەوانەی لەگەڵ (ئیبن ئەبو بەکر)دا بون لە میصر کوژران، جەنگەکەش بە تێك شکانی (ئیبن ئەبو بەکر) کۆتایی هات.

پاشان هاوەڵانی (ئیبن ئەبو بەکر) بڵاوەیان لێی کرد، هیچ کەسێکیان لەگەڵدا نەما، (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) بەسەرشۆڕی و دەرکراوی و تێکشکاوی و خەفەتبارییەوە دەرچوو، بەلای کەلاوەیەکدا تێپەڕی، پەنای پێ برد، برسی و تینوی بوو، بەڵام (موعاویەی کوڕی حەدیج)ی سەرکردەی پشتیوانانی عوسمان لە میصر پێی گەیشت و لەوێدا کوشتی.

بەم شێوەیە میصر لە ژێر دەسەڵاتی عەلی دەرچوو، کەوتە بەردەستی موعاویە، (عەمری کوڕی عاص)یش بووە والی میصر.[1]

لە ساڵی سی و نۆ دا، لەو لایانەی عێراقەوە، کە لەگەڵ شام دا هاوسنوور بون، چەند پێکدادانێك لە نێوان سوپای عەلی و موعاویەدا ڕوویدا.[2]

موعاویە حیجاز و یەمەنیش دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە

لە سەرەتای ساڵی چلی کۆچیدا موعاویە (بوسری کوڕی ئەرطەئە)ی بە سوپاکەیەوە نارد، تا حیجاز و یەمەن بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بوسر چووە مەککە و مەدینەوە و پاشان چوو بۆ یەمەن، ئەم وڵاتانەش کەوتنە ژێر دەسەڵاتی موعاویەوە.[3]

وردەوردە کاروباری عەلی بەرەو کزی دەچوو، موعاویەش بەرەو بەهێزی، خەڵکی عێراق کە شوێنکەوتەی عەلی بون لێی یاخی دەبون و ئاژاوەیان پێ دەگێڕا، لەو لاشەوە خەڵکی شام گوێڕایەڵی موعاویە بون و، پابەند بون بە گوێڕایەڵ کردنیەوە. جا هەرچەندە خەڵکی شام هێزیان زیادی دەکرد، ئەوەندە خەڵکی عێراق لاواز دەبون و وازیان دەهێنا.

---

١ـ البداية و النهاية ٧ : ٣١٣-٣١٥ .

٢ـ البداية و النهاية ٧: ٣٢٠-٣٢٢ .

٣ ـ البداية و النهاية ٧ : ٣٢٢-٣٢٣.

**هەموو ئەمانە لە کاتێکدا بون، عەلی کوڕی ئەبوطالبﷺ باشترینی خەڵکی ئەو سەردەمە بوو، لە هەموو موسڵمانان خواپەرست تر و زاهیدترینیان بوو، لەخواترس و شارەزاترینیان بوو، لەگەڵ سەرجەم ئەمانەدا شوێنکەوتەکانی بەجێیان هێشت و وازیان لێی هێنا، تا ژیانی لا ناخۆش بوو، بەهۆی زۆر بونی فیتنە و بە دەرکەوتنی بەڵاو نەهامەتیەکان و دەستەوەستانی و نەبونی سەربازی گوێڕایەڵ، ئاواتەخوازی مردن بوو.**

عەلی بکوژەکەی بە لەسەرەخۆ و خاو و خلیچ دادەنێ

**عەلی ﷺ زۆر جار دەیووت: چی ئەو خراپەکارەی بەند کردووە؟ چاوەڕوانی چی یە؟ بۆ نایەتە پێش و بمکوژێ؟!!**

**(ثەعلبەی کوڕی یەزید) گوتویەتی: عەلیﷺ گوتویەتی: سوێند بەوەی دان(حبة)ی لەت کردوە و گیانی دروست کردوە، ئەمە بەمە سوور دەبێ- ڕیشی بەسەری بەخوێن دەبێ-، ئەبێ ئەو خراپەکارە چی بەندی کردبێ؟**

**(عبداللهی کوڕی سەبع) گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، سوێند بەخوا هەر پیاوێ ئەوەت پێ بکا خاو و خێزان و هۆزەکەشی لە ناو دەبەین.**

عەلی ڕەتی ئەوە دەکاتەوە کە کەس بکا بە جێنشینی خۆی

**عەلیﷺ گوتی: سوێندتان ئەدەم بەخوا جگە لە بکوژم کەسی تر نەکوژن!!**

**وتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران! لە دوای خۆت کەس ناکەی بەجێنشین؟**

**گوتی: نەء، بەڵکو بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا ρ بەجێی هێشتن ئاوا بەجێتان دێلم.**

**وتیان: ئەی کاتێ کە دەگەی بە خزمەت پەروەردگارت، چی پێ دەڵێی؟**

**گوتی: ئەڵێم: پەروەردگارم! ئەوەندەی دات نابوو منت کردە جێنشینیان، پاشان گیانمت کێشا، من تۆم تیا بەجێ هێشتوون، ئەگەر ویستت ئیصلاحیان دەکەی، ئەگەر بشتەوێ خراپیان دەکەی!!**

**زەیدی کوڕی وەهەب گوتویەتی:**

عەلی دەزانێ کە دەکوژرێ

**خەواریج دەهاتن بۆ لای عەلی و پێیان دەووت: لە خوا بترسە تۆ هەر دەمری!**

**عەلیﷺ گوتی: نەء بەو کەسەی دانە(حبَّة)ی قلیشاندووە و گیانی**

عەلی لە واز هێنان

دروست کردووە،* من دەکوژرێم، لە لێدانێك کە بەر ئێرە دەکەوێ و ئێرە سوور دەکا-بەدەستی ئاماژەی بۆ ڕیشی کرد- ئەمە پەیمانێکە کراوە و بڕیارێکە دراوە، ئەوەی دەم هەڵبەست بکا زیان لێکەوتووە.[١]

عەلی‌ﷺ لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی‌دا لە قەومەکەی خەمبار و دڵ بە ئازار بوو، بەهۆی پشت کردنی شوێنکەوتە و هاوەڵانی لە سەرخستنی و هاوکاری کردنیدا دڵشکاو بوو، هیواخوازی مردن بوو تا لە دەستیان ڕزگاری بێ!

زوهەیری کوڕی ئەرقەم هەندێ لەو وتانەی (عەلی)مان‌ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە، کە پێش چەند ڕۆژ لە شەهید کردنی لە وتارێکدا گوتویەتی.

لە کۆتایی وتارەکەیدا هێرش دەکاتە سەریان

زوهەیری کوڕی ئەرقەم گوتویەتی: عەلی لە ڕۆژی هەینی‌دا وتاری بۆ داین، گوتی: پێیان ڕاگەیاندم کە (بوسرەی کوڕی ئەبی ئەرطەئە) ڕووەو یەمەن بەڕێکەوتوە تا دەستی بەسەردا بگرێ، بەخوا وا دەزانم ئەو قەومە-قەومی موعاویە- بەسەرتان دەکەون!!

ئەوان بۆیە بەسەرتانا سەر دەکەون، چونکە ئێوە لە پێشەواکەتان یاخی دەبن و ئەوان گوێڕایەڵی پێشەوای خۆیان دەکەن، ئێوە ناپاکن و ئەوان دەست پاکن، لەبەر ئەوەی ئێوە لە زەمینەی خۆتاندا خراپەکاری دەکەن، بەڵام ئەوان چاکسازی و ئیصلاح دەکەن!!

فلان کەسم نارد، ناپاکی و ستەمی کرد، فلانی ترم نارد ناپاکی و ستەمی کرد و، ماڵ و سامانەکەی نارد بۆ معاویە! ئەگەر کەسێکتان بکەمە ئەمینداری دۆلکەیەك، ئەوا دەسکەکەی دەبەن.

ئاواتەخوازی مردنە

پەروەردگارم لێیان وەڕس بووم و لێم وەڕس بون، حەزیان پێناکەم و حەزم پێناکەن، خوایە منیان لە کۆڵ کەرەوە و ڕزگارم کە لێیان!!!

---

* ئەمە وەرگێڕانێکی کورت ترە لەوەی پێشوو-مامۆستا مەلا رشید بەگی بابان-وەرگێڕانێکی تەفسیری بۆی کردووە -وەرگێڕ-.

١ـ البداية و النهاية ٧: ٣٢٤ .

زوهەیر گوتی: هێشتا هەیندی داهاتوو نەگەڕایەوە عەلی‌ﷺ کوژرا.[1]

ئەم وتە سەیرانەی عەلیﷺ لە ڕۆژانی دوایی تەمەنیدا ڕادەی بێ‌هیوایی و ماندووبونی (عەلی)مان بە دەست شوێنکەوتووەکانیەوە بۆ وێنا دەکات، بەڕادەیەك چارەسەر تەنها لە ئاواتی مردن خواستندا دەبینێتەوە!!

پیلانی خەواریج بۆ سێ هاوەڵەکە

کۆمەڵێك لە خەواریجەکان ڕێکەوتن لەسەر کوشتنی هەرسێ هاوەڵ عەلی و موعاویە و عەمری کوڕی عاصﷺ.

چونکە وایان دەبینی ئەم سێ هاوەڵە کافرن، پێشەوای کافران و سەرکردەی فیتنە و هۆکاری ئەو بەڵایانەن کە بەسەر موسڵماناندا هاتووە، لەبەر ئەوە دەبێت بکوژرێن تا خەڵکی لێیان قوتار بێ و بحەسێنەوە.

لە ساڵی چل دا، سێ کەس لە خەواریجەکان کۆبونەوە، کە بریتی بون لە: (عبدالرحمنی کوڕی عەمر)ی ناسراو بە (ئیبن مەلجەمی موڕادی حومەیری کیندەیی میصری) و، (بەرکی کوڕی عبداللهی تەمیمی) و (عەمری کوڕی بەکری تەمیمی).

ئەم سێ بەخت ڕەشە برا کوژراوە، خەواریجەکانی خۆیانیان هێنایەوە یاد، کە (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ لە جەنگی نەهرەواندا -کە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد- کوشتبونی و، داوای ڕەحمەتیان بۆیان کرد.

پاشان وتیان: لەپاش ئەوان ژیانمان بۆ چیە؟ بەڕاستی ئەوان لە پێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسان، ئای ئەگەر خۆمان بەخوا بفرۆشتایە، بچوینایەتە سەر هەرسێ پێشەوای گومڕایی-عەلی و موعاویە و ئیبن عاص- و بمانکوشتنایە، وڵاتانمان لە دەستیان قوتار بکردایە و تۆڵەی براکانمان لێ بسەندنایەتەوە!!

ئیبن مەلجەم وتی: (عەلی کوڕی ئەبوطالب) بۆ من جێبێڵن.

(بەرکی تەمیمی) وتی: (موعاویە)ش لە شام دا بۆمن بەجێ بێڵن.

(عەمری کوڕی بەکر) وتی: (عەمری کوڕی عاص)یش لە میصردا بۆ خۆم.

---

١ ـ البداية و النهاية ٧: ٣٢٦ .

هەرسێ بەدبەختەکە پەیمانیان داو لە نێوان خۆیاندا بەڵێنیان بەیەك دا، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی هیچ کەسیان لەوەی بۆی دانراوە پاشگەز نەبێتەوە، تا دەیکوژێ یا لەو پێناوەدا دەمرێ، جا شمشێرەکانیان هەڵگرت و ژەهراوییان کرد.

جێبەجێ کردنی پیلانەکە لە حەقدەی ڕەمەزان دا بێ

ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کاتی جێبەجێ کردنی تاوانەکە نوێژی بەیانی حەقدەی ڕەمەزان بێ، بە شێوەیەك هەریەکەیان لەو بەیانیەدا بەرەو ڕووی ئەو کەسەی بڕیارە بیکوژێ بڕوا و لە نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژەدا بیکوژێ.[1]

بەرکی تەمیمی موعاویە بریندار دەکا و دەکوژرێ

(بەرکی کوڕی عبداللەی تەمیمی) چوو بۆ دیمەشق تا تاوانەکەی جێبەجێ بکا.

لە بەیانی ڕۆژی هەینی ی حەقدەی ڕەمەزان دا (موعاویە)ﷺ دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی لە مزگەوت دا، بەرك بە شمشێرە ژەهراوییەکەیەوە هەڵی کوتایە سەری و لێی دا و لێدانەکەی بەر سەروی ڕانی کەوت و شلکەی سەرەوەی بریندار کرد، بەڵام موعاویە نەمرد.

(بەرەك)یان گرت، موعاویەﷺ فەرمانی دا بە کوشتنی، پێش ئەوەی بیکوژن بە موعاویەی وت: من موژدەیەکت پێدەدەم.

موعاویە وتی: ئەو مژدەیە چی یە؟

(بەرك) وتی: براکەم لەم ڕۆژەدا (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ی کوشتووە!

پاشان فەرمانی دا (بەرك) بکوژن.

عەمری کوڕی بەکر بەڕێوەبەری پۆلیسی ئیبن عاص دەکوژێ و دەکوژرێ

پزیشك هات و چارەسەری موعاویەی کرد، دەرمانێکی پێدا ژەهرەکەی لێ لابرد و چارەسەری کرد.

بەڵام (عەمری کوڕی بەکری تەمیمی) ڕووی کردە میصر تا بە شمشێرە ژەهراویەکەی، (عەمری کوڕی عاص) بکوژێ.

لە بەیانی ڕۆژی هەینیی حەقدەی ڕەمەزاندا (عەمری کوڕی عاص)

---

١ـ البداية و النهاية٧ : ٣٢٦-٣٢٧ .

نەخۆش کەوتبوو، بۆی نەگونجا دەرچێ و نوێژی بەیانی بە خەڵك بکا، بەڕێوەبەری پۆلیسی (خاریجەی کوڕی ئەبو حەبیبەی عامری) نارد تا لەجێی خۆی پێش نوێژی خەڵك بکا.

خاریجە بۆ پێش نوێژی پێش کەوت، (عەمری کوڕی بەکر) بە شمشێرە ژەهراوییەکەی هێرشی کردە سەری، ئەو وای گومان برد (عەمری کوڕی عاص)ە و، کوشتی.

کاتێ (عەمری کوڕی بەکر)یان گرت، پێیان وت: عەمری کوڕی عاص نەکوژرا، بەڵکو (خاریجەی عامری)ت کوشت.

داخ و خەفەتەکەی زیاتر بوو، وتی: من (عەمر)م ویست بەڵام خوا (خارجە)ی ویست!!

پاشان عەمری کوڕی عاص فەرمانیداو، کوشتیان.[1]

بەم شێوەیە خوا موعاویە و (عەمری کوڕی عاص)یﷺ لەم پیلانە دەرباز کرد.

قەدەری خوا وابوو کە (عبدالرحمنی کوڕی مەلجەم)لە کوشتنی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)داﷺ سەرکەوتوو بێ!

ئیبن مەلجەم لە نێو خەواریجەکانی کوفەدا

(عبدالرحمنی کوڕی مەلجەم) هات و چووە کوفەوە، ئەم نیازەی لە خەواریجەکانی کوفە شاردەوە، تا کارەکەی ئاشکرا نەبێ و پیلانەکەی پوچەڵ نەبێتەوە.

(عبدالرحمنی کوڕی مەلجەم) ئاشنایەتی لەگەڵ ئافرەتێکی خاریجی جوان دا پەیدا کردبوو، کە بە (قەطامی کچی شەجنە) ناو دەبرا، زۆر ڕق و قینی لە عەلی بوو، چونکە باوك و برا (خارجی)یەکەی لە ڕۆژی نەهرەواندا کوژرا بوو.

ئیبن مەلجەم ئالودەی جوانی (قطام) بوو، خوازبێنی کردبوو تا مارەی بکات، مەرجی مارەییەکەی سێ هەزار درهەم و خزمەتکارێك و کوشتنی عەلی کوڕی ئەبوطالب بوو!!!

---

١ ـ البداية و النهاية ٧: ٣٣٠ .

حەزی ئیبن مەلجەم لەگەڵ حەزی قەطام کۆبوویەوە، ڕق و کینی دڵەکانیان لەسەر کوشتنی عەلی یەکی گرت.

ئیبن مەلجەم پێی وت: بەخوا هاتنم بۆ کوفە تەنها لەبەر کوشتنی عەلی‌یە!

(قەطام) هانی ئیبن مەلجەمی مێردی دا کە بچێ بۆ لای پیاوێك لە خزمانی، بەناوی (وردان) تا لە کوشتنی عەلی بەشداری بکا.

ئیبن مەلجەم توانی قەناعەت بە پیاوێکی خەواریج بکا و بەلای خۆیدا ڕایکێشێ، بەناوی (شەبیبی کوڕی نەجدەی ئەشجەعی)، دوای مشتومڕێکی درێژ قەناعەتی پێی کرد کە بەشداری کوشتنی عەلی بکا.

هەرسێ پیلانگێڕەکە لە مزگەوتی کوفەدا

هەرسێ بەدبەخت: ئیبن (مەلجەم) و (وردان) و (شەبیب)، لەسەر کوشتنی عەلی لە بەیانی ڕۆژی هەینی حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچی، ڕێك کەوتن.

ئیبن مەلجەم شمشێرەکەی ژەهراوی کرد، هەرسێکیان لە شەوی هەینیدا لە بەرامبەر ئەو بەربەست(سدّ)ەی عەلی لێوەی دەچوو بۆ نوێژ خۆیان مەڵاس دا.

کەمێك پێش هاتنی بەیانی، لەو ڕۆژە عەلیﷺ لە ماڵەکەی دەرچوو بۆ مزگەوت، —لەو کاتەی دەچوو بۆ مزگەوت، هەر بەڕێوە– خەڵکی بۆ نوێژ کردن لەخەو هەڵدەستاند و، دەیگوت: نوێژەکانتان، نوێژەکانتان!

کاتێك عەلیﷺ گەیشتە دەرگای مزگەوتەکە، هەرسێ بەدبەختەکە بە شمشێرەکانیان هێرشیان کردە سەری، شەبیب شمشێرەکەی بۆ داوەشان، بەڵام نەیپێکا و شمشێرەکەی کەوتە سەر تاقی دەرگاکەوە.

ئیبن مەلجەم لە بەیانی هەینی ی ١٧ی ڕەمەزان عەلی دەپێکێ

ئیبن مەلجەم بە شمشێرەکەی لێیدا و پێکای، شمشێرە ژەهراویەکەی بەر لا سەری عەلیﷺ کەوت، خوێن لەسەریەوە بەسەر ڕیشی دا چۆڕا.

هەروەك خۆی ئاماژەی دەکرد و بە خەڵکی دەوت، کە ڕیشی بە خوێنی سەری سوور دەبێ.

**کاتێك ئیبن مەلجەم بە شمشێرەکەی دای لە عەلی، هاواری کرد و وتی: عەلی! حوکم تەنها هەر بۆ خوایە، نە بۆ تۆیە و نە بۆ هاوەڵەکانت.**

**پاشان دەستی بە خوێندنی ئەم ئایەتە کرد:**

﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَـاءَ مَرْضَـاةِ اللَّـهِ وَاللَّـهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَـادِ: **هی واش لەناو مەردم هەیە بۆ ڕەزای خوا گیان دەبەخشن، خودا دەگەڵ عەبدانی خۆی دلۆڤانە.**﴾البقرة/٢٠٧.

**عەلی کە خوێن لەسەری دەچۆڕا، گوتی: فریاکەون بیگرن.**

**خەڵکی، (عبدالرحمنی کوڕی مەلجەم)یان گرت، پیاوێکی حەزرەمەوتیش هەستا (وەردان)ی کوشت، بەڵام پیلان گێڕی سێیەم کە (شەبیب) بوو هەڵهات و خۆی ڕزگار کرد، کەسیش نەیناسیەوە.**

**عەلی‌ﷺ (جەعدەی کوڕی هبیرە)ی پێش خست و نوێژی بەیانی پێ کردن.**

گفتوگۆی عەلی لەگەڵ ئیبن مەلجەم پاش پێکرانی

**(عەلی)یانﷺ هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ماڵی خۆی، پاشان (عبدالرحمنی کوڕی مەلجەم)یان بەدەست بەستراوی هێنا.**

**عەلیﷺ بە ئیبن مەلجەمی وت، ئەی دوژمنی خوا! ئەدی چاکەم لەگەڵ نەکردووی؟**

**وتی: بەڵێ.**

**وتی: ئەی چی پاڵی پێتەوە تا ئەمە بکەی؟**

**ئیبن مەلجەم وتی: ئەمە شمشێرێك بوو چل بەیانی تیژم کردووە، داوام لە خوا کرد خراپترین دروستکراوی پێ بکوژرێ، ئەوە بوو دام لە تۆ.**

**عەلیﷺ پێی وت: من بە خراپترین دروستکراوی خوات دەزانم، وا دەبینم تۆ بەم شمشێرە دەکوژرێ ی.**

**پاشان بەوانەی دەوروپشتی وت: ئەگەر مردم ئەوا بیکوژن، ئەگەر ژیام من خۆم باشتر دەزانم چی پێ دەکەم.**

عەلی جێنشینی دوای خۆی دەست نیشان ناکا

**جوندبی کوڕی عبدالله گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەگەر مردی بەیعەت بە حەسەن بدەین؟**

عەلی ﷺ گوتی: نە فەرمانتان پێدەکەم بەیعەتی پێبدەن و، نە بەربەستیشتان لێ دەکەم، ئێوە باشتر دەزانن، ئەوەی بە شیاوی دەزانن بیکەن.

وەسیەتی عەلی

عەلی ﷺ وەسیەتی خۆی نوسی بۆ حەسەن و حوسەین و کوڕ و کچەکانی تری و سەرجەم موسڵمانان، ئەوەبو وەسیەتی کرد بۆ هەمویان بە ترسان لە خوا و نوێژ کردن و زەکات دان و ڕق خواردنەوە و سیلەی ڕەحم بەجێ هێنان و لێبوردەیی بەرامبەر نەفام و خۆ شارەزاکردن لە دین و توندوتۆڵی لە کاروبارەکاندا و پاراستنی قورئان و چاکە کردن لەگەڵ دراوسێ و فەرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە و خۆپارێزی لە تاوان و بێ ڕەوشتی.[1]

عەلی سێ ڕۆژ بە نەخۆشی مایەوە، لە بەیانی هەینییەوە، تا شەوی یەك شەممە، لەو سێ ڕۆژەدا زۆر (لا الـه الا اللّه)ی دەوت، جگە لەمە چی تری نەدەوت.

کۆچی دوایی عەلی لە شەوی یەك شەممە١٩ی ڕەمەزان.

لەشەوی یەك شەممەی نۆزدەی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچی، ئەمیری بڕواداران عەلی کوڕی ئەبوطالب ﷺ بەهۆی کاریگەری ئەو برینە قوڵەی شمشێرە ژهراوی یەکەی (ئیبن مەلجەم)ەوە کۆچی دوایی کرد، بەم شێوەیە، بە دەستی ئەو خاریجییە کلۆڵە، لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی بە شەهیدی گەیشتە خزمەتی پەروەردگاری.

جێنشینیەکەی چوار ساڵ و نۆ مانگ چەند ڕۆژێك کەم بەردەوام بوو.

ئەوەبوو، دوای هەفتەیەکی تەواو لە شەهیدکردنی (عوسمان)، لە ڕۆژی هەینی بەیعەتی خەلافەتی پێدرا.

عەلی بە نهێنی لە (دار الآمارە)دا ئەسپەردە دەکرێ

کاتێ (عەلی) ﷺ کۆچی دوایی کرد، (حەسەن) و (حوسەین)ی کوڕی ﷺ شۆردیان، پاشان (حەسەن) پێش کەوت و نوێژی جەنازەی، بە نۆ (اللّه أکبر) لەسەر کرد.!

کاتێك شەو داهات، لە (دار الإمارە)ی کوفەدا گۆڕێکیان بۆی هەڵکەند،

---

١ـ سەیری دەقی وەسیەتەکەی بکە لە (البدایة و النهایة) ٧: ٣٢٨-٣٢٩ .

(حەسەن) و (حوسەین) و (موحەممەدی کوڕی حەنەفیە)ﷺ و ئەو خزمانەی لەگەڵیابون، لەنیوەی شەودا ئەسپەردەیان کرد و گۆڕەکەیان پۆشی و شاردیانەوە، لەترسی ئەوەی نەبادا خەواریج بێن و گۆڕەکەی هەڵدڕن و لاشەکەی دەرکەن و لە ڕقدا بیشێوێنن.

سەبارەت بە گۆڕی (عەلی)، پرسیاریان لە ئیمام (موحەممەدی کوڕی باقر) کرد-کە یەکێکە لە پێشەوایانی ئال و بەیت-.

تەمەنی عەلی لە کاتی کۆچی دواییدا

پێی وترا: لەو ڕۆژەی عەلی کوژرا، تەمەنی چەند بوو؟

ئیمام (باقر) وتی: شەست و سێ ساڵ بوو.

پێی وترا: ئەی لەکوێ ئەسپەردە کرا؟

وتی: لە (دار الإمارە)ی کوفەدا بەشەو ئەسپەردە کرا، لە ترسی خەواریج گۆڕەکەیان شاردەوە.

ڕەزای خوا لە ئەمیری بڕواداران (عەلی کوڕی ئەبوطالب) بێ و بە ڕەزامەندی خوا شاد بێ.

گفتوگۆی ئیبن مەلجەم لەگەڵ حەسەن

دوای شەهیدکرانی (عەلی)ﷺ و ئەسپەردەکردنی، (حەسەن)ی کوڕی، (عبدالرحمن)ی کوڕی مەلجەم)ی تاوانباری ئامادە کرد تا بیکوژێ.

(ئیبن مەلجەم) وتی: من ڕەفتارێکت دەخەمە پێش چاو.

(حەسەن) وتی: چییە؟

(ئیبن مەلجەم) وتی: من لەلای کەعبە پەیمانم بەخوا دابوو کە (عەلی) و (موعاویە) بکوژم، یا لەو پێناوەدا بکوژرێم، جا وا توانیم (عەلی) بکوژم، دەی بەرم بدە با بچم (موعاویە)ش بکوژم، بەڵێن بێ لەسەرم ئەگەر نەمتوانی بیکوژم، یا ئەگەر کوشتم و ڕزگارم بوو، بگەڕێمەوە بۆ لات تا بمکوژی!!

(حەسەن)ﷺ پێی وت: نەبەخوا، هەردەبێ بکوژرێی.

(حەسەن) فەرمانی دا بکوژرێ، کوشتیان، خوا ڕیسوای کا.[1]

خەواریجەکان ستایشی ئیبن مەلجەم دەکەن

دوای ئەمە خەواریجەکان ستایشی کردەوەکەی (ئیبن مەلجەم)یان

---

١- بۆ درێژەی پیلان گێڕان لەسەر عەلی و چۆنیەتی شەهیدکردنی، بڕوانە (البدایة والنهایة)٧: ٣٢٦-٣٣١

دەکرد، ئەوەتانێ شاعیرەکەیان (عیمرانی کوڕی حەتتان) مەدحی (ئیبن مەلجەم) دەکا و دەڵێ:

يا ضَرْبَةً مِنْ تَقِيٍّ ما أرادَ بِها     إلاّ لِيَبْلُغَ مِنْ ذِي العَرْشِ رِضْوانا

إنّيّ لأَذْكُرُهُ يَوماً فَأَحْسَبُهُ     أَوْفى البَرِيَّةِ عِنْدَاللهِ مِيزانا[1]

(ئیبن حەتتان) لەوەی وتی درۆی کرد، (ئیبن مەلجەم) لە کوشتنی (عەلی)دا گوناهبار و خراپەکار بوو، بەو تاوانەش سزای خوا وەردەگرێ، نەك ڕەزامەندی ئەو، خراپترین و بەدترین دروستکراوی خوایە نەك باش و بەوەفاترینیان.

خەڵکی کوفە بەیعەت بە حەسەنی کوڕی عەلی دەدەن

پاش ئەوەی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ ، لە ڕۆژی یەکشەممەی نۆزدەی ڕەمەزانی ساڵی چلدا ئەسپەردەکرا، دیدو ڕوانینی خەڵکی کوفە ڕوو لە بەیعەت دان بوو بە (حەسەنی کوڕی عەلی) بۆ جێنشینی، لەگەڵ ئەوەی (عەلی) فەرمانی ئەوەی پێ نەکردبون، بەڵکو کاروبارەکەی بۆ هەڵبژاردنی خۆیان هێشتەوە.

(قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە) هات بۆ لای (حەسەنی کوڕی عەلی) و پێی وت: دەستت بێنە، لەسەر کیتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی بەیعەتت پێدەدەم.

دوای ئەوەی (قەیسی کوڕی سەعد) بەیعەتی پێدا خەڵکی تر هەستان و بەیعەتیان پێیدا.

(قەیسی کوڕی سەعد) لە گەورە سەرکردەکانی سوپای (عەلی) بوو، چل هەزار جەنگاوەری لەگەڵدابوو، حەزی بە درێژەپێدانی جەنگی (موعاویە) و خەڵکی شام دەکرد.

حەسەن سوپایەك دژ بە موعاویە ئامادە دەکا

لەپاش کۆچی دوایی (عەلی)ﷺ، (موعاویە) سوپایەکی گەورەی ئامادە و

---

١ـ واتە: ئای لەو لێدانەی کە لە کەسێکی پارێزکارەوە وەشێنرابێ و مەبەستیشی ڕەزامەندی خاوەنی عەرش بووبێ، من هەر ڕۆژێ کە بیرم دەکەوێتەوە، وای دادەنێم لە تەرازووی خوادا باشترین کەسێکە.

پڕچەك كرد بۆ داگیركردنی خەڵكی عێراق، لە سوپاكەیدا (عەمری كوڕی عاص) و (عبدالرحمنی كوڕی خالیدی كوڕی وەلید)ی لەگەڵدابوو.

خەڵكی كوفە (حەسەنی كوڕی عەلی)یان هاندا، بۆ كۆكردنەوەی خەڵكی و مۆڵدانی سوپا و ڕووكردنە جەنگی (موعاویە) و خەڵكی شام.

خەڵكی خۆیان ئامادەی جەنگی (موعاویە) كرد، لە سوپای حەسەن دەیان هەزار دەرچوون، بونە چەندین كەتیبەی زۆر و بەهێزی پیاوانی نمونەیی.

(حەسەنی كوڕی عەلی)ﷺ، (قەیسی كوڕی سەعد)ی كردە سەركردەی سوپاكە، حەسەنیش لەگەڵیان دەرچوو بەمەبەستی (موعاویە) كەوتە ڕێ.

عێراقییەكان كەلوپەلی حەسەن تالان دەكەن و برینداری دەكەن

لەكاتێكدا سوپاكەی لە دەرەوەی (مەدائین) مۆڵی دابوو، پڕوپاگەندەیەك بڵاوبویەوە كە (قەیسی كوڕی سەعد)ی سەركردەی سوپا كوژراوە! بەمەش ئاژاوە و پشێویەكی بێسەروبەر لە سوپاكەدا ڕوویدا، خەڵكی هێرشیان برد و هەركەسە و شتومەكی ئەوانی تری تالان دەكرد، كۆمەڵێكیان هاتن و كەلوپەل و چادری (حەسەنی كوڕی عەلی)شیان تالان كرد و ڕاخەرەكەی ژێریشیان ڕاكێشا و هەندێكیشیان لێیان دا هەتا خوێن لەبەری ڕۆیی.

ئا ئەمەیان بە خەلیفەكەیان كرد!! حەسەن یەكجار زۆر ڕقی لێیان بووەوە.

(حەسەن) بە برینداری بردرایە كۆشكی سپیەوە لە مەدائن-بارەگای كیسرا لە سەردەمی دەوڵەتی فارسی-، تا تیایدا چارەسەر بكرێت.

موختاری ثەقەفی پێشنیاری بەدەستەوەدانی حەسەن بە موعاویە دەكات

كاربەدەستی (حەسەن)ﷺ لەسەر مەدائین (سەعدی كوڕی مەسعودی ثەقەفی) بوو، برازاكەی هاتە لای كە ناوی (موختاری كوڕی ئەبو عوبەید) بوو-باوكی (ئەبوعوبەیدەی كوڕی مەسعودی ثەقەفی) هاوەڵ بوو، كە لە خەلافەتی (صدیق)دا لەجەنگی پردەكە(الجسر)دا شەهید بوو، یەكێك بوو لە هاوەڵە چاكەكان، بەڵام (موختار)ی كوڕی شەیتانێك بوو، كە لەوەودوا بانگەشەی پێغەمبەرێتی كرد، (موصعەبی كوڕی زوبەیر)یش كوشتی.

(موختار) بە مامی وت: ئایا پلەوپایە و دەوڵەمەندیت ناوێ؟

پێی وت: چۆن؟

ئازار چەشتنی حەسەن لە پشت هەڵكردنی قەومەكەی

(موختار) وتی: (حەسەنی کوڕی عەلی) کە بریندارە و لە کۆشکەکەدایە، دەستبەسەری بکە و دەست و پێی ببەستەوە، پاشان بینێرە بۆ دژەکەی (موعاویە) تا بیکوژێ، (موعاویە)ش پارە و سامانێکی بێشومارت پێدەدا.

مامەی پێی وت: دەك خوا روت ڕەش بکا، ئەوەش ڕەش بکا کە هێناوتە، دەتەوێ غەدر لە کوڕی کچی پێغەمبەری خواﷺ بکەم!![1]

(حەسەنی کوڕی عەلی)ﷺ زۆر ئازاری چەشت، بەهۆی یاخیبونی قەومەکەی لێی و ئاژاوەگێڕانیان لەسەری و پشت هەڵکردنیان، ئەمە سروشتیان بوو، (عەلی)ی باوکی چەند بەدەستیانەوە دەینالاند.

لەساڵی چل و یەکدا ئاشتەوایی لەنێوان (حەسەنی کوڕی عەلی) و (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان)دا بە ئەنجام گەیشتﷺ.

ئاشتەوایی حەزێکی هەردووسەرەی نێوان حەسەن و موعاویە بوو

(حەسەن)ﷺ پاش ئەوەی پشت هەڵکردنی خەڵکی عێراق و، پەرتەوازەیی و یەکدەنگ نەبونیانی بینی، نامەی ئاشتەوایی بۆ (موعاویە) نارد، هەروەك (موعاویە)ش ئارەزوومەندی ئاشتەوایی کردن بوو لەگەڵ (حەسەن)دا.

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا بەسەرهاتی ئاشتەوایی (حەسەن) و (موعاویە) و دابەزینی (حەسەن) لە خەلافەت بۆ (موعاویە) دەکا، تا ئەم کارە ببێتە هۆی یەکریزی موسڵمانان.

حەسەنی بەصری ئاشتەواییەکەی حەسەن و موعاویە دەگێڕێتەوە

حەسەنی بەصری فەرمویەتی: بەخوا (حەسەن) بە چەندین تیپی وێنەی شاخەکانەوە پێشوازی لە (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) کرد.

(عەمری کوڕی عاص) بە (موعاویە)ی وت: من جۆرێك لە کەتیبە دەبینم، پشت هەڵناکەن تا بە ئەندازەی خۆیان نەکوژن!

(موعاویە)-کە بەخوا چاکترین دوو پیاو بوو- وتی: ئەگەر ئەوانە ئەوانە بکوژن و، ئەوانە ئەوانە بکوژن، ئەی کێ کاروباری خەڵکیم بۆ بەڕێوە ببات؟ کێ کاروباری لاوازەکانیان بەڕێوە ببات، کێ سەرپەرشتی

---

[1]ـ البداية والنهاية لأبن كثير ٨ : ١٤.

**ئافرەتانیان بکات؟**

موعاویە دوو پیاو دەنێرێت بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ حەسەن

(موعاویە)ﷺ دوو پیاوی نارد بۆ لای (حەسەن)، کە هەردووکیان قوڕەیشی و لە نەوەی (عبدالشمس) بون، کە (عبدالرحمنی کوڕی سەمرە) و (عبداللەی کوڕی عامری کوڕی کریز) بون، پێی وتن: بچن بۆ لای (حەسەن)، هەرچی ویست بیخەنە بەردەستی، قسەی لەگەڵ بکەن و داواشی لێبکەن.

هاتن بۆ لای (حەسەن) و چوونە خزمەتی و قسەیان لەگەڵ کرد و هەرچیان پێبوو پێیان وت، داواکاریشیان لێی کرد.

(حەسەنی کوڕی عەلی)ﷺ پێی وتن: ئێمەی کوڕانی (عبدالمطلب) لەم ماڵ و سامانەمان دەستکەوتووە و، ئەم ئوممەتە لە خوێنی خۆیدا گەوزاوە.

ڕێکەوتن لەسەر ئاشتەوایی

پێیان وت: (موعاویە) ئەوەو ئەوەت دەخاتە بەردەست، ئەم داواکارییانەشی هەیە.

(حەسەن)ﷺ وتی: کێ هەیە زامنی ئەوانە بێ بۆم؟

وتیان: ئێمە بۆ ئەوە دانێ و زەمانەتیت بۆ دەکەین.

(حەسەن)ﷺ هەرچیەکی لێیان داواکرد، یەکسەر ڕازی بون و وتیان: ئێمە بۆت دابین دەکەین.

(حەسەن) لەگەڵ (موعاویە) ئاشتەوایی کرد.

پێغەمبەر هەواڵی ئاشتەوایی بەهۆی حەسەنەوە دەدات

(حەسەنی بەصری) گێڕەرەوەی ڕووداوەکە وتویەتی: گوێبیستی (ئەبوبەکرە-نفیعی کوڕی حارس-) بووم دەیوت: پێغەمبەری خوامﷺ بینی لەسەر دوانگە و (حەسەنی کوڕی عەلی) لە تەنیشتیەوە بوو، جارێك ڕووی دەکردە خەڵکەکە و جارێك ڕوی دەکردە (حەسەن) و دەیفەرموو: ((ئەم کوڕەم گەورەو بەڕێزە، بەڵکو خوا بیکاتە هۆی ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانان)).[1]

ئەم فەرموودەیە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیە، ئەوەتانێ پێغەمبەرﷺ

---

١ـ البداية والنهاية ٨ : ١٧ .

هەواڵی داوە کە حەسەن گەورە(سیّد)ە و سوور و بە خەمە بۆ موسڵمانان، خـوا بەهۆیـەوە دوو کۆمـەڵی گـەورەی موسـڵمانان ئاشـتەوایی و سـوڵح پێدەکات.

خەلیفایەتی حەسەن شەش مانگ بوو

ئەمەش لە ساڵی چل و یەکدا هاتە دی، ئەوەبوو بەهۆی (حەسەن)ەوە خەڵکی عێراق و شام ئاشتەوایی و سوڵحیان کرد و، هەموو ئوممەت لەسەر خەلافەتی (موعاویە) یەکیان گرت.

وازهێنانی (حەسەن)ﷺ لە خەلافەت بۆ (موعاویە)ﷺ لە مانگی (ربیعی یەکەم)ی ساڵی چل و یەکدا بوو.

جێنشینی (حەسـەن) شـەش مانگی خایاند، لە ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچی تا (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی چل و یەك.

ماوەی خەلیفەکانی راشدین تەواو دەکات

بە خەلافەتی (حەسـەنی کـوڕی عـەلی)یەوە کـە شـەش مـانگی خایانـد، ماوەی خەلیفەکانی راشدین سی ساڵی تەواو کرد.

(سـفینە) لـە پێغەمبـەری خـواوەﷺ دەگێڕێتـەوە کـە فەرمویـەتی: ((خەلافەت لەدوای من سی ساڵە، پاشان دەبێت بە پاشایەتی)).

(ئەبوبەکری صدیق)ﷺ خەلافەتی لە (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی یانزەی کۆچی گرتە ئەستۆ و (حەسەنی کوڕی عەلی)ﷺ لە (ڕەبیعی یەکەم)ی ساڵی چل و یەکدا بۆ (موعاویە) وازی لێی هێنا.

هـەروەها ئـەم فەرمودەیـەش لـە بەڵگـەکانی پێغەمبـەرێتی (موحەممـەد)ەﷺ، ئەوەبوو ئـەم فەرموودەیـە بـە عەمـەلی دەرکـەوت، کاتێـك (حەسەن) بۆ (موعاویە) وازی لێی هێنا، بەم شێوەیە ماوەی خەلیفەکانی ڕاشیدین کۆتایی پێهات، تا ماوەی پاشایەتی دەست پێ بکا.

موعاویە دواپینی خەلیفەکان و یەکەمینی پاشاکانە

(موعاویـە)ﷺ سـەبارەت بـە خـۆی دەیـوت: مـن دواخەلیفـە و یەکـەمی پاشایانم.[1]

یەکێك لە سەرکردەکانی سوپای (حەسەن) پێش دابەزینی (حەسـەن) لە

---

١ـ البداية والنهاية ٨ : ١٦ .

**خەلافەت بۆ (موعاویە) کە ناوی (ئەبو عەریف) بوو، وتویەتی: ئێمە دوانزە هەزار کەسێك بووین لە پێشەنگی سوپای (عەلی)یەوە، زۆر سوور بووین لەسەر جەنگی خەڵکی شام، کاتێك ئاشتەوایی (حەسەنی کوڕی عەلی)مان بیست وەك ئەوەی لە تووڕەییدا پشتمان شکابێت.**

حەسەن سپی کەرەوەی رووی بڕوادارانە

**کاتێك (حەسەنی کوڕی عەلی)ﷺ هاتە کوفەوە، یەکێك-کە (ئەبو عامر)یان پێدەوت- پێی وت: سەلامت لێبێ ئەی زەبونکەری بڕواداران!**

**(حەسەن)ﷺ پێی وت: ئەبوعامر! وا مەڵێ، من زەبونکەری بڕواداران نیم، بەڵکو پێم خۆش نەبوو لەسەر موڵك و دەسەڵات لەدژیان بجەنگم!![1]**

**کاتێك ئاشتەوایی و سوڵحەکە لەنێوان (حەسەن)و (موعاویە)داﷺ لە (ربیعی یەکەم) ساڵی چل و یەکدا بە ئەنجام گەیشت، خەڵکی شام بەیعەتی (ئەمیری بڕواداران)یان بە (موعاویە)دا، پاشان شار و وڵاتەکانی تر بەیعەتیان پێی دا.**

موعاویە لە ساڵی چل و یەکەوە بوو بە ئەمیری بڕواداران

**(موعاویە)ﷺ پێش ئەوەی (حەسەن)ﷺ خەلافەتی بۆ بەجێ بێڵێ، والی شام و چەند وڵاتێکی تر بوو، نەك خەلیفە یا ئەمیری بڕواداران بووبێ، بەم سیفەتەشەوە خۆی بە خەڵکی نەدەناساند و داوای بەیعەت پێدانی خەلافەتیانی لێنەدەکرد، چونکە ئەمیر و خەلیفەی موسڵمانان هەبوو، کە ئەویش (عەلی) و پاشان (حەسەن)ی کوڕی بوو.**

**بەڵام دوای ئاشتەوایی کردنی (حەسەن)ﷺ لەگەڵیدا و وازهێنانی خەلافەت بۆی، بە یەکدەنگی موسڵمانان بوو بە ئەمیری بڕواداران.**

ساڵی کۆمەڵ ساڵی چل و یەك بوو

**هەر بۆیە ئەو ساڵە، ساڵی چل و یەك، ناونرا بە ساڵی کۆمەڵ (عام الجماعة)، چونکە پەرتەوازەیی کۆتایی پێهات و هەموو خەڵکی کۆك و ڕێك بون لەسەر (موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان)ﷺ.**

**(موعاویە)ﷺ هاتە کوفەوە و خەڵکەکەی بەیعەتیان پێی دا و ئەویش (موغیرەی کوڕی شوعبە)ی کردە والییان.**

---

١ ـ البداية والنهاية ٨ : ١٩ .

**(حەسەن) و (حوسەین)ﷺ و ماڵ و خێزانی (عەلی) لە کوفەوە گواستیانەوە بۆ مەدینەی منەوەرە و لەوێ نیشتەجێ بون.**

**خوا لە هەموو هاوەڵان ڕازی بێت!! لە پێشەوەی هەموویان خەلیفەکانی ڕاشیدین!!**

# پێڕست

مێژووی موسڵمانان ئەو ژیانەیە، کە موسڵمانان گوزەریـــان کـــردووە. ئـــەو روداوانەیـــە، کـــە سازاندویانە، جا چ تاك تاك بووبێت، یان کۆمەڵ کۆمەڵ ، دەوڵەت بووبێت یان حکومەت ، فەرمانڕەوا بوبێت یان فەرمان بەسەردا کراو.

چۆن موسڵمانان ژیانیان گوزەراندوە لەماوەی مێژوویاندا، ژیانی رامیاری یا ئابووری یا زانسی یا کۆمەلایەتییان، مێژووی ئیسلامیش بریتیە لەو لاپەڕە سپیە پرشنگدارەو رونانەی، کە موسڵمانان تۆماریان کردوەو دیاردەی هێز و سەربەرزی و سەقامگیریان بووە، لەکاتێکدا بەراستی پابەندبوون بە ئیسلامەوە، لەراستیدا ئیسلام تەنها دان بەو ژیانە رێزدارە دەنێ، کە موسڵمانان بەسەریان بردووە، کە پابەند بوونە بە ئیسلامەوە ، ئیسلام تەنها ئەو روداوانەی پێ قبوڵە کە خۆی بۆیانی دروستکردوەو ئەو سەربەرزیەی کە خۆی بنیاتی ناوەو ئەو رێگەی کە خۆی بۆی کێشاون و ئەو سەربڵندیەی کە پێشکەشی کردوە!

نوسینگەی تەفسیر

www.al-tafseer.com
E-mail: tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138 -2221695 - 2230908
موبایل: 07504605122 – 07701387291